


حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی




بەڕێوەبەرێتیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی
سلێمانی

## سێ کتێب
## لەبارەی شیعرەوە

**سەباح ڕەنجدەر**

سلێمانی
**٢٠١٣**


**سێ کتێب لە بارەی شیعرەوە**

- نووسەر: سەباح رەنجدەر
- بابەت: بیروڕا
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: سۆران عوسمان
- نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- نەخشەسازیی ناوەوە: تەرزە خالید
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلا
- قەبارەی کتێب: ٢/١ A٤
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩٦٠)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی بینایی
- نرخ: (٣٥٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (١٣٤٠)ی ساڵی ٢٠١٣ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**
**گردی ئەندازیاران.**
**ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩**

## ناوەڕۆك

**تێبینی**

هەموو ئەو شتانەی مرۆڤ دەیانبینێت شتێکیان تێدایە بۆ دۆزینەوە، کە پێشتر کەسێکی دی وەك ئەو نەیبینیوە. بەکاربردنیشی لە ئەدەبیاتدا ئەوەیە بەشێوەیەکی بەجێ وەرگر بخاتە باری سەرسوڕمان و ڕەگەزی سەرسوڕهێنەر و ئاسۆی چاوەڕوانی تێدا بەهێز بکات. شیعری کوردی وەك شیعری هەموو نەتەوەیەکی دی بە گەلێك قۆناغدا تێپەڕیوە، سوودیشی لە هەموو ڕێباز و فۆرم و شێوازە جیاجیاکانی شیعریی وەرگرتووە و لەگەڵیاندا ڕۆیشتووە تا گەیشتووە بە ناوەند و پانتایی خۆبوونی خۆی. ساڵی ١٩٨٨، کە زێوانی تێدا چاپکرا بۆ من سەرەتای ڕووداوێکی چاوەڕێکراوی ئەدەبی بوو، سەردەمی گواستنەوە و گۆڕین. ڕێباز و فۆرم و شێوازی کارێکی نیمچە جیا بوو، لە زۆر لاوە سەرزەنشت کرام. لەو کاتەوە بیری ئەوەم لا جۆشا لەگەڵ چاپکردنی هەر کتێبێکی شیعری مانفێستێك وەك دوا شێوەی بیرکردنەوەم بنووسم و لەگەڵێدا بلاوی بکەمەوە. ئەو خاڵە ڕێبازی و فۆرمی و شێوازییەی پێیگەیشتووم و لە دەقەکانمدا بەکارم بردوون، پایەکانی ئاشکرا بکەم. خاڵی کرۆکی و ناوکی لە ئەزموونی



مندا ئەوەیە. پاڵەوانیەتی و خۆبەختکردن و هەوڵدان بۆ گۆڕینی قەوارەی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵام بە هێمنی باسی ژیان و مردن هەیە.

گرینترین شت لە نووسینی مانیفێستدا ئەویە دەبێ خاڵێك وەك سەرچاوە دەستنیشان کرابێت هەموو بیروڕاکانی لێ کۆببێتەوە و پاشان وەك ڕامانی سەرەکی بە تەواوی جەستەی نووسینەکەدا بلاوی بکەیتەوە.

لەو کاتانەی نەمتوانیوە لە شیعردا ڕوون بنووسم، بێگومان ئەو بارەش لە ئەزموونی مندا هەیە. هەوڵمداوە ڕوونبم لە هەموو ئەو بیروڕایانەی لە مانیفێستەکاندا ڕایاندەگەیەنم. مانیفێستەکانیش دۆخی شیعرەکانم وەرگرن و بچنە پێستیانەوە. بۆ ئەم بارە گونجاوترین شێوەی بە جێهێنانم هەڵبژاردووە. لە بنیادی هێڵکاری دەقەکان بۆ گیانی شیعرییەتی شاعیرەکە خۆی بگەڕێین و چاودێری ئەوە بکەین ئایا دەسەڵاتی دامەزراندنی بەسەر دەقەکانیدا شکاوە، یان نا، پێوەندی کراوە، یان داخراوی لەگەڵ وەرگر کردووەتەوە و پێوەندییەکەی بە چ شێوەیەکە.

# ناسینی بوونی شیعر و خۆ دەستنیشانکردن

## مانیفێستی شیعری

**(١)**

**بەرپرسیارییەتی شاعیری ڕاستەقینە ئەوەیە، شیعری بێگەرد بگەیەنێتە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. لە کۆتایی حەفتایەکاندا، بووم بە خوێنەرێکی تامەزرۆی شیعر، شیعرپەروەریش بە شێوازێکی سەرسوڕهێنەر لە ژیانمدا دەرکەوت و پەرەی سەند، هیچم نەدەبینی جگە لەو جوانییانەی لەناو شیعردا دەکرانەوە و جووڵەدار بوون، تەنانەت لە ڕۆیشتنی ناو شەقام و دانیشتنی ناو پۆل و لەسەر خوانی خێزانیشدا، شیعر وڕێنەی چێژداری پێ دەکردم. ژیانی من، قەرەباڵغ نەبوو بە پلە و پایەی فەرمانبەری و باڵەخانە و خانووی گەورە و دەوڵەمەندبوون و... تاد، تەنیا بە شیعر قەرەباڵغ بوو، باس و بابەتی سەرەکیم لەگەڵ هاوڕێکانم و ژیان، شیعر بوو بەس، واش تێدەگەیشتم ئەگەر دوو دوژمنی ڕەچەڵەك کوشتەی سەرسەختی یەکتری لەناو کرانەوەی شیعریدا گفتوگۆ بکەن، دەماری گرژیان خاو دەبێتەوە، تا ڕادەی پاکبوونەوە، یەکتریان خۆش دەوێت و پشت دەدەنە یەك.**



**بنچینەی ئەم خۆشەویستی و پشتدانە یەکترییەش ئەفسوونی شیعرە، لەپاڵ ئەم بڕواهێنانە کەڵکەڵەی شیعرنووسین ناخی بە توندی ڕاتەکاندم.**

**بڕواهێنان جوانترین و بەهێزترین شیعرییەتی تێدایە، بانگی وشەشم هاتە بەرگوێ، بمهێنە ناو ژیان.**

**هێزم تێدایە خەونە نەبڕاوەکانت بە ئومێد و ناوەند بگەیەنم، ئەم بانگکردنی وشەیە، بە یەکەمین و گرینگترین هۆکار و پەیام دەزانم.**

**دوای ئەم ناخ ڕاتەکاندنە، ناوە ناوە دەقی شیعریم دەنووسی و بوێرانە بڵاوم دەکردنەوە، بەتەواوی بار و بواری بیرکردنەوەش بەدوای کەش و هەوای سەربەخۆ وێڵ بووم و بە هێڵی ئەفسوونیدا ڕۆیشتم تا بە ئێستاکە گەیشتووم لەناو بەهەشتی نووسین لە پانتایی خەوندا کاردەکەم.**

**خەون کاریگەری بوون بە شیعری تێدا بەهێزە، جیهانبینیی منی لێوە ڕوون بووەتەوە و بووەتە پەیوەستێکی پتەو لەگەڵ پرسیارەکانی ژیان.**

**مرۆڤ، ئێستای لە نەماندایە، ڕابردوو و داهاتووی هەیە، شیعرێك لەسەر بنەما و جیهانبینیی ڕوون بنیاد نەندرابێت، نە بە کەڵکی ئەمڕۆ دێت، نە هیچ سەردەمێکی دیکەیش وەك دەقی پتەو و پەتیی ئەدەبی قبووڵی دەکات.**

**ڕابردوو بەشی هەرەگەورەی ژیانی نووسەر پێکدەهێنێ و پێکهاتەی دەقیشە، چونکە ئێستا، کە خەریکی کار و کردەی نووسینی، دوای قاوە خواردنەوەیەك چرکەی کار و کردەی نووسینەکەت دەبێتە ڕابردوویەکی زیندوو، کەواتە ئەو کاتەی کار و کردەکەی تێدا ئەنجام دەدەیت ئێستایە و بەشی هەرەگەورەی پێکهاتەکەی ڕابردووە. ئایندە تەنیا لەناو دەقدا دەبیندرێت و ئەندێشەیەکی تێکەڵ بە فەنتازیا بەگەڕ دەخات. ئەو ئەندێشە تێکەڵ بە فەنتازیایە بیرۆکە و**

خاڵی تێڕوانینە. ژیانبینی بە ئایندەبینییەوە تەواو دەبێ و بەبێ ئایندەبینی ناتەواوە. کرۆک و دیوی نهێنیی ژیان، ئایندەیە. ئایندەش خاڵی تێڕوانین و لە هەموو بەشەکانی دیکە چالاکترە، چونکە بەردەوام هەوڵی بۆ دەدرێت و هەستی قووڵایی ژیانبینی سەر دەخات. ئەم هەوڵ و دەربڕینەش مایەی داهێنانی ئەدەبین.

تایبەتکاریی من ئەوەیە، شیعرم گەڕاندەوە بۆ خەون. خەونیش پاکییەتی ژیان ڕادەگرێت. هەموو دەقەکانیشم، دەقی بیرکردنەوەیی و درێژن، ئاسۆ و دووری ئەفسانەیییان تێدا سەربەخۆ و گونجاوە بۆ پڕ نهێنی و ئەزموون کردنیان، بە شێوازی هەمەجۆر کارم لەناو کردوون تا ئەو شوێنەی دەقەکە دەخوازێت خۆی بەکۆتایی بگەیەنێت لەگەڵیدا تەبا دەبم و دەڕۆم.

زمانی بێدەنگکراوم لە دەقەکاندا بە دەنگ هێناوەتەوە، بە ئاسانیش دەتواندرێت هێڵە جیاکارەکان لەم بەدەنگهێنانەوەیەدا دەستنیشان بکرێت.

شیعر ناوەندە، هەموو ڕەگەزەکانی دیکەی ئەدەبی بەرەو ناوخۆی بەکێش دەکات و چارەنووسی ڕاستەقینەیان بە ڕوونی دەداتە دەست، لە ژیانی شیعریدا سوودی گێڕانەوەو تەوژمی هۆش و گفتوگۆ لە هونەری ڕۆمان و پەخشان و شانۆنامە و ئۆپێرا و ئۆپەرێت و سینەما و چیرۆک،... تاد. وەردەگرم. لە ڕەگەزی خۆیان دەریان دەهێنم و هێزی کرانەوە و جووڵاندنیان پێ دەدەم، پتەوتر و کاریگەرتر و سەیرتر و بەپیتتریان دەکەم، لە ئامادەکردنیان بۆ دامەزراندنی دەقی شیعری. دەقیش خوێنەری دڵنیا دەکات لەچێژ وەرگرتنی شیعرییەت و خواست، چاوەڕوانییان دەهێنێتە دی.

من بەرپرسیارییەتی دەنووسم، لەبارەی بەرپرسیارییەتییەوە نانووسم.



## (٢)

یەك لە دڵەڕاوکێی من ئەوەیە، شاعیرێك، یان گروپێك کارێکی نایابیان بەرهەم هێنابێت هەوڵ دەدەم باش لە چۆنیەتی و ڕەگی هەقیقەتی سەرکەوتنی کارەکەیان بگەم.

لە ڕووی هیچ ڕەگەزێکی ئەدەبی حەزم نەکردووە وەك کەس بم، کەسیشم لەبەرچاو نەگرتووە، هاوڕێی هەموو ئەو شاعیرانەم، کە پێش من پرۆژەی داهێنانیان هەبووە، ئەوانەی هاوچەرخن، ئەوانی دوای منیش دێن و دەبن بە شاعیری خاوەن پرۆژە.

خۆم لە دەرەوەی هەموو نەوەیەکدا دەبینم، تەنانەت لە هەندێ شیعردا سەر بە شیعری لە پێشتری خۆشم نیم، سەر بە ئەزموون و ئەفسانەی ئەو شیعرەم، کە دوا شیعرمە و لە نووسینیدام، زەمینەی ئەفسانەیی پێش ئەوەی لە هیچ ڕەگەزێکی ئەدەبیدا کاری پێکرابێ و هەبووبێت لە شیعردا کاری پێکراوە و هەبووە.

ناچمە ناو هیچ گروپێکی ئەدەبی، خۆشم بە هیچ گروپێك نەزانیوە، لە بنەڕەتدا ئەدەب و داهێنان کاری تاکە کەسییە، چوونە ناو بازنەی گروپ، دەرکردن و چەواشەکردنی ئەم تاکە کەسییەیە لە بازنەی ئەدەب و داهێناندا.

خانەخانەیی و قۆناغبەندکردن، هەڵەیەکی کوشندەیە، شیعر تەنیا بە گەیشتن بە باری دەروونڕۆشنی پێوانە دەکرێت، ئەمە بۆچوون و بیرکردنەوەی کۆمەڵێك خودی وریایە، دەق قسەیان بۆ دەکات و دەق قسەشیان پێ دەکات.

بێوچان لەگەڵ خۆمدا لە جەنگی بێ ئاماندام بۆ ئەوەی بگەم بە باری دەروونرۆشنی تا بەسەر تەمەن و کاتدا زاڵ بم، خۆشم بە تەلیسمی لێڵی ساختەوە هەڵنەواسیوە، هەوڵم داوە ئاست و ئاراستەکانی توانا و بیرکردنەوەی ئەمڕۆ بم.

لەمڕۆدا بزواندن و پێشبینیکردنی ئاینده دەردەکەوێت، لە جیهانی خۆمدا ئارامی دروست دەکەم و بارێك دەهێنمە بەر زەین و تێیدا نیشتەجێ دەبم و دەنووسم، پێوەندیشم لەگەڵ سۆراغکەرانی بەرهەممدا بەردەوام و پتەوە، ناشزانم تا کوێ بڕ دەکەم، بەڵام خۆم لەوە دڵنیا کردووەتەوە لە شیعرەوە بەرەو ژیان و ئاینده دەڕۆم.

لەسەر هەموو ئاست و ئاراستەکانی ژیان لایەنگیری گۆڕان و جێگیرنەبوونم، شیعری کوردی لە کلاسیکەوە تا بە ئەمڕۆی گەیشتووە لەباری وەستاو نەماوەتەوە، بگرە قۆناغ بە قۆناغی بڕیوە، ئەگەر گۆڕانی ڕیشەیی و داڕشتنی قووڵیشی پەیدا نەکردبێت، ئەوە بۆچوونی هاوچەرخ و ڕەسەنی لە ئاست شارستانییەتی وڵاتەکەیدا هێندێك ناوکی بنەمای دۆزیوەتەوە. کاری زمان و شێواز و شیعرییەتی قۆناغەکەی لەسەردا کردووە.

چەند قۆناغێکی دانپێدانەدراوی شیعری کوردی لە ئارادان و لێتۆژینەوەیان لەبارەوە دەنووسرێ، بەڵام قۆناغەکان قۆناغی درەوشاوە نین، بگرە هەر یەك لە قۆناغەکان دەنگێکی درەوشاوە نوێنەرایەتی قۆناغەکەی کردووە.



ڕەخنەی کوردی، نەهاتووە تەواوی قۆناغێك بە ئاستی دەنگەکان وەربگرێ و خوێندنەوەیەکی وشیاری بۆ بکات، گرینگییەتی سەربەخۆیی و هاوبەشی کارکردنیان و بنەما دۆزراوەکانی قۆناغەکە دەربخات.

بگرە یەکە یەکە نوێنەرە بەهێز و درەوشاوەکانی وەرگرتوون، ئەم یەك یەك وەرگرتنەش وای کردووە قۆناغەکان کارکردنی هاوبەشیان بە نەدۆزراوەیی بمێنێتەوە.

من ژیان دەنووسم، لەبارەی ژیانەوە نانووسم.

## (٣)

هەست دەکەم، ژیان لە دۆخگۆڕیندا جۆرە بەرزی و نزمییەکی نارێکی تێدایە، دەمەوێ لەم دۆخگۆڕین و بەرزی و نزمییە نارێکەدا ڕزگارم ببێت، لەناو شیعری پەتیدا بژیم و مانایەك بە ژیان و دادپەروەری بدەم، شاعیر ئەگەر خۆی خستە خزمەت دەسەڵات و سیستمی دیکتاتۆریی سیاسییەوە، هاوپەیمانی بوو، بێگومان ڕۆڵ و ئامادەیی گەشەکردن و پەرەسەندنی جیاکاری لە بەین دەچێت، ناتوانێ توانای بەهێزی داهێنان ڕابگەیەنێت، بەڵام ئەگەر دوور لە هێزی شەڕخوازی، جۆرێك باوەڕی سیاسی هەبێ بۆ تێگەیشتن لە هۆکارەکانی ڕوودان، چالاکییەکی هۆشمەندییە لێیەوە کاریگەری خۆی بەدی بهێنێ و تێڕوانینەکانی نیشان بدات و بیانچەسپێنێت. چرکەساتی نووسین، چرکەساتی تێکۆشانی گیانییە.

شیعری داهێنراو، وشەکانی جەنگاوەری سەربەخۆییخواز و سەر لەشکری بەرەنگاربوونەوەن دژی دیکتاتۆریەتی بە زەبری هێز خۆسەپێنەر، کە هەستم

بۆ خۆشییەکانی ژیان جۆشا، ژیان زۆر بە ئاڵۆزی و گرانی خۆی پیشاندام، لەم کاردانەوەیەدا دەمەوێ لە ڕێگای شیعرەوە ئاڵۆزی و سەختییەکانی ژیان بەتاڵ بکەمەوە، ژیان بهێنمە ناو زمان و نووسین، بۆیە ئاوا هۆگری شیعر بووبمە، هەموو ژیانی لێ سەندووم.

بۆ ئەم داوایە لە ژیان شیعر پێویستییە، لە چرکەساتی چاوەڕواننەکراو و نەبیندراو و خەونئامێزدا، بار و کەشێکی پیرۆز سەر تا پێم دادەگرێ و دەڵێت: خودی بەرپرسیار بەرانبەر بزواندن، پەیامی شیعر بەرز بکەرەوە.

شیعر حەوشە و ماڵی خودایە، گوناهی هەمووەمانی لێ پاك دەبێتەوە و تێیدا دەبین بە فریشتە و خوداوەند.

شیعر ئامانجی بەختەوەری و جێگای هەموو هیوا و خۆشادمانکردنێکە بۆ من، لە ڕێگایەوە دەتواندرێت پێوەندی بە جیهانی فریشتە و خوداوەندانەوە ببەستی، هەروەها خەونەکانت کۆ دەکاتەوە، ئەگەریش زانیارییەکی گشتیت لەبارەی کەرەستە و ئامرازەکانەوە نەبێت، ناتوانی هەڵگری خەونەکانت بیت.

من خەون دەنووسم، لەبارەی خەونەوە نانووسم.

## (٤)

بێ بەهرەکان بە چالاکی و پڕ بەرهەمیم جۆرێك شڵەژاوییان کەوتووەتێ و نائاسوودە و سەغڵەتن، بەئاشکرا و ژێراوژێر لە پلان و پیلاندانانن دەمبەستم بکەن و بمچەوسێننەوە، یان ئەو ڕووناکییەی لێمەوە دروست بووە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کاتیش بێت، بیکوژێننەوە، یان بیشارنەوە، ئەگەرنا بیشێوێنن و گومانی بخەنە سەر.



لەم دژایەتیکردنەدا هەست بە هیچ زیانێك ناکەم، بایی ئەوەندە گوێیان لێ ڕادەگرم بزانم چی دەڵێن، ئاست و ئاراستەکانیان چین، هێندە کاتیان نادەمێ بیریان لێ بکەمەوە، گیانی لەخۆبوردن و بێبایەخکردنی دوژمنەکانم لەمندا بەهێزە، ئەمەش لە ڕێگای گیانپەروەردەکردنێکی بەردەوام و دۆزینەوە و خۆناسینەوە پێی گەیشتووم.

شیعر بۆ من پەیامی ڕاچڵەکاندن و ئەو ئاگرەیە قەت ڕووی لە خامۆشی نییە، تەواو بڕوام پێی هێناوە و ئەمەکدارم بۆی، دوژمنەکانم لە ناوەوەیاندا لە ئاست ئەم ئەمەکدارییەی من داتەپیون، خۆیان بە گوڕنەتەڵە و چەوساوەی دەقەکانم دەبینن، منیش لە شەڕە بێفەڕەکان خۆم پاراستووەو فەرامۆشیان دەکەم.

لە گردەنشینی دەروونی ئامانجدارم خەریکی بەرزکردنەوەی ئەو شتە پیرۆزە دەبم، کە بڕوام پێ هێناوە، بڕواهێنان جوانترین و بەهێزترین شیعرییەتی تێدایە، هەلومەرج و ئارامیی تەواوم بۆ دابین دەبێت وەك منداڵێك خەون دەبینم، ژیان لەناو خەوندا مشتومال بکەم.

شاعیری ڕاستەقینە هەموو کات وەك منداڵێك هەڵسوکەوت دەکات، هەرکاتێك ڕێگای دا ئەو منداڵییەی ناوەوەی وەك گەورەیەك فەرمانی پێ بدا و هەڵی سووڕێنێت، ئەوە لەم چرکەیەدا جاڕی بەتاڵبوونی خۆی دەدا، چونکە گەورە لە هەڵسوکەوتیدا تاکتیك بەڕێوەی دەبا و تاکتیکیش بەڕێوە دەبات، داهێنەریش پاکی و یەکڕوویی فەرمانڕەوایەتی، پاکی و یەکڕوویش تەنیا لە منداڵییەتیدا دەست دەکەوێ، لە پاکی و یەکڕوویدا دەگەیت بە دەروونڕۆشنی خودایی.

پەرە بە خەونبینین دەدەم، خەون لە دەربڕیندا بنەڕەتی واقیع ون ناکات، ملکەچی دەسەڵاتیش نابێ، بەرهەمهێنەری ترپە و ئاوازی نوێیە بۆ دەربڕین لێکردن و بەرێوەچوونی واقیع لەناو دەقی فەنتازیادا.

من پاکی دەنووسم، لەبارەی پاکییەوە نانووسم.

**(٥)**

شاعیری دامەزرێنەری گەورەمەند بە ڕەخنە لێگرتنی نابەجێش بڕوای بە دامەزرێنەری و گەورەمەندی خۆی لەق نابێت، پتەوتر و کاریگەرتر و پەتیتر دەبێتە هێمای ڕوونبوونەوەی زمان و نووسین. مێژووی لەناو دادەمەزرێ، ئەو بڕوا پتەوتربوون و کاریگەرییە و پەتییەشی هێزی ڕزگارکەر و ڕزگارکردنی دەقە لە پاشماوە جێماوەکان و پاشخاپەڕۆکەکانی زمان و نووسین.

من ڕزگارکردن دەنووسم، لەبارەی ڕزگارکردنەوە نانووسم.

**(٦)**

هیچ وشەیەك لە ژیان و مردن کۆنتر نییە، وشەش لەسەر کۆنی و نوێی نەکەوتووە، بگرە لەسەر تێگەیشتنی نووسەر کەوتووە چۆن بەکاری دەهێنێ و ئاست و ئاراستەو ئاسۆی لێ دەدۆزێتەوە.

نەمویستووە جیهانی کۆن بڕوخێنم و جیهانی نوێ بنیاد بنێم، تێکۆشاوم لەناو جیهانی کۆندا جیهانی دیکە بدۆزمەوە و بیکەم بە نموونەی ڕوونی و خاوێنیی بەهەشتی تا هەتایە.



شاعیر دەتوانێ کەڵك لە تەواوی وزە سروشتییەکان وەربگرێ بۆ بنیاد و پێکهاتەی شیعری.

شیعر، بە پێوەندییەکی پێداگر و زیندووی ژیان دەزانم، هێندێك کاری سەرەتاییم سادە بوون، کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بە ناوەندی ڕۆشنبیری کوردیم ناساندوون، بە شایستەی ئەوەیان نازانم لە کتێبێکدا بیانهێنمەوە ناو جیهانی زمان و نووسین، دووبارە پیشانیان بدەمەوە، یان جۆرە یەکترناسینێك بوون لەگەڵ خەیاڵی بە پیتی شیعر و هەڵڕشتنی مانادا. کارکردن لەپێناو مانادا لەناو ڕەگەزە شیعرییەکاندا ڕەگەزێکی بنچینەیی نییە.

وەك دەسپێك و زەمینە لە هێندێکیاندا جیهانبینیی شیعریم سەرەتاییە، لەگەڵ ئەوەشدا بە هەموو هێز و توانای دەربڕینم لە تەواوی ژیان و بوونم ڕوانیوە، ئەو ڕوانینانەی لێیانەوە دەگەی بە قووڵایی ئومێدە پەیامدارە ڕاستەقینەکان.

هەوڵمداوە ئەوەی لە گیان و ناخی من جێگیر بووە، بیگوازمەوە بۆ گیان و ناخی کۆی ئادەمیزادەکان بەو حیکمەتەی شیعر پاکییەتی ژیان ڕادەگرێت.

من دۆزینەوە دەنووسم، لەبارەی دۆزینەوە نانووسم.

## (٧)

پێشبینی لە بیری مندا بەهێزە، زۆر جاران شەو خەونم بینیوە بۆ بەیانی، یان لە ماوەیەکی کورتدا ڕووداوی خەونەکە بە واقیعی هاتووەتە ناو ژیانم و بووەتە ڕووداوێکی بیندراو.

شیعر دەکەم بە ژیان، شیعریش دەوری ئەم چەترە دەبینێ هەموو چالاکییەکانی لە سێبەردا یاداشت دەکەم.

شیعر وەك خەون وایە، ئەگەر نەیبینم هەست دەکەم وەك مرۆڤ تەواو بوویمەو شوێن و ئەرکم لە ژیاندا نەماوە.

ترپەو خورپەیەکی شاراوەی ناخە، دێت و دەستم دەگرێ، دەمباتە ناو ژیانێکی جوان و بەهەشتی تا هەتایە، لەم گەشتە جوانەشدا بە نەرمە گۆرانی گوتنەوە شتە هەرە جوانەکان دەکەم بە هاوڕێی گیانی بە گیانیی خۆم و دەیانهێنمەوە ناو ماڵی هەمیشە دڵخۆش و فەرامۆشبەخشی زمان و نووسین.

من پێشبینی دەنووسم، لەبارەی پێشبینییەوە نانووسم.

## (٨)

شاعیر لە شیعرەوە هەستیاری خۆی دەگەیەنێ، شاعیری داهێنەریش کەللەسەر و چاوی ڕوونی میللەتە، لە هەر شیعرێکیشدا ڕاستییەك لە کەللەسەر و چاوڕوونیدا دەدۆزێتەوە.

کۆمەڵێك دەقی پەتیم نووسیوە لە پانتایی خەون بوونەتە شێواز و بەرگری لە مانای جوان دەکەن، پێناسەی ئەدەبی منیان پێکهێناوە، بە



ئەدەبیاتبوونی خەونم لێیانەوە ناساندووە، تا ڕادەیەکی بەرچاویش سەر بە گۆبەندبوونە و لەرزەیەکی نوێبەخشیان خستووەتەوە، بەهۆی خۆ دامەزراندن و گورج هاتنە پێشەوەو بڕوا بەخۆبوونم لەبەردەوامی بەخشیندا کاردانەوە و بەدگۆیی و ئیرەیی و نیازخراپی و دڵڕەشی و کەمسەری و ناکەسبەچەیی دوژمنە گوڕنەتەڵەکانم گەیشت بە پلەیەك هەرەشەی زۆر ناشارستانیم لێ بکەن.

لە دەقەکانمدا سەرچاوە ئێستێتیکییەکانی ژیان لە هەموو شتێك بەرزترن، پێوەندیشم لەگەڵ شوێندا، پێوەندییەکی گیانییە، یەکەم خەیاڵگەی بەپیتمە هەموو یادەوەرییەکانم لە شوێنێکدا خەوتوون، کە چاو بواری نییە کۆیان بکاتەوە و بیانگرێت، مەگەر لە ڕێگای خەونبینینەوە بە ئاگایان بهێنمەوە و ئاوی چاوی تیشکهاوێژم بدەم، بیانخەمە ناو چالاکییە هەستی و خەونییەکانم.

ئەگەر ڕۆژێك بە هەست، دەستی نیانی هەتاوی شوێن لە خەو بە ئاگام نەهێنێت، وا دەزانم ئەو شەوە چالاکی هەستی و خەونی تێدا نەبووە.

شوێن لە دەقدا خەیاڵ و ڕوانین و خەونی شاعیر دایدەمەزرێنێ، جیاکارە لەو زەوییەی ڕۆژانە بەسەریدا گوزەر دەکەیت. جیهانی خەونیش بەلای منەوە سەرنجڕاکێشترین جیهانی شیعرییە، لەبەر ئەوەی باسی ژیانی تەواو داماڵدراو لە فرت و فێڵ و بەدگۆیی و ئیرەیی و نیازخراپی و دڵڕەشی و کەمسەری و ناکەسبەچەیی و تەواو ئازاد بە گشتگیری دەکات.

من شوێن دەنووسم، لەبارەی شوێنەوە نانووسم.

## (٩)

ژیانی ڕاستەقینە، ئەو شتەیە، کە دەسەڵات و سیستەمی دیکتاتۆریی سیاسی لێی سەندووین، ئەم لێسەندنەوەیەش لە دەسەڵات و سیستەمی دیکتاتۆریی سیاسی تەنیا لە ڕێگای خەونەوە دەبێت، کەواتە ژیانی ڕاستەقینە تەنیا لە خەوندا هی خۆمانە، ئازادی تەواوی لێ وەردەگیرێت.

شێوازی خەونیم پەیڕەو کردووە، لە دەقی خەونیدا دەتوانرێت خودی شاعیر بناسرێ و ڕەنگەکانی ببیندرێن.

خەون، یاخیبوونی بە جەرگانە و دەنگی ناڕەزاییيە لەکار و ڕووداوە نابەجێیەکانی دەسەڵات و سیستەمی دیکتاتۆریی سیاسی.

لە خەوندا شاعیر پرسیار ئاراستەی ژیان و کۆمەڵگە و دەسەڵات دەکات، لە ڕێگای ئەم پرسیارکردنەشەوە دەگات بە دۆزینەوەی گەوهەری مرۆڤ.

جووڵەی بەهێزی ناوەوەی شیعر لە توانایدایە ڕاستەوخۆ کار بکاتە سەر ژیان و بیگۆڕێت.

خەونی نایاب دەبێتە زمان و شێواز و بابەتی نایاب، دەقەکانم دەقی خەونین، خەونیش وەك گیان و هاندەر، هەمیشە تێکەڵ بە شیعرییەتی دەقم دەبێت و هەستی شکۆمەندی لە مندا ڕسکاندووە و دەڕسکێنێ.

ڕوانینەکانم دەخەمە ناو بازنەی خەونەوە، خەونە بەرجەستەکراوەکانیش پێویستییان بەوەیە دووبارە بیانهێنیتەوە ناو ژیان تا دەور و کار و چالاکی خۆیان ببینن و پتەوتر هاوبەشی لە گۆڕان بکەن.



لە بواری خەونبینیندا پشت بە چاودێری و سەرگەرمیی خۆم دەبەستم لە پێکهاتەی دەقیشدا خەون ڕۆڵی بنچینەیی دەبینێت، ئامادەبوونی بەردەوامیشی لە ژیانی کەسایەتیمدا بەدیار کەوتووە.

خەون هەڵوێست و بۆچوونی ڕوونە بەرانبەر بە دیمەنی شڵەژاو و دیکتاتۆریەتی ژیان.

من پرسیار دەنووسم، لەبارەی پرسیارەوە نانووسم.

## (١٠)

نووسین کاتی هەستیاریی تەمەنە، لە درەوشانەوەی شیعریی دۆنایدۆنی کەش وهەوای ئازادیی بیرکردنەوە و خەونبینین دەبم، خەیاڵ و خەون و چەمکی سەرلەنوێ ژیانەوە لە پلەیەکی ئەفسوونیدا یارمەتیدەرمن بۆ کێشانی ئەو شتانەی کە چاوم نەیدیبوون.

لەناو شیعردا دەجووڵێم و بارودۆخی گیانیم ئارام دەبێت، سەیری تەواوی جیهان دەکەم، لەم سەیرکردنەمدا هیچ دەسەڵاتدارێك بوونی نییە، تەنیا ئەو خودایە نەبێت، کە پێوەندیم پێوەی بەهێزە و هەڵسووڕێنەری گیانیمە، ئامۆژگارییە ئاسمانییەکان هەمیشە لەبیرمدان و فەرامۆشیان ناکەم، هەستی ئایینیم بەرجەستەکردووە. نەك بابەتی ئایینی، تا سنووری ڕەوا لە نووسەرە گەورەکان نزیك دەبمەوە و بەهرە و سروشیان لێ وەردەگرم، بەڵام ناچمە ناو ئەو بازنەیەی تایبەتە بە جیهانبینی و بڕوای ئەوان. خودی سادەو ساکار ژیاوی متەسەوف و سروشتخواز و خەونبین وەك بوونێکی گشتی تەماشای دەوروبەر دەکەن و لەناو جوانییەکاندا دەتوێنەوە. لەم

**توانەوە دڵئاگاییەدا هەست بە شتەکان دەکەن و دەگەن بە خود و غوربەتی ناخ و گیانی باڵا، لە ڕێگای ئەم گەیشتنەشەوە شاد دەبن بە دوایین پلەی دەروونڕۆشنی و شینایی سەرەتا و بێگەردکردنەوەی تا هەتایەی هەموو شتەکان.**

**من بێگەردی دەنووسم، لەبارەی بێگەردییەوە نانووسم.**

## (١١)

**لە دەقی خەونیدا دەستەواژە لە ئازادکردنی مانا و بنیادی ڕستەدا هەمیشە لە سنووربەزاندندایە.**

**دەقی خەونی دەستکەوتێکە لە ئەوپەڕی زمان و جیهانبینیی ڕوون، دەربڕینە خەونییەکان پەنجەمۆری لەسەر داناون، شێوازی هەمەجۆر لە دەقی درێژدا بەکار دەهێندرێ، جۆرێك لە دەستکرد و دروستکردنی تێدا ڕەوایە، لەبەر ئەوەی پشت نابەستێت بە چرکەی تەقینەوەیەك، بگرە زنجیرە تەقینەوەی یەك لەدوای یەك و جووڵاندنی ڕابردوو و تێڕامانی لە مێژینەن لە کەشی نووسین دەگەڕێیتەوە سەریان و جیهانبینی تێدا دەجۆشێت.**

**گونجاندن و لێك نزیککردنەوەی شێوازی شیعری ئازاد و شێوازی پەخشانەشیعر ئاست بۆ سنووربەزاندنەکان دەدۆزێتەوە. ماناکان لە هەناوی زمانەوە دەرپەڕیون، وێنە ڕاستەقینەکان لە هەست دەچن، هەندێ جار خۆیان ئاشکرا دەکەن، هەندێ جاری دیکەیش ون دەبن.**



**لەم ونبوونەدا ژیان یەکپارچە دەبێتە گومان، لەو گومانەشدا شیعرییەت دەبێتە خوداوەندی سەرزەمینێکی لێوانلێو لە ڕازی نوێبەخش و جیهان بە باشی و چێژ وەرگرتنەوە دەبینێت.**

**من گومان دەنووسم، لەبارەی گومانەوە نانووسم.**

## (١٢)

**کەلەپوور بازنەیەکی نیمچە داخراوە، داهێنەر هەمیشە پانتاییەکی ڕوون و ئاماژەیەکی گرینگی تێدا دەکاتەوە بۆ پرسیار، پرسیار دروستکردن لە دەقدا، پێوەندییەکانی شاعیرە بە زمان و هەستەکانی ژیانەوە.**

**دەقی خەملێو لە ئەزموونی مرۆڤی وریا لە ئاست چارەنووسدا ، خۆی لەو بیر و مانایانە دادەماڵێت، کە لەناو دەقدا یەقین دروست دەکەن، دڵەڕاوکێ و گومان دەستمایەی دەقی ئاستدار و خەونین.**

**کەلەپوور ئەگەر پانتاییەکی ڕوون و ئاماژەیەکی گرینگی تێدا نەکرابێتەوە بۆ پرسیار، یانی ڕابردوو، ڕابردووش وەستاوەو یەقینی تێدا زاڵە، بە هەموو توانامەوە هەوڵ دەدەم کەلەپوور وەك ڕابردوو وەرنەگرم، مەبەستمە بیکەم بە خەڵکی جیهانی ئەمڕۆ، خەڵکی جیهانی ئەمڕۆ بم، ئەمڕۆ شتێکی تەواو بیندراو و زاندراو و وتراو نییە. ئایندە بێئامانترین سەرچاوەی نیگەرانی و دڵەڕاوکێی ئەمڕۆیە، ئەو ئەمڕۆیەی ئایندە تێیدا کەرەستەیەکی خاوە، ملکەچی توانایەکانمان نییە.**

**من ئاماژە دەنووسم، لەبارەی ئاماژەوە نانووسم.**

## (١٣)

نووسینی واقیعی بیندراو لێکەوتنەوەی زەینی ئارام و خۆشنوودییە، بەڵام دەقی خەونی، لێکەوتنەوەی زەینی شڵەژاوە. زەینی ئارام حەز بە خوێندنەوەی ئەو نووسینە دەکات، زەینی ئارام نووسیویەتی، زەینی شڵەژاویش حەز بە خوێندنەوەی ئەو نووسینە دەکات، زەینی شڵەژاو نووسیویەتی.

لە دەقی خەونیدا هەست دەدۆزرێتەوە، هەستیش زەمینەیەکی لەبارە بۆ بەرهەمهێنانی شیعرییەت، خەون کردەیەکی هەستییە لەوەی کردەیەکی عەقڵی بێت، لەگەڵ ئەمەشدا بنچینەی خەون هەست و واقیعە، بەڵام واقیع بەو شێوازە نا، کە دەبیندرێت، واقیع بەو شێوازەی هەست لە دەقی پەتیدا ئامادەی دەکات، لەم بار و کەشەدا خەون هێزی خەیاڵ لە نووسیندا بەرز دەکاتەوەو کار لەسەر لایەنە شاراوەکانی چارەنووسی مرۆڤ دەکات.

من شاراوە دەنووسم، لەبارەی شاراوەوە نانووسم.

## (١٤)

ژیان لە هەموو دنیادا، جۆرێك چوونیەکی تێدایە، دەگونجێ شاعیر نەریتی هەموو دنیا لە دەقدا بکات بە هی خۆی، وەك بیرو ماناش لە شیعردا نیمچە نزیکییەك لەنێوان نەتەوەکاندا ئەگەر هەبێت ڕەوایە، بەڵام شیعرییەت لە زمانی نەتەوایەتیدایە. مانای وێنەی شیعری لە ترپە و ئاوازدا کۆ دەبێتەوە و لە ئەوپەڕی زماندا دەڕسکێ.



زمان هەڵگری بیر و ڕاکانی نەتەوەیە، شاعیریش لە ڕێگای زمانەوە جوانییەکانی نەتەوە ڕادەگەیەنێت، نووسین بە زمانی نەتەوە ئینتیمای نووسەرە بۆ نەتەوەکەی، بەکارهێنانی زمان دەبێتە ناوەند و سەربەخۆیی داهێنان و ئینتیمابوون وەردەگرێت، زمانی درەوشاوە و جووڵەدار لە دەقدا یانی گەشەسەندوو و داهێندراو و درەوشاوە و ڕسکاو.

دۆزینەوە لە ڕێگای خوێندنەوەوە، بە بەهرەمەندی نووسەر وەردەگیرێ، من کە لە دایك بووم و هاتمە ناو قسەکردن، وشەی مردنم نەدەناسی و نەمدەزانی واتای چی دەدات، لە خوێندنەوەدا گەیشتم بە کرۆکی واتایی و ئاسۆکانیم ناسی و بەهرەم لێ وەرگرت، چوومە ناخی وشەکە و وشەکەش هاتە ناو ناخی من و بووین بە هاوتای یەکتری.

ئەو بە چاوی منی ڕوانی و منیش بە چاوی ئەو جوانییەکانی ژیانم بژارد، دواتر لەگەڵ بینینی مەرگی باوکم گونجاندم و هێنامە ناو زمان و نووسین.

وشەی دایە و بابە گەشترین و بەهێزترین شیعرییەتیان تێدایە، واتایەکی ڕاستەقینەی بەردەوامین، ژیان بە ئەمانەوە خۆشخاڵ و پەیوەستە، لەوێوە دەست پێدەکات، واتە لە شیعر خۆیەوە، ژیان خۆی جووڵێنەری خودی شیعرە.

من ناسین دەنووسم، لەبارەی ناسینەوە نانووسم.

## (١٥)

ئەركی شاعیر ئەوەیە گۆڕان لە ڕوانین و نەریتی باوی كۆمەڵگە دروست بكات، واتە شۆڕشگێڕبێ لە ڕوانین و گۆڕینی چێژ بۆ جوانی. كە جوانیشی خۆشەویست كرد لەناو كۆمەڵگەدا، واتە تەواوی ژیانی خۆشەویست و پەسند كردووە.

شۆڕشگێڕیش بەشێكە لە ژیانی پەسندكراو، بەڵام بیری توندوتیژی نارەوا، یان سیستمی دیكتاتۆریی سیاسی لە دەقی شیعریدا هۆی خنكێنەری فەزا و هونەری پەتییە.

بیری توندوتیژیی سیاسی شیعری هەڵچووندار بەرهەم دێنێت، هەڵچوونیش گرینگی بەهۆیەكانی لێكدانەوەی توندوتیژی و زەبروزەنگ نادات، بگرە دەیانخاتە ڕوو. قسەمان لە هەڵچوونی گیانی نییە، كە سووتان دروست دەكات و دەبێتە بەرهەمهێنەری شیعری ڕۆمانسیی هەستی و دەروونرۆشنیی تەسەوف.

شیعری تێڕامان، بەرهەمی بارودۆخی ئارامە، كە جوانی تێدا خەملێندراوە.

شیعری هەڵچووندار، بەرهەمی بارودۆخی شڵەژاوە، كە جوانی تێدا بزركراوە.

شیعری هیچ نەتەوەیەكیش بە هەڵچوونداری ناگا بە غوربەتی ناخ و گیانی باڵای خۆی و مەزنایەتی وەرناگرێت.

من تێڕامان دەنووسم، لەبارەی تێڕامانەوە نانووسم.



## (١٦)

هیچ ئاستێكی جیاكار لەنێوان هەقیقەتی گەورەو داهێنراوی گەورەدا نابیندرێت، هەمیشە نووسراوی داهێندراو لە باسكردن و ڕووداوی بیندراو و بیستراو بەهێزتر و كاریگەرترە.

بەشێك لە بەشە كاریگەرەكانی ئەدەب، ڕەخنەیە، ڕەخنەش لە كرۆكدا هۆیەكە بۆ گەیشتن بە ئاكامی بیری پێگەیشتووی دەق و خستنە ڕووی پێكهاتە زیندووەكانی بەرزی شێواز، هەروەها ناوەندی كاركردنی دۆزینەوەی داهێنانیشە، ئەو بۆچوونانەی لە بیر و شێوازی دەقەكەدا بەدەستیان دەهێنێت ئاراستەی دەقەكەیان دەكاتەوە و گوتاری خۆی دادەمەزرێنێ، ئەو ڕەخنەگرەی توانی گوتاری تەریبی خۆی لەگەڵ كارە ئەدەبییە داهێندراوەكاندا دابمەزرێنێت، دەروونێكی بێگەرد و ئاشقە.

ڕەخنە، دەق بە ناسنامەی كراوەی ڕوون لەسەر بەرزاییەكی دۆزراوەی ناوەند ڕادەگرێت و پرۆژەی دامەزراندنی پێشنیاز دەكات، پێویستە دەروونی بێگەرد و ئاشق بەجێی بهێنێ و كاری لەبارەوە بكات، نەك دەروونی لێخن و نەخۆش.

دەروونی بێگەرد و ئاشق، بینینی ڕەخنەیی تێیدا ئاشكرایە، سۆراغكەری نووسین یارمەتی دەدا و ئامانجە بۆ ئاشناكردنی.

دەروونی لێخن و نەخۆش، بینینی ڕەخنەیی تێیدا بزرە، سۆراغكەری نووسین چەواشە دەكات و هۆیە بۆ بەلاڕێدا بردنی.

من پێكهاتە دەنووسم، لەبارەی پێكهاتەوە نانووسم.

## (١٧)

خۆمم وەك خودێكی بیركەرەوە لەناو خەیاڵ و فەنتازیای دەقەكانمدا، هەموو بنەماكانی ئەم خۆدەربڕینەشم لە جووڵەی دەقەكانی خۆمدا دۆزیوەتەوە. دیتنی منی بۆ شیعر بەڕوونی تێدا دەبیندرێت، شێوازی گێڕانەوەی خەونم وەك بنیاد و جووڵێنەری نووسین وەرگرتووە، زمانیش وەك دامەزرێنەر و بەشێكی زیندووی دەقی ئاستدار و خەونی.

هونەری كۆلاژ و هەڵڕشتن و بەدوایەكداهێنانی وێنەی جۆراو جۆر، یان هێنانەوەی وێنە لەدوای وێنە دەبێتە هۆی ئارامی و ئاگری زیندووی گیانی و زەینیی خوێنەر.

جۆرێك پەرتی و بایەخنەدان بە یەكێتی بابەتم وەك ڕەگەزی كتوپڕی پەیڕەو كردووە، ئەم هونەرەش لە شیعری كلاسیكی كوردییەوە فێربووم، لەشیعری كلاسیكی یەكێتی بابەت نییە، بگرە یەكێتی دێڕ هەیە، من ئەم یەكێتی دێڕەم گۆڕیوە بۆ یەكێتی وێنە، لێچوون و لەوچووشم گۆڕیوە بۆ هێما و ئاماژە، هەروەها مۆسیقا و ترپە و ئاواز لە شیعری كلاسیكیدا لە كێش و سەروا و بڕگەوە دەبینرێت، لای من جووڵەی وشە تێكەڵ بەیەكتر دەبن. مۆسیقا و ترپە و ئاواز پێك دەهێنن.

من ڕەگەزی كتوپڕی دەنووسم، لەبارەی ڕەگەزی كتوپڕییەوە نانووسم.



## (١٨)

سەرنجدانی هیچ شتێك بۆ بەهرەمەند لە سوودوەرگرتن بێبەش نییە، هەر شاعیرێكیش لە ژیانی ڕۆژانەیدا زۆر بلێ بوو، زوو سەرنجەكانی دەربڕی نەیهێشت بارەكانی بگەن بە باری تێڕامان و ناخ ڕوونبوونەوە و جیهانبینی و بەهرە خەملاندن، دركاندنی. بێگومان كارەكەی وەك نووسراوی ئاسایی پڕە، بەڵام وەك نووسراوی داهێندراو بەتاڵە، چونكە نووسراوی داهێندراو تەنیا بە تێڕامان و ناخ و ڕوونبوونەوە و جیهانبینی و بەهرە خەملاندن مەزنایەتی وەردەگرێت. شتە بیندراو و هەستپێكراوە بەسوودەكان پێش ئەوەی لە نووسین جێگایان بكاتەوە بەسەر قسەكردن دابەشیان دەكات. لەم بارەدا بەهۆی قسەكردنەوە هۆشیارمەندی نووسین لەدەست دەدا، یان بەردەوام بەپەلە قسە بۆ دیاردە سروشتییەكان هەڵدەڕێژێت، كە شیعر بێدەنگییەكی خوداییە، ناهێڵێت ئەم بێدەنگییە خوداییە ئەم بە قسە بێنێ، یان بە ئاماژە و نەرم نادوێت، بگرە بە تەواوی هێزی دەمی بەرەڵڵا دەكات و بارەكانی بێدەستمایەی نووسراوی داهێندراو بەتاڵ دەبن.

من بێدەنگی دەنووسم، لەبارەی بێدەنگییەوە نانووسم.

## (۱۹)

کتێبخانە کەسایەتی نووسەرە، من وەك بارستاییەك هێندە بەفری کتێبم لەسەر کەوتوون، بەهرەی ئەو کتێبانەم چۆڕاوەتە هۆشیاری و کەللەسەر تا وەك کانییەك لەژێر گرانایی ئەم بەفرەدا، کە هاندەری گیانە دەربووم و جۆگەلەم هاوێشت.

لە دژوارترین کاتدا، کە زەبر و زەنگی واقیع و دەسەڵات و سیستەمی دیکتاتۆری سیاسی ویژدانم دەڕەنجێنن. وەك منداڵێکی هەست بە شاڵاوی تۆقێنەرکردوو، کتێبخانەکەم بە دڵنیاترین قەڵای پارێزگارکار دەزانم، لەناویدا ئاهی پشتیوانی و بەرگریم پێدا دێت و پشووی ویژدانم خۆش دەبێت، هەست دەکەم پارێزراوم، هەروەها وەفادارترین و جێی بڕواترین ئەنوا، ئەنوای خەونە، هەر فەرامۆشی ئەو ئەنوایە بوو، هەڵیبژاردم بۆ نووسین.

خەون لە چارەنووس دەپرسێت، بۆ ئەوە خەون دەبینم ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە گرینگە ببمەوە سەرسامی چییە، یان من کێم، یان کەسەکانی ناو بەهەشت و دۆزەخ خۆشی و ئازارەکانیان چین.

پتر لە هەر کتێبێك قەرزاری خەونبینینی خۆمم، خەونبینینیشم تاکە بەشێوازی کۆ، هەمیشە لە نووسیندا من کاتی نووسینم، نووسین کاتی من نییە، کە کاتێکی زۆر بزر و تایبەت و هەستیارە، بەردەوام خەونەکانم دێنە ناو چرکەکانی نووسین، فریشتەی پەیامگەیەنەر هاوڕوانین و هاونووسین و هاوخەونبینینم دەبێت و ڕێنوێنی ڕژانی گیانم دەکات.



دوای تەواوبوونی یەکەمین ڕەشنووسیش بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ ڕادەمێنم و بیر دەکەمەوە بۆ چەند هەفتەیەك پشوو دەدەم، دواتر دەگەڕێمەوە سەر ڕەشنووسەکە و پاکی دەکەمەوە، ناونیشانی بۆ دادەنێم، ناونیشان وەك ڕووناکییەکی تیژ تێپەڕە بۆ ڕۆشنکردنەوەی پانتایی و بنیاد و جووڵەکانی ناوەڕۆك و ناساندنی دەق، چونکە بەهۆی ناونیشانەوە نووسین و بینینی نووسەر پێشکێش دەکرێت، واتا و کرۆکی دەقەکە دێتە بەر بیر و خەیاڵی خوێنەر.

من چارەنووس دەنووسم، لەبارەی چارەنووسەوە نانووسم.

## (۲۰)

کۆمەڵێك حیکمەت و گیانی پەتی و بیر و مەودای ئێستێتیکیم لە کەلەپوور و ڕۆشنبیریی کوردی بۆ ماوەتەوە، نموونە: لە حەیراندا خاڵبەندی پەیڕەو نەکراوە، سەربەندو ناوبەندو کرانەوەی دوابەند هەیە. بە گوێگرتن و هۆشیارییەکی ڕاستەقینەی ترپە و ئاواز هەستی خاڵبەندی لای حەیراناس دروست دەبێت، هەروەها لە شیعری میللیی کوردی و شیعری کلاسیکی خاڵبەندی پەیڕەو نەکراوە، پەیڕەو نەکردنی خاڵبەندی لای من نەزانین نییە، بگرە وەك مەبەست و هونەر گەڕانەوەیە بۆ هەستی سەرەتایی کوردی و ڕەسەنایەتی کەلەپوور.

لە سپێتی کاغەزو دابەشکردنی وێنەدا هەست و نیشانەکانی خاڵبەندی لە ئاستەکانی دەربڕین لە خەیاڵ و زەینی خوێنەری خود وریا دەستنیشان دەکەم.

نموونە: ڕستەی بۆ کوێ دەچیت. ئەم ڕستەیە ئەگەر نیشانەی پرسیار، یان سەرسوڕمانم بۆ دانا. ئەوە بێ گومان ڕستەکە دەستنیشان دەکەم. پرسیارە، یان سەرسوڕمان. ئەگەریش هیچ نیشانەیەکم بۆ دانەنا و بە کراوەیی هێشتمەوە لەم باروبوارەدا ڕستەکە دەبێتە ڕستەیەکی گشتگیر و دۆخگۆڕ و زەینی.

من زەین دەنووسم، لەبارەی زەینەوە نانووسم.

## (٢١)

تێگەیشتن و تێنەگەیشتن هیچ لە ئارەزووی من ناگۆڕێ بۆ ئەدەب، لە هێڵە گشتییەکانی هونەری خودایی و سامانی ژیان و ڕەگەزەکانی شێوەکاری،... تاد. خەیاڵ ئامادە دەکەم، لەسەر هەر شەش هەست کاری پێدەکەم و دەیخەملێنم. شێوەکاری بەشێك نییە لە سامانی جوانی، بگرە خاوەنی سامانی جوانییە، شێوازیشی ناوەندی سروش و ئاماژە وەرگرتنە بۆ تەواوی هونەرە جوانەکان. هێڵ و خاڵ و بۆشایی و سێبەر و ڕووناکی و دووری و نزیکی و گونجاندنی ڕەنگەکان لەبەرهەمی ئەدەبی مندا دیارو نادیار ئەدگاریان درەوشاوەیە و بەکاربردراون.

شیعریش گەیشتووە بە چڕبوونەوە لە ڕۆشنایی و سەداسەد کردارێکی بەرهەمهاتووی جوانییە، جاروبار ڕووبەڕووی ئەم بارە بوومەتەوە لەکاتی گەرمەی نووسیندا مەبەست و نیازەکان دژوار دەبن، ڕوون و ئاشکرا دۆخی نووسین وەرناگرن، دادەمێنم، سکێچ دەکێشم بە سروش و ئاماژە وەرگرتن لە سکێچەکان دەگەڕێمەوە دۆخ و باری سەرەتایی نووسین. مەبەست و



نیازەکان بە ڕوونی و ئاشکرا دەدوێنم و شێوازێك بۆ ئەوپەڕی زمان و ئامرازەکانی دەربڕین پێشنیاز دەکەن.

من جوانی دەنووسم، لەبارەی جوانییەوە نانووسم.

## (٢٢)

لە تاکیدا نووسەر لە هەقیقەتی ژیان دەپرسێت و سەربەخۆیە، سەربەستی تەواوی لە جۆری بیرکردنەوە و خۆ دەربڕیندا دەستکەوتووە، ویژدانی لەبڕیاری گوتن و هێزی شێوازدا ئاسوودەیە، سەرچاوەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئازادی و ئازاییەی خۆی بە خۆی داوە، پرسیویەتی: من بیرکەرەوەیەکم شوێنم لە ژیاندا چییە. نابم بە داوی هیچ شێواز و گروپێك، سەردەمی گروپ و قوتابخانە شیعرییەکانیش بەسەرچوون، ئێستا سەردەمی شاعیری تاکە.

من سەرچاوە دەنووسم، لەبارەی سەرچاوەوە نانووسم.

## (٢٣)

شاعیری ئەزموونداری کار لەناو مانای ئامادەکراو ناکات، ئاماژەکان دەجوولێنێ تا ئاستی پەرجوو دروستکردنیش سادە دەبێتەوە، لە سادەبوونەوەیدا دەگات بەخۆ دەربڕین و چێژی بوون، تەنیا مرۆڤە هەستیارەکانی ناو کۆمەڵگە بایەخ بە شیعرو درەوشانەوەی گیانی دەدەن، هەستیارەکان خاوەنی دەروونێکی ڕەنگاو ڕەنگی ئاشتی ویستن.

دەڵێی بەندەیەکی خودایی و سووتاوێکی پاکبووەوەم لە هەموو شتەکاندا، خەونی سادە دەبینم، سروشتی کەسایەتیم وا هەڵکەوتووە لە دانیشتندا کەم بدوێم، گوێ بۆ گفتوگۆی دەوروبەر ڕابگرم، بێ ئەوەی خۆم ئەو بێدەنگییەم وەك پلان بۆ ژیانم نەخشەڕێژ کردبێت، خۆی لەگەڵ قۆناغەکانی ژیانم هاتووە و لە دایکبوون و خودا بەخشیویانە.

بێدەنگی و کەمدوویی بووەتە بەشێکی سەرەکی لە ژیانم. زۆر گرفتیشی بۆ ناومەتەوە، چاوناسی وام لێ ڕاست هاتووە دوور، زۆر دوور لەوەی هەڵسوکەوتی لەگەڵمدا هەبێت و تێکەڵ بە کەسایەتیم بووبێت، تەنیا بەهۆی ئەم کەمدوویییەوە ڕقی ئەستووری لێم هەڵگرتووە و قسەی لەبارەمەوە هەڵبزرکاندووە، بێ ئەوەی هیچ بار و بوارێکی بۆ هەقیقەتیش هێشتبێتەوە.

وا هەست دەکەم لە بێدەنگیدا بە کرۆکی بوون دەگەم، یان بوون نهێنییەکانی خۆیم بۆ دەدرکێنێ، خەونیش بە ئامرازێك دەزانم بۆ باش حاڵیبوون لە هەقیقەت و واقیع.

من کرۆك دەنووسم، لەبارەی کرۆکەوە نانووسم.

## (٢٤)

شیعری نەوەی پێشە من هەرچییەك بووبن بەرێزەوە لە کتێبخانەکەمدا پاراستوومن، کە زۆرینەشیان یەکبینی و یەك هەستپێکردن و واقیعی هەڵچووندارن، بەڵای منەوە جێگای مانەوەن، وەك نووسین و بەرهەمی نەتەوە شیاوی بە گەورەیی تەماشاکردنن، ئەگەرچی لە بیری مندا کاریگەرییەکی



وایان جێ نەهێشتووە و نەبوونەتە ناوەند و مایەی سوودبەخشین و جووڵاندنی یادگە تا بەردەوام وەك خەیاڵی جوانی گەشتم دووبارە بکەنەوە.

ئەوان شیعریان ستوونی بینی، یان بە ئاست و ئاراستەی بەرزبوونەوە، یان بە ئاست و ئاراستەی نزمبوونەوە، بۆ جیاکاربوون و خۆتازەکردنەوە بە لێزیادبوونی ستوونی و ئاسۆیی و بازنەیی بینیم، بە یەکەم بینین و هەستپێکردنێکی تەنك کەشی نووسینم بۆ نارەخسێ و ناچمە ناوی.

بینین و هەستپێکردن لەگەڵ فەنتازیاو خەون دەخەملێنم، دواتر وەك ئەزموونێك لە هەناوی گشتی سەر هەڵدەداو دەبێت بە بوونێکی خاوەن قەبارەی شیاو، تەبایی و گونجاندن و هێز دەبەخشێتە کارەکانی دیکەم.

من کەش دەنووسم، لەبارەی کەشەوە نانووسم.

## (٢٥)

+-شاعیرانی کلاسیکی کوردی، بە تێگەیشتنی ڕاستەقینەی شیعر، ڕوونتر و داهێنەرانەتر لە شاعیرانی ئێستا بایەخیان بە ئەوپەڕی زمان، ئێستێتیکای زمان داوە، تەماشای هۆگربوونیان بە ئەوپەڕی زمان و ئێستێتیکای زمانەوە بکە، گەیشتوون بە ئاستی دەروونرۆشنی و تێگەیشتنی ڕۆڵی زمان لە دەقی ئەدەبیدا.

زمانی کەم وێنە و دەسەڵاتداری شیعری کلاسیکی منی بەکێشی ناوچەقی زەمینەی بە پیت و هەوایەکی نوێ کرد، ئەزموونی خۆی لە ئامادەبوونێکی ڕۆشن و سروشتی و پڕ ڕەنگتر پێ تاقی کردمەوە.

کرۆکی ژیان و مردن بە نەدۆزراوەیی ماوەتەوە، هەروەها زمانی شیعری کلاسیکی کوردیش.

زمان لە شیعری کلاسیکیدا ئاست و ئاراستەی لەباری وەرگرتووە بە تەواوی لایەنگیریم، شاعیری هاوچەرخ لەناو زمانی شیعری کلاسیکی قاڵ نەبووبێتەوە قەتاو قەت ناگاتە هیچ سەرکەوتن و پێشکێشکردنێکی هۆشمەندانەی زمانەوە.

دەمەوێ لە وشیاریی نووسیندا، کە دەربڕین لە خەم و هونەر و دەروونی کوردی دەکات زمانێکی نزیك لە شیعری کلاسیکی ڕیشەدار و فرە ئاسۆیی ئەگەر بتوانم دابهێنم، یان بەکاربهێنم. وەك شێواز نا، وەك گیان و زمان و سروش و پرسیارە گەردوونی و چارەنووسسازەکان. دەچمە ناو کلاسیك و خاڵی دەرچوون دەدۆزمەوە. واتە ئەوپەڕی زمان و خەیاڵی بینین

لە دەقی خەونیدا زمان ڕستە دەکاتەوە و کەش وهەوای تەسەوف دادەکشێنێتە ناوەوەی تاك و مانا چەسپاوەکان ڕادەکێشێتە ئاقاری گۆڕان و بارگاوییان دەکات بۆ جوولاندن.

ئەمەش بە لووتکە گەیشتنی شیعرییەت و جێبەجێکردنی ڕاسپاردەی جوانی و بە پیتکردنی ڕێڕەوەکەیەتی. جوانییەکان قەوارەیەکن بۆ ئازادکردنی مرۆڤ و ئەندێشەی ئەفسانەیی و نووسینی ئازاد.

لە دەقی خەونیدا مانا هەمەچەشنەیە، خەیاڵ پەرێشان ناکات و بانگەوازە بۆ خولقاندنی جوانییە هەمیشەییەکان و بەرێز ڕاگرتنی بەها تا هەتاییەکانی ژیان.

من ئەفسانە دەنووسم، لەبارەی ئەفسانەوە نانووسم.



## (٢٦)

من سەر بە هیچ ئایدۆلۆژیایەك نیم و لایەنگری هیچ حزبێکیش نابم. بە نان و ئاوی ویست و خۆبوونی خۆم دەژیم، ئەم خۆڕاگەیاندنە دڵی شێری دەوێ، شیعری بێگەرد دڵی شێرە. داهێنەری ڕاستەقینە لە سروشتی خۆیدا کەسێکی یاخی و دژە دەسەڵاتە. من شیعری بێگەرد بەرهەم دەهێنم و شیعری بێگەردیش پشت بە نوێبەخشی کۆمەڵگە دەبەستێت. کۆمەڵگە لە نوێبوونەوەیدا دڵی شێر دەدۆزێتەوە و دەیبەخشێتە داهێنەری ڕاستەقینە.

نووسەری ئایدۆلۆژیست بەوە تاوانبارم دەکەن، کە دوورم لە کێشەو مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانەوە، منیش بەهەموو ئاست و ئاراستەیەك خۆم پاراستووە لە فریوی ئایدۆلۆژیا و هەراسانکردنی ئەمجۆرە تاوانبارکردنە. ئەدەب بە گیانی پەتی و جوانی دەزانم، خۆ بەدوورگرتنیش لە ئایدۆلۆژیا بە هەقیقەتی ئەدەب، لە ڕێگای هەقیقەتی ئەدەبیشدا بیر لە جیهان دەکەمەوە. گرفتەکانی لە خاڵێکدا کۆ دەکەمەوە ئەمیش خاڵی هێزی نووسین و درەوشانەوەی خەونییە. ئەو چەمکەی مەبەستیشمە بیگەیەنم پەراوێزی ناکەم، بێ دوودڵی وەك بەرزاییەك پیشانی دەدەم و دەری دەبڕم. ویستوومە خەون بکەمە کەسایەتی چالاك و ڕووبەڕووی ژیانی بکەمەوە، درەوشانەوەی خەونبینین لە کوێوە دێت، من بەبێ خەونبینین لە نووسیندا هیچم پێ ناکرێ و هیچ بە هیچ ناکەم، هەمیشە بەدوای ناوەندی درەوشانەوەی نووسین وێڵ و ماندووم، ئەی خودایە من مرۆڤێکی بە باوەڕم،

بمگەیەنە دەروونرۆشنی نووسین، پەیامبەرەکانیش بە مرۆڤی باوەڕ و گەورەترین خەونبین بوونە.

من گیانی پەتی دەنووسم، لەبارەی گیانی پەتییەوە نانووسم.

## (٢٧)

ئەدەب بە سەرجەم شتەکانی ناو کۆمەڵگە پەیوەندداره، بەوانەوە بوونێکی درەوشاوەیە، ناتوانێ لەناو دواکەوتوویی کۆمەڵگە دەرپەڕێ و خۆی وەك دەقی شارستانیی ئەزموونداری پیشان بدات، لەگەڵ گەشەکردنی کۆمەڵگە گەشە دەکات و ئەزموونی هاوتای شارستانی بەدەست دەهێنێ، پێوەندییە جێگیرەکان هەڵدەوەشێنێتەوە، پێوەندی نوێ دادەمەزرێنێ بۆ بەڕێوەچوون.

توانای گۆڕان لە ژیان ئاسان نییە، هەروەها گۆڕان لە ئەدەبدا چەند بارە گرانتر و دژوارتر، داهێنەری سەیر و سەرسوڕهێنەر، کە دەگەنە دواین پلەی داهێنان و دەروونرۆشنی. بابەت و هونەرەکەیان تەواو خۆماڵی و وەرگیراوی ناو ژیانی گەرم و قووڵایی بیرکردنەوەن، بۆیە وەك دەقی سەرسامکەر خوێنەر قبووڵیان دەکات و بە ئەزموونی بەردەوامی خۆی دەزانێ، لە چاوگ و سەرچاوەی کولتووری پڕ جموجووڵی کۆمەڵگە نیشانەکانی هونەر و جوانی پێکاوە، کولتووریش هەمیشە شۆڕشگێڕە، بەردەوامیش لەگەڵ بوون و پەرەسەندن کەرەستەکانی بەڕێوەچوون بەرهەمدار دەبێت.



بابەتی ئەدەبی هەرچەندە خۆماڵی و لەناو جەرگەی ژیاندا هەڵبژێردراو بێت و هونەری تێدا بدۆزێتەوە دەرگای بە جیهانبوونی فراوانتر بە ڕوودا دەکرێتەوە، بە قەناعەتتریش وەردەگیرێ.

من گۆڕان دەنووسم، لەبارەی گۆڕانەوە نانووسم.

## (٢٨)

تەواوی ژیانم خستووەتە خزمەت شیعرەوە، هەر بۆ شیعریش ژیانم دەوێ، بەهۆی ئەم خۆ تەرخانکردنەشەوە زۆر گێچەڵم پێ کراوە، لەمەشدا خودا یارم بووە و دڵشادم بەوەی ئەوانەی گێچەڵیان پێ کردووم هەر هەموویان ئەوانەن، کە لە پەراوێزی ئەدەبدا کارمەندن، یان خوێنەری تەمبەڵن.

داهێنەرم زۆر لەبەر چاون، لە ژووری کتێبخانە و نووسینمدا وێنەی هێندێکیانم هەڵواسیون، لە خەمە نیشتووەکانی سەر دەموچاویان ورد دەبمەوە سروش و خەون و خەیاڵ و وشەیان لێ دەدۆزمەوە و لە شیعردا بەکاریان دەهێنمەوە.

نەمویستووە ببم بە کەس، بگرە ویستوومە بەو ڕێگایانەدا بڕۆم، کە ئەوانەی لەبەرچاوم گرتوون پێی گەیشتوون بە شیعرییەتی پەتی و دەروونرۆشنی.

من دەروونرۆشنی دەنووسم، لەبارەی دەروونرۆشنییەوە نانووسم.

## (٢٩)

ڕەخنەی بنیادنەری کوردی نا، بگرە پەراوێزەکانی ڕۆشنبیریی کوردین، تۆپەڵێك قسەی لە هیچە و پەلاماری بێمانا و بێ بنەمان، دەنا یەکێك لەم پەلاماردەرە هەڵبزڕکاوانە ئەو هەقیقەتبین و بوێرییەی لا دروست دەبوو ڕووبەڕووی دەقێکم ببێتەوە و گومان بخاتە تانوپۆو ڕایەڵی بوونی، لێکدانەوەکانی بڕوا بە بەرانبەرەکەی بهێنێ بنیادی بەرهەمهاتووی شڵەژاوە.

من بۆ خۆم زۆر ڕێزم لە داهێنەرانی پێشە خۆم گرتووە، بەردەوامیش دەبم، بڕواشم بەوە هەیە ململانێ لە ئەدەبدا ناتگەیەنێتە هیچ و ڕەوایی تێدا نییە، بگرە خودناسی و بەردەوامبوون و سووربوون و نیازپاکی دەتگەیەنێتە ئەنجامێکی سەرنجڕاکێش، ئەوەی تا ئێستا من پێمزانیبێ و ئاگاداری بم لە مێژووی شیعری کوردیدا هیچ شاعیرێك بەقەد من تووشی شەڕ و گێچەڵ و قسەی لە هیچە و دەمهەڵبەست و پەلاماردان نەهاتووە، بەڵام هەقیقەتبین بەسەر ئاژاوەو بێتوانایی پەراوێزەکان ڕەت دەبێت و خۆی دەسەپێنێ و دەدرەوشێتەوە.

هەڵبزڕکاوە بەسەرچووەکان پەلاماری ناشارستانی ئەزموونی پتەوی جوانووسەکان دەدەن، خۆ مێشوولەش تەنیا لەناو نێرگزەجاڕدا دەنگێکی نەشازی لێوە دێ، بە خەیاڵی بەتاڵی بوونێکی کاتی بۆ خۆی دروست دەکات، دەشبیندرێ پەلاماردەرە هەڵبزڕکاوەکان دەکەون و وەجاخکوێر دەمێننەوە، دەقی پتەویش وەك شمشێری هەڵکێشراو دێتە ناو ژیان و تێکەڵ بە جووڵانەوە کاریگەرەکان دەبێت، دواتریش دەبێتە هێمای مەزنی و درەوشاوەی نەتەوەکەی.



لەگەڵ ئەمەشدا، ڕەخنەگرانی بنیادنەر ڕووبەڕووی ئەم پەلاماردەرە بەسەرچووانە بوونەتەوە، ناچاری شەڕ و گێچەڵیش کراون لەپێناو پارێزگاریکردن لە ئەدەبی پەتیدا.

بەسەر پلان و پیلانی دوژمنان و پەلاماردەرە هەڵبزڕکاوەکان سەر دەکەوم، بە هەوڵ و کۆششی لە دڵەوەم بۆ شیعر بە سزای داهێنانیان دەگەیەنم. بە بینینی داهێنان قەڵەمی دەست و پێیان دەشکێ.

ڕەخنە دوو باوەڕی نییە لەگەڵ دەقە، یان لەگەڵی نییە، یەك باوەڕی بە تینی هەیە ئەمیش کارکردن و بڕواهێنانە لەناو دەق.

ڕەخنەی خۆ نیشاندەر و مەبەستی دەرەکی و قسەی لە هیچە و پەلاماری بێ مانا و بێ بنەما، جێگا و متمانەی لەناو ڕۆشنبیری پەتیدا نییە، بەتاڵکردنی ڕق و کینەو بێتوانایی و کەمسەری و ئیرەیی و خۆخەڵەتاندن و ویژدان کوێرییە.

هیچ نیازێکی هاوبەش و ئاماژەیەکی گرینگیش لەنێوان قسەی لە هیچە و پەلاماری بێ مانا و بێ بنەما و دەقی ئەدەبی پەتیدا نییە.

هەر کەسایەتییەك گیانی بە ئەدەب و هەقیقەتبینین و پاکی و جوانی داگیرسابێت، بە هیچ جۆرێك دەرگای ئاژاوەو ناشیرینی و دووڕوویی ناخاتە سەر پشت، هەر کەسایەتییەکیش بۆچوونی ئاژاوەچێتی لە دەرووندا ڕوا بێت، هێشتان بە ئەقڵی پاشکۆیی و داردەستی و دڵڕاگرتنی ئەم و ئەو بەڕێوە دەچێت.

بۆ شیعرییەت تێدەکۆشم و نایەمە سەنگەری قسەی لە هیچە و پەلاماری بێ مانا و بێ بنەما، قەڵەمی لێ ناجووڵێنم، بەکارێکی

بێهوودەشی دەزانم، جەنگان لەگەڵ جێماو و پەراوێز و لێخنبیر و خەمەگڕووی ئەدەبی و ویژدان کوێران.

من تانوپۆ دەنووسم، لەبارەی تانوپۆوە نانووسم.

## (٣٠)

ببڕای ببڕ بیرم بۆ ئەوە نەچووە بڵێیم لەم کردار و بەکاربردنە یەکەم کەسم، یان ئەم هونەرە لە ڕوانینی منەوە خولڵقاوە، پێشڕەو و هێمای ئەو ڕووداو و دیاردەیەم، ئەمجۆرە خەیاڵکردنانە، بە نەخۆشی کوشندە و گران و لەناوبەر دەزانم، بگرە هەموو خاڵەکانی گۆڕانکاری لە درەوشانەوەی شیعرییەت دەبینم و بەس. شاعیری خاوەن دیدگای ڕوون و بەهێز و جوانداڕێژەر بەئاماژە و ڕۆشنایی هیچ بڕیار و مەرجێکی سەپێندراو نانووسێت، ئەرکی دەوڵەتە ئیش بۆ کتێبی کۆمەڵایەتی و ئابووری و هزری و ئایینی و زانستی و پەروەردەیی و یاسایی و سەربازی و مێژوویی و فەلسەفی،... تاد. بکات و بە تیراژی زۆر بڵاویان بکاتەوە، کەناڵەکانی ڕاگەیاندنیش بخاتە خزمەتیان.

ئەرکی شاعیر یەك شتە، پێوەندییەکانی مرۆڤ و ژیان و جیهان بدۆزێتەوە، ئەم دۆزینەوەیەش جوان بنووسێت و بیگەیەنێت، ڕادەی ئاگادارکردنەوەی هێزی وشەی کاریگەری و شوێن جێ بهێڵێت لەسەر هەست و ئاراستەی ئێستێتیکای کۆمەڵگەوە. پرسیارە کاریگەرەکان بکات و ئامادەبوونی تاقانەی خۆی بپارێزێ.



ژیان بەرگەی مانەوەی گرتووە و دەگرێت، شیعریش نەگەڕێتەوە بۆ منداڵدانی ڕۆشنبیریی پەتی و بەسووڕی سروشتی تێ نەپەڕێت دەبێتە لاساییکەرەوەیەکی یەکجار بێ بایەخ، یان کەناڵی ڕاگەیاندنی پڕوپاگەندەی پووکاوە.

هەرچی هۆی بەختەوەری هەیە، دەسەڵات و سیستمی دیکتاتۆری سیاسی لە مرۆڤی دەروونڕۆشنیان داگیرکردووە. مرۆڤی دەروونڕۆشنیش ئەم لەدەستچوونەی لە خەوندا بەدەست دەهێنێتەوە.

پێویستە ئێمە خەون بەجۆرێك لەناو دەقی ئەدەبیدا بەکار بهێنین پەیامەوەرگر بڕوای پێ بهێنن و لێمان وەرگرن، توانای بیرکردنەوە و ڕووبەڕووبوونەوەیان لە ناخدا دروست بکەین.

لە پێناوی بەجوانی ڕاگرتن و هێشتنەوەی بەهای شتەکاندا، شاعیر بە دادپەروەرێکی دانا دەزانم، پێویستە لەم دۆخەشدا بژی و بمێنێتەوە، مەشقی مەیدانخوازی شایستە بکات.

شوێنی ڕاستەقینەش بدا بە شیعری پەتی و بێگەرد، کە خەون و جوانی و مانا و نارەزاییە لە کردارە ناجۆرەکان، دەنگ هەڵبڕینە لە بێدەنگییە گشتییەکان، جوانییەکیش ڕەت دەکاتەوە مانای تێدا ئاوەژوو کرابێتەوە.

من بەها دەنووسم، لەبارەی بەهاوە نانووسم.

## (٣١)

هەموو بوونەوەرێك خاكێكی خۆگونجاندنی خودی هەیە، بۆشی هەیە بۆ خۆگونجاندنی لەم خاكەیدا تایبەتكارییەكانی خۆی بپارێزێت.

من تایبەتكاری دەنووسم، لەبارەی تایبەتكارییەوە نانووسم.

## (٣٢)

پەیامی ڕاستەقینەی ئەدەب دەسەڵاتی دەقی خەونی بەهێز دەكات و دەیكات بە ڕەگەزێكی گرینگی پرسیاركردن لە ژیانی جوان، كە بوونی مرۆڤ پرسیارێكی كاریگەرە لە ناوكی بوون دەكرێت.

مەسەلەی گیانی و جوانی لە هونەرەكانی نووسیندا هەمیشە خەبات و جۆشی ژیانی كەسی جوانیبینە، لە دەقی خەونیدا ژیان بەهای پێكهاتەی جوانی وەردەگرێت.

شیعری بیركردنەوەی پڕ لە جووڵەی هاوتا بە جوانی، ڕوانین و دەرەوشانەوەی لە گیان و خەونەوە دارژاوە، كە جووڵە و مانا و بەهاكان لە گەردوون و ژیان و مرۆڤ بە چەند ئاست و ئاراستەیەك وەردەگرێت، فرە پاڵەوانییەتی لەیەك پاڵەوانیدا ئامادە دەكات، دەیهێنێتە ناو ململانێ و جەنگی توندوتیژی هەمیشەیی، تا خودی شاعیر دەرباز بێت لە تاكییەوە بۆ ناو ڕۆشنایییە پڕ تەلیسمەكانی هاوتابوون، یان حەز و ئارەزووی ڕوو لە زیادبوون و چاوە نەسرەوتووەكانی بەردەوام لە گۆشە لەبیركراوەكاندا داگیرساوە، خودی شاعیری خاوەن ڕوانین و جیهانبینی بەهۆی بارستی كاغەزەوە هەست پێ دەكرێت و وەك ژیانی جوان دەبیندرێت.



لە دەقی خەونیدا شیعر نە بۆ ئایندە دەچێ، نە بۆ ڕابردوو، بگرە هەموو كاتەكان ڕووگەنمان بۆ دۆزینەوە. بێگومان هەر شاعیرێك بیەوێت بەو شێواز و ئاست و ئاراستەیە بنووسێت، پێویستە ئەوە لەبەر چاو بگرێت، كە قووڵبینییەكەی لە ئاست كێشە هەبووەكانی ئەو ڕۆژگارەدا بێت، كە دەبێتە خوڵقێنەری بارە ناهەموارەكان، یان بارە جوانەكان.

لەباری یەكەمدا ناهەمواری دەبێتە مایەی هەڵچوون و توندوتیژیی نووسین.

لەباری دووەمدا جوانی دەبێتە مایەی ئارامیی بیركردنەوە و خوڵقاندنی نووسین.

ئەوەی پێویستی بە قسە لێ نەكردنە، ئەمرۆی شارستانی و ڕووناكبیری لە هەموو بار و دۆخەكانی پێشتردا سەرسوڕهێنەرترە، شارستانییەت و تەكنەلۆژیا بیری جوانی ناشێوێنێت، بە پێچەوانەوە گەشەپێدەری بیری جوانی و مۆتیڤ و وێنە و خەیاڵ و گفتوگۆ و بەختەوەریی خەونە.

لە دەقی خەونیشدا یەكگرتنەوەی گشتی بەشە جیاجیاكان دەدۆزرێتەوە. ململانێی ڕوانین شڵەژاو و بارمردوو لەگەڵ ڕوانین ڕوون و بار زیندووی نوێزادەی دۆزەرەوە لە گفتوگۆی لە یەكنەگەیشتنن. لە دەقی خەونیدا، لە جەنگی توندوتیژی لەگەڵ خۆتدا، دەتوانیت خۆت ڕەت بكەیت، ئەو شێواز و ئاراستە باوەی پێت نووسیوە، فڕێی بدەیتە پشت نووسینەكانی لە پێشترت، بە شێواز و ئاراستەیەكی تەواو جیاكار و نوێبەخش بێیتە ئاخاوتن و گۆڕانێك لە ڕابردووی خۆت بەرهەم بهێنیت، بەڵام ئەو گۆڕانە چۆن بەرپا دەبێت، كام هۆ و شێوازی دەربڕین فڕێی

داونەتەوە لە نەناسراوییەوە بۆ ناسراوی، لە دۆخی وەستاو بۆ دۆخی پڕ بزاوت.

لە نووسینی ئەدەبی ڕاستەقینەدا پێویستە بە تەنیا جوانی ببیندرێت.

شیعری سەردەمێك لەمەوپێشی کوردی ڕۆمانسییانە بیری لە گەردوون و ژیان و مرۆڤ کردووەتەوە، لە ناوەڕۆکدا لەگەڵ هەلومەرجی واقیعی سادە و ساکار زۆر گەرم و گوڕ و هەڵچووندار بوون، کەچی لە شیعرییەتی زمان و مۆرکی شێوازدا بە پێچەوانەوە ساردوسڕ بوون، نەیانتوانی مۆرکی شێواز و شیعرییەتی زمان ئاوێتەی زەین بکەن و بیکەنەوە، بیرکردنەوەکانیان بەشێوازی خەونی بخەنە ناو نووسینەکانیان، کە گەورەترین هۆش ئەمە بوو بۆ ئەوەی نووسینەکانیان وەك نووسینی داخراو بمێننەوە، نەگەن بە ئاستی دەقی فرە ئاست و ئاراستەیی.

وشە لە شیعرەکاندا یەك ئاسۆی دراوەتێ، ئەمیش ئاسۆی ڕووکەش و یەك مانایی وشەکەیە، لە ساکارترین شێوازدا جێیان هێشتووە، ئاماژە ستوونی دادەبەزێت، بەهەمان شێوازی ستوونیش دێتە ناو بوونی یەك ئاسۆی نووسین.

ئاسۆی فەنتازی و دەستوەشاندنی داهێنانی بلیمەتی تێداهەڵبزڕکاو و گەشەنەکردووە، واتە وەك چێژ بەکاربردراون نەك وەك دۆزینەوە، ڕەنگە هۆکارێك، یان یەك لە هۆکارەکان ئەوە بێت، کە واتا و هێزی وشەیان ون کردووە، نەیانتوانیوە کەڵکی باش و داهێنەرانە لە ئەزموون و مۆرکە زمانییەکانی قۆناغی شیعری کلاسیکی وەربگرن.



دەقی خەونی لە منداڵدانی مێژووی مردوو لە دایك نابێت، هەست بەوە دەکرێت سەختی و دژواری سروشت و زەبرو زەنگ، نووسەر دەترسێنێت، هەمیشە هەوڵی جووڵاندنەوەی دیمەنە پڕ کێشمەکێشمەکان دەدات، بارە بە پیتەکان بە وریایی و زیندوویی وەردەگرێت بە زمانێکی تەواو ئەفسوون و جادوویی دابڕاو لە زمانی کارەکانی پێشووی خۆی ناخی پێشکێش دەکات، وەك خودێکی هۆشمەندو سەرچڵ ئەم و ئەو لە بیرکردنەوەکانی خۆی دەسڕێتەوە، شتە زیندووەکانی جیهان لە دەقدا دەکات بە هی خۆی، خوێنەریش بازنەیی دەیخوێنێتەوە و ستوونی لە ئەزموونی خەونەکە نزیك دەبێتەوە. پاشان دەچێتە ناو کەشوهەوا و لێکدانەوەی ئاسۆیی، چونکە دەقی خەونی لە خولانەوەی بەردەوامدایە، شیعرییەتی زمانیش ڕۆڵێکی ئێجگار گەورە و سەرەکی دەبینێت لە پێکهاتەی وێنەی سەرسوڕهێنەر. کە هەموو هەبووەکانی زەمینی قۆزتبێتەوە و ئاسۆکانی نادیاریشی دووچاری ڕاوەشاندن کردبێت، بەهۆی ئەوەی تاکی لەجیاتی کۆ بەکارهێناوە.

من ناوکی بوون دەنووسم، لەبارەی ناوکی بوونەوە نانووسم.

## (٣٣)

شیعر لە ژیان و بینینی کورددا ڕۆڵ و ئامادەیی کاریگەریی خۆی سەلماندووە و خاوەنی شوێنی ناوەندە، لەبەر ئەمەشە وەك دیاردەیەکی پێویست و دامەزرێنەر تەماشای دەکرێت، ئەم تەماشاکردنەش وای کردووە لە چالاکییەکانی بیرکردنەوەی کۆمەڵگەی کوردیدا، شیعر پێشەنگی

وەربگرێت و زۆرینەی شتەکانی لەسەر دامەزرێندرێت، ئەم دامەزراندنەش دەگوازێتەوە ناو ژیانی شیعر، شیعریش پرۆژەیەکە لەمێژە بەردەوامە، ئەم هەولانەی لەمەودواش دەدرێن، تێکەڵ بەو هەولانە دەبن، کە لەمەوپێش پرسیار بوون و لە ژیان کراون، بەردەوامیش پرۆژەی شیعریی پرسیاری ترسناك و ورووژێنەر لە ژیاندا دەکات و مەرگ لە ژیاندا ئامادە دەکات.

مەرگیش ترسناك و سەرەکیترین هۆیە بۆ دڵەڕاوکێی داهێنان، ئامادەکردنی ئەم مەرگەش هێزی شیعرە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ گرفتەکانی ژیان و مان.

ژیان و بوون چییە. پرسیارێکە و چەندین بیرمەندی دووچاری بەدواداچوون و سەرگەردانی کردووە، ئەگەرچی لە ڕێگای ئەم پرسیارکردنەوە گەلێك بەرهەمی سوودبەخشیان خستووەتەوە، بەڵام گەوهەری پرسیارەکە پڕ سروش و خەیاڵ و تێڕامان و خەون و سەرسامییە، هەر بیرمەندێك شێواز و ئاستێکی بۆ داناوە، لە بەرزاییەکەوە وەڵامەکەی دەبینێ، ئەو پرسیارانەی لە دەقدا لە ژیان کراون، لە زەینی خوێنەردا جێگیر دەبن، دواتر ئەم پرسیارە دەبێتە هۆ و ئامانجی پرسیارکردن لای خوێنەر و نزیکایەتییەك دروست دەکەن لەنێوان نووسەری پرسیارکەر و خوێنەری پرسیارلێکراو و پرسیارکەر، کە بوونی مرۆڤ پرسیارێکی کاریگەرە لە ناوکی بوون دەکرێت.

لەدەقی خەونیدا پێوەندییەکانی نێوان هەست و وێنە دەدۆزرێنەوە، پێوەندییەکانیش لەسەر بنچینەی خەوندا دامەزراون، واتە ئەو وێنانەی لە دەقی خەونیدا دروست کراون، زیاتر ئەو وێنانەن، کە لە ژیانی سەخت و



یاخیی ڕۆژانەماندا ئامادەیییان وەك شتێکی دوور هەیە و بەرهەست نین، خەون بوونی نییە لەناوەوەی خۆت نەبێت، هەروەها شیعریش.

من سروش دەنووسم، لەبارەی سروشەوە نانووسم.

## (٣٤)

نوێبەخشی بار و بوار و کار و کردەی خولقاندنە، بەردەوام لە زەمینەی بە بڕوادا گەشە دەکات و کەرەستەکانی دەگۆڕێت بە مەبەستی جیهانبینی و دۆزینەوەی پێوەندیی نێوان بارەکانی هەست و بیرکردنەوە و خەون، خودی هۆشمەندیش هەموو جوولانەوەیەك لەم گۆشە ڕووناکەوە دەبینێ و هەوڵ دەدا بیخەملێنێ، بەڵام بە چ هێز و ئەفسوون و جادوویەك ئەم بینینانە دەگۆڕێت بۆ دەقێکی ئەدەبی و هاوچەرخی و ڕەسەنایەتی تێدا دەپارێزێت، ئەمە خاڵی کارکردن و بەجێهێنانی داهێنانە، لە هیچ بار و بوارێکیش چەمکی نوێبەخشی نابێتە واقیعێکی دانپێدانراو بەبێ ئاکارێکی بیری و فەلسەفی و کولتووریی ڕوون. لەگەڵ ئەمەشدا بە من وایە بۆ شیعر زاراوەی شیعرییەت پەسندو گونجاو و پڕ هێما و سروشترە، چونکە ناتواندرێ بڕوا بەوە بهێندرێ شاعیری نوێبەخش تا قوولایی مانا و فەزا و ڕاچڵەکاندنی وشە لە بابەت و مۆرکە زمانییەکانی خۆیدا شۆڕشگێڕ نەبێ و جەنگی توندوتیژی ڕانەگەیاندبێ بەرانبەر ئەوانەی لە زمان و نووسین و داهێنان گلاون، بەرەو ڕووبەرێکی سامناك مل دەنێن، یان ناتوانن لەناو گەرمایی گیان، گەوهەری خۆبوونیی بدۆزنەوە، کە خۆبوونی سەرەوەری شیعرییەتە، ئەگەرچی نوێبەخشی ئەنجامێکی دیاریکراوی نییە، بەردەوامیش گێروگرفت دەنێتەوە

لەبەر ئەوەی کەرەستەکانی دەربڕین دەگۆڕدرێن و فەنتازیای هەمەجۆری لێ دەخولقێندرێت، بەمەیشەوە نوێبەخشی سادەترین مافی مرۆڤە، کە تۆ لە ماڵەوە دەردەچیت بۆ سەر کار بەشدارییەکی ڕاستەوخۆیە لە کار و کردەی نوێبەخشی، کە لە کار دەگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە خۆ ئامادە دەکەی بۆ پیاسە، یان سەردانی پێشەنگایەك، یان ئاودان و بژارکردنی باخچەکەت، یان بینینی شانۆگەرییەك،... تاد. بەشدارییەکی دیکەیە لە کار و کردەکەدا، چونکە هیچ یەکێکیان سەداسەد بە شێوازێکی نەگۆڕ خۆیان دووبارە ناکەنەوە، بوونی تۆ وەك مرۆڤێك پێوەندییەکی پتەوی بە جووڵانەوە و گەشەی ئەمڕۆوە هەیە، تۆ تاکێکی لە نوێبەخشی، نوێبەخشیش بە گۆڕان لە بنیادی هەموو کۆمەڵگە وەك ڕووداوێك ڕوو دەدات و دەچەسپێت. قەوارەیەکی دانپێداندراو بۆ خۆی دەستەبەر دەکات، هەریەك لە شاعیرانیش بە ئەزموون و شێواز و قەبارەی جیای خۆی ڕۆڵی تێدا وەردەگرێت.

نوێبەخش لە کاتی خۆ هاتنەبەر چاو و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ خودی بوێریی خۆی مەرگی بەدواوەیە، یان شێتبوون، بەو واتایەی ڕاوی خۆی و سەرجەم بوون دەنێت، لەم پێشبڕکێیەدا پێویستە قووڵبین و شێواز ڕاچڵەکێنەر بێت و بوێریی ئەوە بکات ئەم بڕیارە خودییە بدات، هەر هەموو شاعیرێك بەو نیازە دەنووسێت کارەکەی بگەیەنێتە ئاستی دەق، بەڵام ئەوەی ڕوانین و جیهانبینییان تێدا نەبێ و ژانێك خاڵی دەرچوونی نەبووبێت، هێزی ئەوەی تێدا پەیدا نابێت کارەکەی بگەیەنێتە ئاستی دەق، گلاوە بەرانبەر مەرگ و سڕینەوە.



بوێری ئەوەی تێدا ئامادە نابێت جەنگی توندوتیژی خۆی ڕابگەیەنێ، ئەگەر ئەدەبێکیش هێزی بەرگری بەرانبەر مەرگ و سڕینەوەی تێدا پەیدا نەبووبێت، ناسنامەی بوون بە دەقی بەرناکەوێت، بوون بە دەقیش لە دۆخگۆڕین و جیهانبینییەوە دەستەبەر دەبێت، لە دەرەوەی دۆخگۆڕین و جیهانبینی هەر هەوڵێك لەم بارەیەوە بەرچاو بکەوێ هەوڵێکی ناکامڵ و زڕ و بەتاڵە.

پەراوێز بۆ شیعرکردن، یان شیعر نووسین بە مەبەستی لێکدانەوەی وشەکان، لەم کاروکردەیەشدا ناوەڕۆکەکە ڕوون بکەیتەوەو ڕاستەوخۆ بیرەکەی بگەیەنی، یەکەم نیشانەیە شاعیر ڕوانین و جیهانبینی توانای ئەوەی نییە ماناو هێزی وشە لەناو شیعرەکەدا ڕاچڵەکێنێ و ئاسۆیەك بداتە ڕاچڵەکاندنەکە، کەواتە وشەکە وەك بارستێکی بێ گیان و مردوو لە جەستەی شیعرەکەدا بارە، هیچ دەور و کردارێك لە گەشەکردنی جەستەی شیعرەکەدا نابینێت.

شیعری لەمجۆرە و هەوڵدانیشی وەك دەقی یەك ئاست و بێ دووری و یەك ئاراستە دەمێنێتەوە، نابێتە دەقی ئاستداری فرە دەنگ و فرە پێوەندی، لەوانەیە کۆمەڵێك شاعیر لە سەردەمێکدا کاربکەن، تەنیا تاکێکیان هێز و ئەفسوون و جادووی ئەوەی تێدا بێت دەق بکاتە بوونێکی دیار و بیدرەوشێنێتەوە، جووڵەکانی ڕابردوو بکاتە پاڵنەرێکی سوودبەخش بۆ بەئاگایی بیرکردنەوە، ئەگینا ئەوانەی دی پێوەندییان بە جووڵەکانی ڕابردوو وەك ڕابردوو هەیە، لە ئامادەکردنی ئێستای نوێبەخشدا دەست و پێ سپین.

بلیمەتەکانی قۆناغی شیعری کلاسیکی ڕوانین و جیهانبینیی خۆیان پێشکێش کرد و بڕوایی ئەدەبی ڕاستەقینەیان وەرگرت، کەچی چەندین وەچە دوای ئەوان هاتن و تێپەڕین، قەوارەیەکیان دەستەبەر نەکرد، لە هەمان کاتدا ئەوان هەروەك دەق و خاوەن قەوارە ماونەتەوە و جەنگی توندوتیژیی خۆیان بەرانبەر مەرگ و سڕینەوە ڕاگەیاندووە.

بەردەوامیش وەك دەقی ئاستدار و فرە دەنگ و فرە پێوەندی خۆیان پێشکێش دەکەنەوە، هاوچەرخی هەموو ئەوانەن، کە لە پرۆژەی گەورەی دەقی شیعری هاوبەشن و ژانیان تێدا گەرمە، بەدەقبوونیش پێوەندی بە ئەزموونی ژیان و چرکەساتی مەستیی نووسەرەوە هەیە، دەقی ئاستدار و فرە دەنگ و فرە پێوەندی زیاتر لە پانتایی زمان کارەکانی بەجێ هێناوە و جووڵە و بیری زمان بیری دەقەکە ڕادەگەیەنن، بۆ نموونە: شاعیرێك توانیویەتی تەنیا یەك بەرهەم بگەیەنێتە دەقێکی ئەدەبی ئاستدار و فرە دەنگ و فرە پێوەندی.

بەو پێوەرەی هەر شیعرێك توانی بگاتە ئاستی دەقێکی ئەدەبی ئاستدار و فرە دەنگ و فرە پێوەندی بەبێ هیچ گریمانەیەك، دەقێکی نوێبەخشە، ڕەنگە هۆکارەکەشی ئەوەبێ لەم دەقەدا ئەزموونی ژیان لە چرکەساتی سۆفییانە و مەستی گەیاندبێتییە ڕژانی گیان و ڕاچڵەکاندن و درەوشانەوەی زمان و نووسین.

من خۆبوونی دەنووسم، لەبارەی خۆبوونییەوە نانووسم.



(٣٥)

لە چالاکیی جووڵەداری شیعری کوردیدا ئەمجۆرە شیعرەی لەپێناو هاوسەنگکردنی شیعر و شۆڕشدا نووسراون، تەنیا بۆی کرا ترپە و ئاواز بگۆڕێ و جووڵە و ئاگایی بۆ چەند هێمایەکی دیاریکراو دەستەبەر بکات، بەڵام بۆی نەکرا ئەم هێمایانە بە قۆناغی گەشەپێدان و گەیاندن بە بنەڕەتی گۆڕان بگەیەنێت، لەگەڵ ئەوەشدا چەند شاعیرێکی دواتر، کە ویستی هێزی جوانی دەربڕین و دلێریی داهێنانیان لە هەڵچوونی شاعیرانەیان هێزدارتر بوو، بۆیان کرا هێماکانی ئەمجۆرە شیعرەی لە پێناو هاوسەنگکردنی شیعرو جوانی نووسراون، بە قۆناغی جووڵە و نیمچە گۆڕانێك بگەیەنن، دوای ئەوەی ئەم توندوتیژییە شۆڕشگێڕییەی شیعر هاوسەنگکردن بە شۆڕش نیشتەوە، جۆرێك تێڕامان و خەونبینین بوو بە بنەمای هونەری، پرۆژەی نوێبەخشی قەوارەیەکی بۆ کارکردنی خۆی دیاری کرد.

خودی هۆشمەند کەرستەکان بە سەنگایی ژیان دەپێوێ، ژیانیش بە گرانایی شیعر، دەقەکان توانای پێشنیاز و پرسیارکردنیان لە بنیادیاندا هەڵگرت، بۆیان کرا خاڵی جیابوونەوەی تەواو هەڵدەنە ناو پانتایی بار و بوارەکانی ژیان.

دەقێك توانیبێتی دوێنێ ڕابچڵەکێنێ، کەواتە بوونی قەوارەیەکی هەستپێکراو و بەرچاوی هەیە، بوونی ئەمجۆرە دەقەش تێڕامان و خەون خاڵی هێنانە بوونیەتی، ڕوونتر لە پانتایی نوێبەخشی سەلماوە، هێماپێکراوەکانی پڕ کراوە بە جووڵەی نوێبەخشی، هێما لە

کارکەوتووەکان دادەپۆشێ، هێمای سڕ و مەییو و لە کارکەوتوو ناتوانێت لە ئێستای پڕ جووڵەدا ئاخاوتنی کاریگەری هەبێت.

نوێبەخشی بەردەوامی وەجاخی ڕوونی ئادەمە، ئەو میوەیەی ئادەم خواردی نوێبەخشی بوو، نوێبەخشی پرسیارێکە نوێبەخش لەخۆی کردووە، ئایا دەتوانێت لەناو کۆمەڵگەی سەرەتایی و دواکەوتوودا لە هەموو ئاستەکاندا شکانێکی هەبێت، ئەم شکانە ویستی خودی هۆشمەند و ئازا دەسەپێنێ و خۆبوونیی دادەمەزرێنێ. داهێنان بڕیارێکی خودی کەسی ئازاو هۆشمەندە، هەر کاتێك نووسەر بوێریی ئەوەی کرد ئەم بڕیارە خودییە بدا، درەوشانەوە و داهێنان و گۆڕان بەرپا دەکات.

من ڕاچڵەکان دەنووسم، لەبارەی ڕاچڵەکانەوە نانووسم.

## (٣٦)

کارو کردەی داهێنان لە خودی شیعردا کەش و هەوای ئەمڕۆیە بەلێزیادبوونی کەشوهەوای خەونی، ئەمڕۆش لە خەونی سبەی ئامادەیی هەیە و هۆ و یارمەتیدەرە، ئەگەر ئەمڕۆ داهێنان بێت هەموو ڕۆژ و ڕۆژگارەکان ڕادەکێشێتە ناو خۆی، داهێنەر لەکاتی کارو کردەی نووسیندا ناکەوێتە دەرەوەی ڕۆژو ڕۆژگار، لەو ڕۆژ و ڕۆژگارەدا دەبێتە بوونێکی سەربەخۆ، کە بوونی ئەمی نووسەر قەرەباڵغ و بارگاوی و دڵبەرز و جووڵەدارە، بەڵام کە لەکارو کردەی نووسین بووەوە، نووسینەکە بوونێکی سەربەخۆی وەرگرت، دەکەوێتە دەرەوەی ڕۆژ و ڕۆژگار. هەموو پێوەندییەکان



دەسڕێنەوە کاتێك دروست دەبێت، دەبێتە کاتی داهێنان و خەونبینین و درەوشانەوە.

من درەوشانەوە دەنووسم، لەبارەی درەوشانەوە نانووسم.

## (٣٧)

دەقی شیعری لەناو پرسیارکردن ئامادەی لەدایکبوون دەبێت، هەر لەناو پرسیارکردنیشدا شیعرییەتی خۆی لە هەقیقەتی شتەکاندا وەردەگرێت.

پرسیار زانستە گشتییەکانی بوونە، بوونی خەون و سروشت و کۆمەڵگە.

شاعیریش وەك تاکێکی هەمیشە خەونبین و چاونەسرەوتوو و گوێ زرینگاوە و خەیاڵ گەرمی هەستکەر بە گرفتەکانی ململانێ لەناو کۆمەڵگەدا هەڵسوکەوت دەکات. دەچێتە ناو ئاژاوە و هێمنیی کۆمەڵگە و کاریگەری جێ دەهێڵێ، پێوەری بۆ ئەو شتانە لا دروست دەبێ، کە دەیانبینێت، یان دەیانبیستێ، یان خەونیان پێوە دەبینێ.

ئەم بینین و بیستن و خەونبینینەش لە دەرەوەیەتی. لەناوەوەی خۆیدا ئامادەیان دەکاتەوەو ڕۆڵێکی دیکەیان پێ دەسپێرێ، دەیانکاتە بابەتی جوانی و شیعر بەهۆی دەستەواژەی سەخت و یاخی و ئامانجی زمان شیعرییەتیان پێدەدا، کەواتە خودی شاعیر سەرچاوەی بابەتە بەهۆی ئامانجی زمان و خەونبینین.

جیهانی بیرکردنەوە و پرسیارکردن ئەو خودەیە، کە بڕیار لەسەر شتە بیستراو و بیندراو و خەونی و خەیاڵییەکان دەدا و بەهێز و گوڕ دەیانجووڵێنێ تا بەهۆی ئامانجی زمان بیانکات بە بابەتی جوانی و شیعر، لە ئاسۆ بینییەك کاریان پێ بکاتەوە، کە داهێنان و لەدایکبوون و دەروونرۆشنی و شیعرییەتە، لەدایکبوونەوەکەش باوەڕ بهێنێ بە هەقیقەتی ئەفسوون و جادوویی و لە گەشتی ڕوانین نزیکی بکاتەوە، بیخاتە ئاستی تێڕامان، لەسەر زمانی کەسایەتییە لە دایکبووەکەی دەق بدوێت، پاشان بە بڕیاری شیعری هەڵوێستی خۆی لەبارەی سروشت و بوون و کۆمەڵگە و جوانی دەربڕێ، ڕووبەڕووبوونەوەی ناوەوەی شاعیر لە شێواز و ئاراستەدا، ئەو پێوەندییە بەهات و پڕ هاوارە هێما دەیگەیەنێ، فراوانکردنی جەنگی هەستە لە بەبیرهێنانەوەی یادگارییەکان و ئامادەکردنی یادگاری ڕابردووە لەدەستچووەکانی لە ئێستای بەرهەست و ئامادە بۆ هەموو جووڵەیەك.

لە قۆناغی سست و سڕ، دۆخگۆڕینی بۆ قۆناغی گەشە و جووڵەکردن.

لە قۆناغی لەدەستچوون و بیرچوونەوە، دۆخگۆڕینی بۆ قۆناغی دەستەبەرکردن و بیرهاتنەوە.

دۆخگۆڕین بەهاو بەخششی خودی هۆشمەندە، بەو پێوەرەی چرکە بە دەقکراوەکان خەملێوی خودی هۆشمەندن، لەم خەملێنەشدا گەشتی هەمیشەیی پاڵەوان ڕۆڵی کاریگەر دەگێڕێت بەرەو قووڵایی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، زۆر جاریش قووڵایی پێوەندییەکان قووڵاییەکی خنکێنەرە، یان ڕزگارکەرە.

من دۆخگۆڕین دەنووسم، لەبارەی دۆخگۆڕینەوە نانووسم.



## (٣٨)

هەر کار و کردەیەکی هونەری لە ڕوانین و جیهانبینیی خودی هۆشمەندەوە بکرێت ئاراستەکەی لە ئەزموون و ژیانی ڕۆشنبیریی نووسەری چالاکەوە ئاستی وەرگرتووە، هاوارێکی هێمن و بڕواهێنەر و قەناعەتپێکەر. بەبڕوا بەخۆبوونەوەش خۆی پێشکێش دەکات و دەڵێت: ئەمە شێواز و ئاراستە سەربەخۆیەکانی منە لە ئاراستەی زمان و مۆرکی شێواز و کار و کردەی چوونە ناو جەرگەی ژیان و خەون. دوای کارلێکردن و مانەوە، ژیان و خەون هەڵیداونەتەوە سەر ڕووبەری سپی کاغەز، دۆستایەتی، یان ململانێ لەنێوان دەق و خوێنەری قووڵبین و داهێنەر بەرپا بکەن. زمانی پاراوی نووسین جیاکارە لە زمانی ئاخاوتنی کۆمەڵگە، زمانی خەونیش جیاکارە لەگەڵ زمانی گفتوگۆی واقیعی بەئاگای ڕۆژانەدا.ئەگەرچی هەست بە گەرمیی هەناسەی واقیعی ڕۆژانەش دەکرێت لەناو خەون، لە هیچ داهێندراوێکی گەورەشدا نووسەر پێوەندی لەگەڵ واقیعدا کۆتایی پێ نەهێناوە.

لەناو هەموو مۆرکە هونەرییەکانی لە ڕوانین و جیهانبینیی خودی هۆشمەندەوە بە ئەنجام دەگەیەندرێن فەزاو ئاکارێکی هزری لەپشتییەوە نوێبەخشی و ڕەسەنایەتی دەپارێزێت، خاڵی دەستپێکردنیشی لە ڕوانین و جیهانبینییەوە ئاراستەکراوە، بەڵام با بە مۆرکی شێوازی بەتاڵ فریو نەخۆین، ڕێزی شێوازێك بگرین بزانێت خوێنەر بە چی ئاراستەیەك و بۆ کوێ دەبات. مۆرکی شێواز ئاراستەکانی ڕوونی زمان لە ڕوانین و جیهانبینینی و ئەزموونەوە وەرگیراو بێت، ڕێزگرتنە لە خوێنەر، بەهۆی ئەم ڕێزگرتنەش خوێنەری قووڵبین پێشینەیەکی دەست دەکەوێ، دەتوانێ ببێتە هاوڕاو نزیکی کەسایەتی ناو دەقەکە، یان نا.

ئالۆزکردنی ڕستەی شیعری بێ قووڵبینیی ڕوانین و جیهانبینی، تەنیا سەر لێشێواندنی شاعیری لەپشتەوە دەبیندرێ و چیتر نا، ئەوەی لە زەینەوە هەستی پێ دەکەی بینووسیت کەش و هەوایەك بەرهەم دێ، کە جێگای هەموومانی تێدا دەبێتەوە. ئاستداری و شیعرییەتی زمان، کە ڕابردووی ئەدەبی کوردی لێی بێبەش نییە، گەورەترین ئاستداری و شیعرییەتی زمان لە قۆناغی شیعری کلاسیکی ئەنجام دراون.

شیعر نە ئەرکە، نە ئامانجە، نە هۆیە، کارکردن و چالاکییە لەناو ئەوپەڕی زماندا بەهەموو دوورییەکانییەوە ئەوکاتەش زمان لە دەقدا دەگاتە لوتکە هارمۆنییەتی کۆمەڵێك وشە سەمفۆنیایەك پێك دەهێنن و هەستێك دەبەخشن، مرۆڤ دەگەیەنێتە دوایین پلەی مەستی و تەسەوف و فەنتازیای نووسین. گەردوون هێزێکی نادیاری هەڵگرتووە، لە کاتی خەونبینین و سروشدا دەیدات بە شاعیری نوێبەخش.

من فەنتازیا دەنووسم، لەبارەی فەنتازیاوە نانووسم.

**(٣٩)**

نووسەر بەدرێژی و ستوونی و ئاسۆیی و بازنەیی، گفتوگۆی لە دڵەوەی لەگەڵ ژیان بەمانا گشتگیرییەکەی بەردەوامە. مەرگیش وەك دەرخستنی جوانکاریی دەق لەو شێوازەی، کە دەینووسێ تەماشا دەکات. کەواتە نووسین پێویستییەکی زەینی و جووڵانەوەی چالاك و ئومێدە. کە دەنووسیت هەست بە ئومێد و بەرگری دەکەیت. ئەو هێزە لە گیانتدا دەگەڕێ و ئاماژەپێکردن و پشتیوانە بۆ زاڵبوون بەسەر ململانێدا. وەك بوونێك



تێکەڵ بە چرکەکانی بیرکردنەوەت دەبێتەوە. چرکەی ئەو بیرکردنەوانەی هەستت کردووە، گفتوگۆت لەگەڵ ژیان بەمانا گشتگیرییەکەی بەردەوامە. چییەتی نووسین و دەسەڵاتی وشە دواندن و گفتوگۆیە لەگەڵ ژیاندا.

نووسەری ئاگردز نیمچە خواوەندێکی پڕ نادیارییە لە شێوازی گونجاوی دەقەکانیدا. ژیان بە مانا گشتگیرییەکەی بەرهەم دەهێنێتەوە. پێویستییە جوانییەکانی بەلێزیادبوونی خەیاڵپەروەری نواندووە، کە واقیع بە شێواز ئاراستەو کەش و هەواو ڕێکخستنێکی دیکە نواندویەتی.

لە هەمان ئاست و ئاسۆکاندا واقیع بە ئاستداری دەبینێت. بە لێزیادبوونی واقیعی گیانی و هێزی فەنتازی بەسەر ڕستە نووسراوەکاندا، کە لەپانتایی کاغەزی نووسراودا دەبن بە واقیع و جیهانی نووسین دادەمەزرێنێت.

مانا و فەزای ئەو نووسینەی، کە لەسەر پانتایی کاغەز دەبێتە واقیع پێویستە لە ڕێگای ئاسۆکانی زمانەوە ئاست و ئاراستەکانی بدۆزرێتەوە، نووسین، کە داخوازییەکی شیاوە تەنیا ڕۆشنایی و درەوشانەوەکانی زمان وەك جووڵە و بزاوت تێیدا دەسەڵاتە. کەسایەتی دوور و نزیکی ئەفسانەش دەبێتە گیانمایە و تانوپۆی لە کامڵترین شێوازی ساکاریدا.

داهێنەر پێویستە ڕووبەڕووی سیستمی دیکتاتۆری سیاسی ببێتەوە و بە توندی دژایەتی بکات. مەرجیش نییە بەرانبەر دەسەڵاتی وڵاتەکەی، تەنانەت ئەو وڵاتەی کە میللەت دەسەڵاتەکەی هەڵبژاردووە و پێی ڕازییە، مولتەزیم بێت. بگرە پێویستە لەپێناو شیعرییەت و دامەزراندنی جیهانی نووسینی خۆی، کە ئومێد و بەرگرییە مولتەزیم بێت، کە گەوهەری

داهێنانیشی خستە ناو کتێبخانەی نەتەوەکەیەوە دەبێتە مەزنترین هێمای درەوشاوە و مولتەزیمترین کەسایەتی وڵاتەکەی.

داهێنان یانی ڕەسەنی و شارستانییەت و هەمیشەبیترین ئیلتیزام و نوێنەرایەتی. ئەوانەی بە داهێنانەوە مولتەزیم نین، زیاتر کارمەندی ڕۆشنبیری و هۆکارێکی یارمەتیدەرن. بەرپرسیارییەتی شاعیری ڕاستەقینە ئەوەیە، شیعری بێگەرد بگەیەنێتە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی.

ڕۆشنبیری کوردی زیاتر ڕۆشنبیرییەکی شیعرییە. تەنیا شیعریشی ڕۆشنبیرییەکی بە ئەزموونە و خاوەنی شوێنی ناوەندە.

قۆناغی شیعری کلاسیکی تا ئێستاش تاقانەی ڕۆشنبیری کوردییە.

چەقی نەبیندراوی دەقی پڕ شیعرییەت هەم دەتوانێت جیهانی خود و خەیاڵ و خەون و منداڵییەتی شاعیر بنوێنێت. هەم پەیوەست بەواقیعی کراوەش بێت، چونکە خود و خەیاڵ و خەون و منداڵییەتی بەشێك لە سەرچاوەیان واقیعە. واقیعی قووڵ بەمانا گشتگیرییەکەی. پێچەوانەی واقیعی ڕووکەش و ڕووتی سڕ. واتە ناتوانێت لە سەرچاوە هەڵبێت. کەواتە واقیعی قووڵ ناوەندێکی فراوانە بۆ دەربڕینکردن لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە دەمامکە ئایدیۆلۆژییەکان دابماڵدرێن. نیازەکانی سیاسەت و مێژوو وەك تاکتیك و تۆمار لە جەستەی شیعری پەتی فڕێ بدرێنە دەرەوە، بەڵام ماك و بیری سیاسی و هێمای مێژوویی ئەگەر لە جەستەی شیعردا ڕوون خۆی بنوێنێ، خەون بۆ هەمیشە ڕابەرایەتی بکات. چالاکی شاعیرە لەو



پەرستگایەدا خەڵوەتکێش بێت، کە وێرد و سرووتی جوانی و خەون دەستەڵاتیەتی.

لە شیعردا خۆم دەکەم بە واقیع و سەرلەنوێ پێکیدەهێنمەوە. واتە واقیعی ناو نووسین، یان ئەو واقیعەی نووسین پێشنیازی دەکات، پەیڕەوکردنی چۆنیەتی واقیع لەم بارەدا دەناسرێت، یان پێناسە دەکرێت بۆ ناسین.

پێویستە ئەوە بە هەقیقەت بزانین، شیعر گیانی ئێشکگری هەموو نووسینەکانی دیکەیە. ڕەگەز و جەستەیەکی سەربەخۆیی گرینگە لە پێکهاتەی ئەدەبی نووسراودا. کتێبی پیرۆزی پێغەمبەران هەموویان شێوازی شیعر و شیعرییەتیان تێدا لێوانلێوە. تەنانەت بۆ بڵاوکردنەوە و قەناعەت پێکردن و جۆری قسەکردن و تێگەیشتنیان لەگەڵ کۆمەڵگەدا، فەنتازیا و شیعرییەتی وەك هێزێکی قەناعەت پێکردن تێدا بەکار براوە.

بەم تێگەیشتنە شیعر فەنتازیای نووسینەکانی دیکەیە، کەچی بەدەستی چەند ئاگر لێ هەڵبزرکاوێك خەریکە دەبێتە هونەرێکی مردوو. ئەو ئاگر لێ هەڵبزرکاوانە هەوڵ دەدەن دەقی نوێبەخش بنووسن. نوێبەخشی بنیادی بەشێکی بچووکی دەقەکەیە. لەپڕ هەست دەکەیت بنیادەکە لە بنیادی نوێبەخشی بۆ بنیادی واقیعی ڕووکەش و بەستووی سڕ و شڵەژاو دەگۆڕدرێت و بنیادە نوێبەخشییەکە بە ناکاملی جێ دەمێنێ و تەواو ناکرێت. ئەم تەواو نەکردنە ڕەگەزی کتوپڕی نییە، بگرە ونبوونی ڕوانین و جیهانبینیی شاعیرە، ئەگەر شاعیر جیهانبینیی بەهێز و خەیاڵی گەرم پاڵنەری گیانی بێت، دەتوانێت کەسایەتی دەقەکەی وا ڕابهێنێ

قسەکانی واقیع لە خەون بکات. بنیادەکەشی وەك بنیادی بەهێز و پتەوی خەونی ڕابگرێت.

ڕۆشنبیریی کوردی زیاتر ڕۆشنبیرییەکی شیعرییە، تەنیا شیعریشی ڕۆشنبیرییەکی بەئەزموونە و خاوەنی شوێنی ناوەندە.

قۆناغی شیعری کلاسیکی تائێستاش تاقانەی ڕۆشنبیریی کوردییە.

من دامەزراندن دەنووسم، لەبارەی دامەزراندنەوە نانووسم.

**(٤٠)**

جیهان لە ڕوانین و جیهانبینینی داهێنەردا هەمیشە ناتەواوە، ناوەندی بیرکردنەوەی داهێنەر، خەونی ئەم ناتەواوییەیە دەبیینێت. خەونەکە دەکاتە سەرچاوەیەکی پاراو و ڕووبەر و پانتایی تەواوکەری ئایندە، کە دڵنیاشە بە هیچ جۆرێك ناگات بە ئایندە. ئەم نەگەیشتنە هۆ و یارمەتیدەرە بۆ بینینی خەون و بەردەوامی بەرهەمهێنانی دەقی خەونی. تەنیا لە خەونیشدا دەتوانێت دەسەڵاتی سیستمی دیکتاتۆری سیاسی تێکبشکێنێ و پێوەندییە پەرتبووەکان بەشێوازێکی ئێستێتیکی دروست بکاتەوە، ژیان بەمانا زیندووەکانییەوە وەك پرتەقاڵێکی بەدارەوەی بەباران شۆراوە ببینێ. ئازادی تەواو و گیانی یاخیبوون و دووربینین و بیستن و ئاماژەی لەناو خەوندا ئێجگار بەهێزە و ڕووداوەکان ئاراستە دەکات.

ساتی نووسینەوەی ڕووداوەکانی خەون. پرۆژەی بەردەوامییە لەنێوان دووریی بیر و هەست، بە یارمەتی خەونبینین و ئەزموونی ڕەسەنی خودی



هۆشمەند. خەون و زمان لە شیعردا دوو دیاردە و ڕەگەزی بنچینەیین. من لە ڕێگای زمانەوە بیر دەکەمەوە. هەر لە ڕێگای زمانەوەش شیعر دەنووسم، دەشمەوێ هەموو ژیان بەهۆی خەونبینین بکەم بە شیعر و شیعرییەتی پێ بدەم. دەقی شیعری لە پانتایی زمان کار دەکات، نەك لە پانتایی بابەتدا، کەچی لە شیعری کوردیدا ڕابردوو وەك کەلەپوورێکی تۆمارکراو ملۆزمە و هەمیشە لەناو دەقەکاندا بابەتە. ئێستاش بە ملۆزمی ڕابردوو ترسێندراوە. شاعیرەکان لە ساتی نووسینی دەقدا بوێرنین، نەوێراون، یان نەیانتوانیوە ڕابردوو وەك بوونێکی کارپێکراو بهێننە ناو ئاخاوتن. بەتەنیا لایەن و بەشە گەش و درەوشاوەکەیان پێشکێش کردووە بۆ ئەوەی ڕابردوو وەك ژیانی کۆمەڵگەی کوردی بێتە پێشەوە، پێویستە وەك گشتێکی سەربەخۆ بپێورێ و قەوارەی بۆ دابندرێ، تا لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و ئابووری و بوونی شارستانی و بنیادی شێواز پەرەی پێ بدرێت.

ئاخاوتنی ئێستا کراوەیە، دەچێتە ناو ئاخاوتنی نادیاری ئایندەوە. دەقی خەونی ڕزگارمان دەکات لە ئیشکردن لەناو مێژوو و واقیعی دەسەڵاتدار و تۆقێنەردا، یان تووشبوونی هەڵەی مێژوویی، لە پەراوێزی مێژوو دێتە دەرەوە، دەچێتە ناو خەون، کە هەقیقەتی زمان و نووسینە، کەچی لەوەش دڵنیانین دیوانی شیعری کوردی دەقی خەونی تێدایە، یان نا.

لە دەقی خەونیدا هەقیقەتی ژیان و کەسایەتی نووسەر ئامادە و ئارام و زاڵە. دەقی ئاسایی ڕێسا و زانستی ناو کتێبەکان دەتوانێت هەڵیسەنگێنێت، بەڵام دەقی خەونی بەتەنیا ناخ و قووڵایی گیان هەڵیدەسەنگێنێ. خوێنەر بۆ خوێندنەوەی هەر دەقێکی ئەدەبی

چوارچێوەیەکی زەینی هەیە. ئەم چوارچێوەیەشی بەپێی باری دەروونی بەردەوام لە فراوانبوون و بچووکبوونەوەدایە.

ساتی نووسینەوەی ڕووداوەکانی خەون چالاکییەکی زمانەوانی و وشیارییەکی ڕەسەن و ڕوونبوونەوەی ڕوانین و جیهانبینییە لەناو ڕووداوەکانی کولتوور و کۆمەڵگە و خەونبینیندا. لە ئاستێکی گشتگیری سەیری ساتی نووسینەوەی ڕووداوەکانی خەون بکەیت، سەیرکردنێکی دامەزرێنەرە. تا نووسراوە بەرهەمهاتووەکە بچێتە ناو کۆمەڵگەو شوێن نیشانە وەربگرێت، وەك ڕووداوێکی بە ئەنجام لە ناوەوەی ڕووداوی کۆمەڵگەدا کاریگەری و جووڵانەوەی ئاشکرا بەدەستەوە بدات. بچێتە ناو بیرو بیرکردنەوەی ڕۆشنبیری کۆمەڵگەی کوردی و ئاسۆی هاوچەرخی و ڕەسەنایەتی بەسەردا بکرێتەوە، کە ئاسۆی هاوچەرخی و ڕەسەنایەتی بەسەردا کرایەوە بەهای ڕاستەقینە وەردەگرێت. لە چێژی میللی دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە ناوەوەی ئەدەب، ناوەوەی ئەدەبیش چێژی دەستەبژێری کۆمەڵگەیە.

هەر ئەدەبێکی نووسراویش نەیتوانی بچێتە ناوەوەی دەستەبژێری کۆمەڵگەوە، پێویستە گومان لە زەمینە و مەبەست و ئاست و ئاراستەکانی بکرێت. ڕەگەزی سەرەکی لەناو ڕۆشنبیری و کولتووری کوردی هەبووە، کەچی نەتوانراوە بۆ ساتی نووسینەوەی ڕووداوەکانی خەون کاری پێ بکرێت، بەسوود وەرگرتن، خەونبینین بهێنێتە پێشەوە. نموونە: خۆدواندن و دواندن و گەڕانەوەی ڕابردوو لە ڕێگای بیرهاتنەوەی کتوپڕو هونەری پەخشانەشیعر، ئەم ڕەگەزانە لە حەیران و لاوك و بەیتە



خۆماڵییەکاندا بەزەقییەوە دێنە ناو زەینمانەوە، کەچی لە نووسینی شیعری کوردی، ئەم ڕەگەزانەمان لە ڕۆشنبیری و کولتووری بێگانەوە وەرگرتووە. نەماتوانیوە بگەڕێینەوە بۆ ماك و ڕەگی ڕۆشنبیری و کولتووری خۆماڵیمان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانە بنچینەن، دەبووایە لەوانەوە بکەوتبووینایە ڕێ و هەنگاو هەڵگری خۆمانبین.

وڕێنەکردن بەناوی نووسینەوە لەناو ئەدەبی کوردی دەرکەوتووە، لەهەمان کاتیشدا گومانی لێ دەکرێت، چونکە بەپێوەرو ڕێسا و بنەمای ناو کتێبان بەڕێوە دەچێت. بەتاڵە لە سەرچاوەی کوردی و ئاسۆ و ئاستداریی زمان.

بەم جۆرە کارکردن ڕوخساری نووسینی کوردی ڕاستەقینەی لەکەدار و ئاوڵاوی کردووە، ئاسانە لاساییکردنەوەی بلیمەتانی بێگانە، ئاخۆ چەند لە گەورەیی ئەوان بەر منی کورد دەکەوێت. خۆ بوونی منی کورد لەم شێوازە نووسینە لە چیدایە.

ڕەنگە ئێمە لەبیناسازی و دیمەنی شەقام و باخچە گشتییەکان نوێ ببینەوە، بەڵام لە گیان و خەونبینین نوێ نابینەوە، چونکە لە گیان گەمارۆی ئایینمان لەسەرە. تەنیا لە ئایینیشدا بینین جێگیرو نەگۆڕە و کلێشە بەندی وەرگرتووە.

دەقی خەونی لە کۆمەڵێك هێما و هێماپێکراوی زمان و ڕوانین و جیهانبینین پێکهاتووە، هەمیشە گیان لە پلەیەکی ئەفسوون و جادوییدا یارمەتیدەریەتی بۆ چرکەساتی نووسین و چوونە ناو گیانی مانا زیندووەکان، لە ئازادکردنی

شێواز و مۆرکە زمانییەکاندا. هەم لە وێنە و هەم لە ماناشدا پشت بە ڕەگەزی کتوپڕی و جیاکاری دەبەستم.

دەقی خەونی لەبنیادی گشتیی ڕستەکانیدا سنوور دەبەزێنێ، دەستکەوتێکە بەهۆی لێکدانی پیت و دروستبوونی وشە و ڕستە، بارەکان دەکرێنە هەست و دەخرێنە ڕوو. ئەو پرسیارەمان ڕووبەڕوو دەکەنەوە نهێنی و ئەفسوونی مرۆڤبوونمان چییە.

بارەکانی دەقی خەونی هاوسەنگییەك لەنێوان هێما و هێماپێکراو دروست دەکات، ئەم دروستبوونەش کاکڵەی ئەزموون و سەرچاوەی کارو کردەی دامەزراندنی دەقی خەونییە لە دەستنیشانکردنی جۆرو ئاستی ئەو پێوەندییەی نێوان هێما و هێماپێکراو.

دەقی ئاسایی لەسەر ئەم ڕێسایە دامەزراوە: نووسەر، دەق، خوێنەر، کات، شوێن. ئەمانە ئاماژەن بۆ سنووربەندکردن و یەك دووریی زمانی دەق، زمانی دەقی سنووربەندکراویش ناتوانێت هەموو هەست و خۆزگە و چالاکییەکانی مرۆڤ لەخۆ بگرێت، یان لەخۆی نزیك بکاتەوە، کە بوونی مرۆڤ پرسیارێکی کاریگەرە لە ناوکی بوون دەکرێت.

من زمان دەنووسم، لەبارەی زمانەوە نانووسم

ئاداری ١٩٩٨ هەولێر



## شیعر بۆ چێژ و جوانی، چێژ و جوانی بۆ هەموومان

## مانیفێستی شیعری

لەنێوان بوون و هەقیقەتدا بیری مرۆڤی بەرهەمهێنەر بار و بوار و ئاراستەی خۆبوونی وەردەگرێت، لەناو دوو کەوانەی هەمیشە ئامادەی سەرسامبوون بەرەو ئامانجی تایبەت دەڕوا و خۆی لەناو چڕکردنەوەی کات و شوێن و بێگەردکردنەوەدا دەستنیشان دەکات. خودی پاراو و بێگەرد و گەشاوەی دابەشی سەر هەموو جوانییەکان دەبێت و ختووکەی ڕسکانیان دەدات. جوانی گشتێکە پارچە پارچە ناکرێت، هەموومان پێویستمان پێیەتی و ئاسوودەیی هەمیشەییمانە. بەرهەمهێنی جوانبەخش هەست و سۆز و خەون و بیر لە ڕێگای وشە و وێنەوە دەگەیەنێ و بیڕای بیڕیش ئامادە نییە خۆی لەپاڵ دەسەڵات و گرووپی هەڵەشە و خۆبژێین و دیکتاتۆر ڕابگەیەنی و ڕستەکانی بکاتەوە.

سروشتی کەسایەتی و گیانی پڕە لە بەدوادا گەڕان بۆ داهێنان و بەگەرمی دادەگیرسێ. شوێنی مرۆڤ لە ژیان دەدۆزێتەوە و دەستنیشانی دەکات، بۆچوون و بیروڕای کەسی باش بیرکەرەوە لە لێك حاڵیبوون و خەیاڵی جووڵێنەری دەق دەچێنێت و دید و دیدگا و شێوازی، فۆرمی فرە پێوەندی وەردەگرێت.

نهێنییەکان بیرکردنەوە دروست دەکەن. هیچ شتێك بۆ ئەو مرۆڤەی لە ڕێگای بەرهەمهێنانەوە بیر دەکاتەوە و خۆی بە تیشکۆی جوانبەخشییەوە خەریك دەکات، مەحاڵ نییە، ئەو بەرهەمەی دەیخوڵقێنێت گەردوون و هەموو شتەکانی لێ دەکەوێتەوە. لەناو ئەو گەردوونەدا هەمیشە شتەکان لەپێناو ئامادەکردنی بوون و هەقیقەتدا بۆ مرۆڤ دەبن بە سێبەر و هەتاوی فریا و یارمەتیی یەکتری دەدەن بۆ پێکهێنانی شتەکان. هاوسەنگی پێداویستییەکانی ژیان لەوەوە ڕادەگیرێت.

گەردوون بۆ پێکهێنانی شتەکان، بۆ گشت مرۆڤ و کۆمەڵگەیەك ناوەندێکی هاوبەشی هەیە. لە بەکەڵکترین شێوەدا بیری پێ دەکاتەوە و دەیڕسکێنێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و جیاکاری خوڵقاندن و بەخششی کولتووری گشتی و کەسی. ڕۆژگار، ڕۆژگاری داهاتوو نییە، بگرە دەچێتە تێکڕای سەردەم و کات و هاودەقی پێك دەهێنێت، شتەکانیش دەکات بە ئاماژە لە هەستیاری بیری مرۆڤی بەرهەمهێن، بەرانبەر پرسیارە گرینگ و کاریگەرەکانی بوون و هەقیقەت ئاگادارمان دەکاتەوە. دەشبێت بەو بڕوایەمان بگەیەنێت ئەو پرسیارانەی کارلێك لەگەڵ ئەفسانە و داستان و بەیت و مێژوو و ئەوانی دیکەدا دەکەن لە کوێوە سەرچاوەیان گرتووە، کەموکوڕییەکان لە چیدا ئاشکرا دەبن، پەیدا بوونەکانیش چین.

بوون و دۆزینەوەی سەرەتای شتەکان پێوەری مرۆڤ و کۆمەڵگە و هەموو شتەکانە نەك هەقیقەت. جیاکارییەکانی نێوان بوون و هەقیقەت پێویستە بەردەوام بە کاریگەرییەکی زۆرەوە گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت و کاریگەریی خۆی بسەپێنێ. هەوڵەکانیش بێ ئومێد نەبن. هەقیقەت بینینە، بوون



بیرکردنەوەیە لە بینین و ئەفسوونی ژیان. دۆزینەوەی سەرەتای شتەکان بنەمای ژیانی بە بەرهەم و ئارەزوویەکی بەردەوامە بۆ بەرهەمهێنانی نوێبەخشی و جوانبەخشی. هەنگاوی یەکەم لەم دۆزینەوەیەوە دەبێتە ئەزموونێکی خاوەن کارکردن لەسەر مۆتیڤە هونەرییەکان و ماناداریان دەکات، هەروەها ختووکە و چەشەی ئەوی دیکە دەدات بۆ جیاکاری خوڵقاندن.

ئازادکردنی نووسین، جووڵەیەکی هەمیشەییە، کە بیرکردنەوە پەیدای کردووە. زۆر وێستگە هەن جوانبەخش تێیدا هەڵوەستە دەکات و دەوەستێت و دەکەوێتە باری لێوردبوونەوە و تێڕامانی کارا و دووروودرێژ و قووڵبین، بەڵام هەر یەك وێستگەیان وورووژێنەر و دیاریکراوە، دەتوانین قسەی لەبارەوە بکەین. هیچ شتێك لەم بوونەدا نوێ نییە تا مرۆڤیش دۆنایدۆنی گیانێکی بەر لە خۆیەتی. ژیان منی دووبارە کردووەتەوە و دەبێت قسەی ئەم دووبارە کردنەوەیەی خۆمم هەبێت و بیکەم، بەڵام وەك خۆم و خۆم لەگەڵ خۆمدا، ئەم خۆم لەگەڵ خۆمدایە لەناو دووکەوانەی هەمیشە ئامادەی دۆخگۆڕین ئازادی تەواو دەڕەخسێنێت و کەرەستەکانی دەربڕینی خۆی دەناسێت. ئەم پێوەندییانەی هەستەکانی کەسی جوانبەخش لەگەڵ پانتاییی فۆرمی فرە پێوەندی و فرە بنیادی و فرە ترپە و ئاوازی دەق دروستی دەکات بانگهەڵدانی نوێبەخشی نییە، بگرە بەدیهێنانی نوێبەخشییە.

نوێبەخشی گەشەکردنێکی سەرتاپاگیرییە، لە ئەفسوونی کراوەی بوون و ژیانی مرۆڤ، بار و بوارێك دەکاتەوە بۆ شکاندنی گەمارۆی دواکەوتوویی کۆمەڵگە. ئەو کەرەستانەش دەناسێت، کە نوێکردنەوەی بیر و کۆمەڵگە هەڵدەسووڕێنێت، هەستی گۆڕانکاری کاریگەر دەهێنێتە ناو هەڵسوکەوتی

ڕۆژانەی ژیانمانەوە. ژیانێکیش نوێبەخشی بەرهەم بهێنێت سەر بە بیرێکی خولقێنەرە و بینینێکی تەواوە بۆ گەردوون و پێکهێنانی شتەکان. نوێبەخش هەمیشە هەوڵ دەدا ژیان لە بینینی ئەوانەی پێش خۆی ژیاوە دەستکاری بکات و بیروڕاکانی بۆ گۆڕان بخاتە گەڕ. جوانی لە چاوی کۆمەڵگە زیاد و بەپیت بکات و پاشخاپەرۆکی داهێنان بسڕێتەوە، یان لانی کەم بەلاوەی بنێت، هەروەها نەریتە خراپەکانی کۆمەڵگەش لابدا و جوانەکانی دووبارە زیندوو بکاتەوە.

زمان بە شیعر دەستی پێ کردووە و خۆی ناساندووە، بووەتە دیاردەیەکی تەندروستیی کۆمەلایەتی و نیشانەی ئادەمیزاد، ئەم نیشانە ئادەمیزادییە بەشێکی دەبێت لەبیر و بیرکردنەوەی منیشدا بڕسکێت و لێکدانەوەیەکم هەبێت بۆ ڕسکان و گواستنەوە و کارپێکردنی.

شارستانییەتی بوونیش لە ڕێگای هۆشێکەوە بۆ هۆشێکی دیکە بەردەوامی داهێنان بە دەست دەهێنێ. گۆڕانە یەك بە دوای یەکدا هاتووەکانی نێوان کەسایەتیی داهێنەر و کۆمەڵگە دەستنیشان دەکات.

بەبێ مەیل و ئالۆودەبوونی نەمری و بەرز فڕینێکی ئێجگار زۆر لە پێناویدا، مرۆڤ ناتوانێت دەربڕین و داهێنان لە جوانییەکانی ژیان بکات و بچێتە ناو بەردەوامییەوە. داهێنان خۆی وزەیەکی شاراوە و دەنگدانەوەی هەستییە، بوون دەدۆزێتەوە و ئاشکرای دەکات. دەچێتە ناو کرۆکی کارتێکەرە ڕۆشنبیری و کولتوورییەکان. لەبارەی شتێکەوە قسە دەکات، کە گەردوون و مان و لەناوچوونی تەواوی سەرزەمینە و دەبێتە ناوەند. وەك بنەڕەتێك، بۆ ئەو دامەزراوە ڕۆشنبیرییانەی بوون بەڕێوە دەبەن و لەسەری دادەمەزرێن، لە ڕێگای



جوانییەوە درێژە بە بەخشش دەدەن، وەك پێویستییە هەستییەکان دەڕۆن بەڕێوە و مەشق دەکەن، مەشقی بەردەوام بیر تیژ دەکات و لە ژیانی ڕۆژانەماندا پێویستمان پێی هەیە. ئاماژەی کارا و گرینگە بە دوایدا دەچین بۆ پێوانەکردنی پاشەڕۆژ، لە هەمان بار و بواریشدا بوێریی چوونە ناو و قسە لەبارەوەکردنی.

بەرهەمهێنی جوانبەخش، بینینی خەونی بۆ ژیان، هەستەکانی ڕازاندووەتەوە و ئارامییەکی تێدا بەدی دەهێنێت، کەشە دەروونی و پێشهاتەکان بە ئاستێکی هونەری و کاریگەرییەکی ئاشکرا دەگوازێتەوە بۆ واقیعی نووسین، کە برینی کاریگەری شەڕی خۆبەخۆ لە گەڕەکەکاندا دید و دیدگا و قووڵبینی مرۆڤی کوردیان شێواند و جوانی و توانا و بەهرەیان کوشت و پەیوەستبوون بە ژیاندۆستی و شەیداییبان تا ڕادەی لەناوبردن کز کرد.

بەرهەمهێنی جوانبەخش ناچار بوو بەرهەم وەك ئامراز و ئامانجی کاریگەر بۆ ژیاندنەوەی جوانی و توانا و بەهرە بەکاربهێنێت و چاکە بناسێت. لەگەڵ ئەمەش ئەو ڕۆژانەی من تێیدا ژیاوم و شیعرم نووسیوە زۆر ڕوون و ئاشکرا نەبووە. بووژێنەرەوەی جوانی و توانا و بەهرە لە خەونێکدا لە هێلکەی سەمەندەر ترووکا. خوداوەند بە هێزی بەخشندەیی بۆ ناوچەیەکی دیکەی ئاسمان بەرزی کردەوە تا فێری بلیمەتی و پەرجووی بەرزایی و گەیشتن بە بەهەشتی بکات. سەرەتاکانی هەستپێکردن بنووسێتەوە. شیعر بۆ چێژ و جوانی، چێژ و جوانی بۆ هەموومان، چێژ و جوانی ئەو ڕووداوەن لە کاتی خوێندنەوەدا ڕوو دەدەن و هەستی سستبوو

له مرۆڤدا چالاك دەكەنەوە. لەم كردەوە و كردەیەدا شیعری پاراو و بێگەرد دەدۆزێتەوە، شیعری بووژێنەرەوەی جوانی و توانا و بەهرە. هیچ بووژێنەرەوەیەكی جوانی و توانا و بەهرەش لێڵ و ناڕوون نانووسێت. زاڵە بەسەر ئاگاییی نووسین و ئامرازەكانی دەربڕین و كاكڵی مەبەست. وەرگر بانگهێشت دەكاتە سەر خوانی فرە بنیادی و فرە پێوەندی و فرە تریە و ئاوازی و فرە دەنگیی خۆی، بۆ وەرگرتن و چێژ و تێگەیشتنی هاوبەش.

(٢)

مرۆڤ یەكەمجار كە بەهرەی دەربڕینی تێدا ئاشكرا بوو، لە خانەی شیعردا جێی كردووەتەوە، بۆ مانەوەشی لەم خانە پیرۆزكراوەیدا هەمیشە قوربانی لە ئەژمار نەهاتووی داوە و هێڵە ئەفسوونییەكان و چالاكی درێژ كردووەتەوە. زمانیش وەك یەكەیەكی پڕ جووڵە بوونی خۆی ڕاگەیاندووە. گیانی لێوڕێژ لە شەپۆلدانی لە ئاراستەكراوە سڕكەرەكان ڕاپسكاندووە و پاراستویەتی، هێز و ئاماژەی خستووەتە وێستگە و سەكۆی داهێنانەكانی. پێوەندی نێوان مانا و شیعرییەتی لەناو فۆرمی فرە پێوەندی بەستووە و شكۆی داوە بە گوتن و زمان.

زمان كەرەستە و بەخششێكی خوداییە و دەسەڵاتی دەربڕین و هێزی گیانی دەدات بەخۆویستی و خولقاندنی شیعرییەت و مانا لەناو زمان و جوانیدا. زمان و جوانی ڕووبەرێكن خود و خەیاڵ خۆش دەكەن و بیریان تێدا دەكرێتەوە، ئاست و جیاكارییەكان دەردەكەون.



هێمای درەوشاوە زۆرن، كە توانا و بوێریی نەخێریان تێدایە، سەرگەردان و دەربەدەر بوونە و بوونەتە قوربانیی شیعری پاراو و بێگەرد. هەموو پەیامێكیان لە شیعرەوە بۆ شیعرییەت هێناوە. پەیامیش جگە لە شیعری پاراو و بێگەرد شتێكی دیكە نییە. دەیانەوێ لە ڕێگای ئەم پەیامهێنانەیاندا دەربڕین لە بارێكی دەگمەن، ئاوێتە بە جووڵە و وێنەی ناوازە و شایان بكەن.

تەنیا شیعری پاراو و بێگەرد، لە سەرچاوەی خود و خەیاڵەوە بنەچەی ڕاستەقینە و بەهای هونەری وەردەگرێت و بۆشی دەگەڕێتەوە، ئاماژەی یارییە مەحاڵەكان دەدات. تانوپۆی فۆرمی فرە پێوەندی خۆی تۆكمە و پتەو پێك دەهێنێت. هەموو بوون دەخاتە ناو پرسیاری خود و خەیاڵەوە، تەنیا خود و خەیاڵیش هونەری پاراو و بێگەرد دەخوڵقێنن و بڕوا بە گفتوگۆی هەستیاری دەهێنن.

كێشەی نێوان شاعیر و ڕەها هەڵبژاردنی پەرگیرییە و شیعر دەكات بە پاراو و بێگەرد. هەموو پەلەكانی دیكەی ئەدەب: پەخشان، شانۆگەری، چیرۆك، ڕۆمان،... تاد. تەواو ژێری دەیانجووڵێنێت و بزووتنەوەیەكی ووریاكردنەوەی جەماوەرین. لە ڕێگای ئەم جووڵانەشیدا جۆرێك تێكەڵی دێتە ناوەوە. هێزی دەستی، هاوسەنگی تێك دەچێت و ڕەهایی و پاراوی لە ناخ و بیركردنەوەیدا دەبێتە پاشخاپەرۆكێكی بێزراو. جومگەكانی پێوەندی لەگەڵ سەرگەردان و دەربەدەر و قوربانییەكانی شیعری پاراو و بێگەرد لەبەریەكدا هەڵدەوەشێنێتەوە و دەچێتە ناو پێزانینە بەئاگاكان و دەربڕینی فریودەر لە پێناو دەسەڵاتێكی دیاریكراودا، بینای كولتووری خۆی پێك دەهێنێ و گفتوگۆ

لەگەڵ کولتووری ئەوی دیکەدا دەکات. لە هەموو کارێکی ڕۆشنبیری گفتوگۆکردن لەگەڵ ئەوی دیکەدا لە سوودگەیاندن بەدەر نییە. تەنیا لە شیعردا زەرەرمەند و هەڵەبەرە. بەهۆی ئەم گفتوگۆیەی هێزی کەسێتی ون دەبێت، ونبوونێك، کە دۆزینەوەی دەبێتە جۆرێك لە مەحاڵ.

جوانی شێوازێکە بۆ بیرکردنەوە. هەیە لە کەش و هەوا هەستییەکانیدا جوان بیر دەکاتەوە، کەچی لە هەنگاوێکی نزیکدا ئامادە دەبێت بچێتە ناو خۆ هەڵبژاردنی لیستێك، کە حزبێك بۆ بەرژەوەندی و کارپێکردنی خۆی ئامادەی کردووە و پڕوپاگەندەیەکی بێ ژمارەیشی لە پەنادا کردووە بە قەڵای هەڵخەڵەتاندن و دابەشی سەر ئەڵقەلەگوێ و گوێڕایەڵ و بەرفەرمانەکانی خۆی دەکات. هەرکەسێك پێودانگێك بۆ کەسایەتیی خۆی دانەنێت، گەورەیی نەخێر، لە دەست بدا و ملکەچ و ئامادەی بەڵێ، بێت بۆ هەمیشەیی بەختیاریی گیانی دۆڕاندووە. ملکەچکردن بۆ دەسەڵات، ژیان و شێوازی بیرکردنەوەت دەکەن بە ڕۆتین و نووسینەکانت نابن بە سەرچاوەی پاراو و بێگەردی هونەر.

شیعر بۆ چێژ و جوانی، چێژ و جوانی بۆ هەموومان، چێژ و جوانی ئەو ڕووداوەن لە کاتی خوێندنەوەدا ڕوو دەدەن و هەستی سست بوو لە مرۆڤدا چالاك دەکەنەوە. شیعری پاراو و بێگەرد ئەی بەختیاریی بەهرەوەرانی سەر زەمین. مێژووی خۆ دروستکردن لە خاڵێکدا کورت دەکرێتەوە و دەبێتە تیشکۆ، بوێری ئەوە بکات بڵێت نەخێر، نەخێر، پرۆژەیەکە بۆ جوان بیرکردنەوە. جوان بیرکەرەوە جووڵەی سروشت هاوتا دەکات بە جووڵەی



ئازادیی مێشك و هۆشمەندی. بیرکردنەوەش وەك پرۆژەیەك لە پێناو خۆدۆزینەوە و خۆبوونی و ڕووبەڕووبوونەوە بەرانبەر دەسەڵات.

ئەو کەسایەتییە تێکەڵە لە بڕیاری ناوەوەیدا، پێوەندییەکانی هونەری نووسین و جوانی و ڕەهای ڕاگرتووە، کە شیعری پاراو و بێگەردە. لە دەرەوەش لەناو تاکتیك و زانیاریدان بە حزب و ئەڵقەلەگوێ و گوێڕایەڵی و بەرفەرمانی دەسەڵاتدایە، کە هەموو دەسەڵاتێك بەشێك لە دیکتاتۆریەتی بە جووڵە و وێنەوە لەناو خۆیدا پەروەردە کردووە.

شیعری پاراو و بێگەرد ئەی پاکیزەی دووەم، لەگەڵ یەکەم هەست بە ئارامیکردنی دەروونی بەرانبەر دیمەنی جوانی دەستت پێ کردووە، بە وەشاندنی گورزێك ئاگری بێ ئامان کۆتاییەکان دەستنیشان دەکرێن، کە لەسەر زەوییەکی گڕکاناوی ڕامان گرە و هەموومان بە سووتان و توانەوە و لێك جیاکردنەوەی ئێسك و گۆشت جەزرەبە بدە. تەنیا ئەو سەمەندەرانە بەردەوامی وەردەگرنەوە، کە پەڕگیریی شیعرییان هەڵبژاردووە و پێشەنگی تێدا بە دەست دەهێنن. لەم گۆشە زۆر هەستیارەدا شێواندن دادەڕێژنەوە و دەیکەن بە بوونی جوان و یادەوەریی داهاتوو.

بەهرەوەر ئەگەر تۆ خەونی داهاتووت لە دەستدا بێت بۆچی دەژیت، چۆن بوون و خۆبوونیت دیاری دەکەیت. پێویستە سەرەکیترین پرسیار دروستکردن لە بیرکردنەوەماندا ئەوە بێت من چ جۆرە بەهرەوەرێکم. ئەڵقەلەگوێ و گوێڕایەڵ و بەرفەرمان، یان کەلکێش و ئازاد و دڵکەش. پێکهاتەی زەمین چۆنە، شکۆ بەرهەمی کامە قوربانییە. بۆ ئەوەی

سییەکان لە ڕزیبوون بپارێزین پێویستمان بە چ جۆرە هەوا وەرگرتنێکە. پێمان لەناو خۆڵی نەرمونیان، یان خۆڵەمێشی فریودەر پشوو پێ بدەین.

شیعری پاراو و بێگەرد ئەی پاکیزەی دووەم، ئەی تەنیا دایکی شاعیرە کەلکێش و ئازاد و دڵکەشەکان.

## (٣)

بەرهەمهێنەرانی شیعری پاراو و بێگەرد لە پێناو چێژی نادیار گیانیان وەك دیاریکردنی ناوەندێك لەناو کردەوە و کردەی نووسین و هونەری جوانبەخش و باڵا پیشان داوە. هیچ کامێکیشیان شیعریان تایبەت نەکردووە بۆ ڕووبەر و ڕواڵەتی واقیع، بیرکردنەوەی داخراویان وەك پێودانگێك بۆ پێوەندیی زەینی و بوونی شتەکان بەکار نەهێناوە. لەسەر بنەڕەتیی بەهرە و جوانبەخشی جووڵاون و تێگەیشتن و تاسەیان بۆ جوانبەخشی کار پێ کردووە، ئاسۆی توانای تەنیایی، کە داهێنەر هەمیشە توانایەکی تەنیایە. بەسەر دیاریکردنی ناوەندی گیانیان کردووەتەوە، لەو ڕەگە دووروودرێژەی شیعر، لە بەردەوامی و گۆڕان بۆ خۆی ئەزموونی کردووە و لە خولیاماندا دەسووڕێتەوە، هیچ کاتێك نەبووەتە بنەما و بنچینەیەك یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت و پرۆگرام و پلانی ساڵانەی دامودەزگایەکی لەسەر دابمەزرێندرێت، بگرە بمانەوێت نەزانراوێك بزانین و لە کولتووری ناسراوی زانستەکان بە هەموو بەشەکانییەوە نزیك دەبینەوە، سەرقاڵی سوود لێ بینین و پەیڕەوکردنی دەبین.



شیعر بۆ دۆخی دەروونی و وروژاندنی گیانی لەنێوان مەوداکاندا دێت و دەچێت، دۆخی دەروونیش بەشێکە لە وزە زیندووەکانی زانیاری، چونکە بینین دەگۆڕێ، بەڵام جیهان ناگۆڕێت، بگرە جیهان بۆ شێوە هەڵسووڕانێکی شیاو و چەشەی جوانیویستی و جواننواندن و جوانبەخشی ئامادە دەکات. تەنیا دوو شت دەتوانن جیهان بە بارێکدا بگۆڕن. ئەویش ئایین و سیاسەتن، ئایین و سیاسەتیش کاری کۆیە، تاکیش لەناو کۆدا بزر دەبێت و نامۆیی لە پێوەندییەکاندا دروست دەبێ.

لێرەدا پرسیارێك، کە کاری شاعیری نوێبەخش و جوانبەخش داهێنانی پرسیارە، دەبێتە بار و بوار بەهۆیەوە دەتوانین لەنێوان مەوداکاندا بێین و بچین و چالاکیی بیرکردنەوەی ئەوڕۆییمان بە تاو و تینی جوانی دەربڕین. نوێبەخش، کە مامەڵەی جوانبەخشی لەگەڵ هەستەکانیدا دەکات، شیعرییەتی لەناو سروشت دەرهێنا و گواستییەوە ناو هەستەکانی مرۆڤ و لە ناوەڕۆکدا ڕسکاندی، ئەفسوونی خود و هێزی تاکی تاقی کردەوە، کە دەتوانێت گیان وەك ناوەندێك دیاری بکات. بە وردی لە سروشتی گیان و خەون وردبوومەتەوە و گیان و خەونیش بابەتی بنەڕەتی شیعری منن. شیعر بۆ چێژ و جوانی، چێژ و جوانی بۆ هەموومان، چێژ و جوانی ئەو ڕووداوەن لە کاتی خوێندنەوەدا ڕوو دەدەن و هەستی سستبوو لە مرۆڤدا چالاك دەکەنەوە.

کۆمەڵێك بەهای ئێستێتیکی هەن سروشت پشتگوێی خستوون. جوانبەخش جموجووڵی هێماکانی دەدۆزێتەوە و دەیانهێنێتە پانتایی نووسین و دەیانکات بە هونەری پاراو و بێگەرد و باڵا.

**داهێنەری پرسیار، ئاراستەی فۆرم لای پاڵنەری کردارییە و لێیەوە شوێن بۆ پەیژەکانی کارکردن دەستنیشان دەکات. کردەوە و کردەی بەردەوامبوون لە بیرکردنەوەیدا کەرەستەیەك نییە بۆ ناسینی جیهان، کەرەستەیەکە بۆ ناسینی خۆی و لەپاشانیشدا بۆ ناساندنی خۆی و شکۆدارکردنی جیهان بە داهێنانی پاراو و بێگەرد.**

**(٤)**

**شاعیرە نوێبەخش و جوانبەخشەکان بەرپرسن لە خولْقاندنی شیعر و ئامادەکردنی کۆمەڵگە بۆ جوانیویستی و جواننواندن و کارکردن و مانەوەی لەناو کردەوە و کردەی ئێستێتیکیدا، قۆناغی یەکەمی نوێبەخشیی شیعری کوردی هەندێك جووڵە و پانتاییی و ماکیان لە بیر و هونەری قۆناغی شیعری کلاسیکی کوردی وەرگرت و لە برەوپێدان و چارەنووسی داهێنان و دۆخگۆڕینی ناوازەدا فۆرمی جیاکارییان تێدا خولْقاند، قۆناغی دووەمی نوێبەخشیی شیعری کوردیش بەهەمان شێوە هەندێك جووڵە و پانتاییی و ماکیان لە بیر و هونەری قۆناغی یەکەمی نوێبەخشی شیعری کوردی وەرگرت و کاری بەرەو پێشەوە چوونیان لەسەر کرد، ئەنجام کۆمەڵێك کاری جوانیان لە زەمینەیەکی بە پیتدا دامەزراند، بەڵام قۆناغی سێیەمی نوێبەخشی شیعری کوردی، لە ئاماژەی هەریەك لەم قۆناغانەدا، مەبەستم شاعیرە نوێبەخش و جوانبەخشەکانە، نەك پاشخاپەرۆکە بێزراوەکان، هەوڵیان بۆ خولْقاندن و ئاشکراکردنی بیر و هونەری جیاکاری بوو، دلێرانە داکشانە ناو خود و پاراو و بێگەردیان کرد.**



**لەم پاراو و بێگەردییەدا زەمینەی لەباریان بۆ کێڵان ئامادە کرد و تۆوی بەهرە و ڕۆشنبیرییان لەناودا وەشاند و فۆرمی فرە پێوەندییان دامەزراند.**

**دەستەیەکی کارا لە ناوەند و بەهرەی دیاردە بزوێنەرەکانن. شیعریان بە ژیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە و نانی گیانیان لە دەستی میهرەبانییەوە خواردووە. هەژانێکی توند لە بیر و هونەری پێشوو ڕووی دا، کە لە دەقە نایابەکاندا خۆی نواندووە و زمان تێیاندا زۆر هەستیارە و زوو خۆی ئاشکرا ناکات و ماناکانی ڕاناگەیەنێ.**

**شیعری پاراو و بێگەرد لە کرۆکی خۆیدا مەسەلەیەکی بوونی و ژیانی دەروونییە، پێویستی بە هێنانەوەی هیچ پاساو و هۆ و بەهانەیەك نییە بۆ بوونی خۆی. کارکردن لە جیاکاریی بیر و هونەر، دەرکەوتن و شەوق و توانا و بەهرە بەکەسی بیرکەرەوە دەدەن و هێزی سووربوون لەسەر بنەمای جیاکارییەکان بنیاد دەنێن، کە جیاکاری سووربوون و بوونی کردەوە و کردەی نووسینە. لەم بنیادنانەدا تێگەیشتن و قبووڵکردنی وەرگر لەسەر جیاکارییەکان ڕادێن و جیاکارییەکان خانەی دیاردە و جووڵە و مانەوە و خۆبوونیی وەردەگرن.**

**گیانی نوێبەخش و جیاکارییەکان هەستەکانی لەناو شاکار و ژیانی دەروونی پەرە پێ دەدا و زیرەکانە شێواز لەناو شێوازدا دەگونجێنێت، شکۆی ناخی مرۆڤ بەجێ دەهێنێ و مانا ڕانەگەیەندراوەکان ڕووبەڕووی مانا ڕاگەیاندراوەکان دەکاتەوە. جیاکارییەکان بەپێی جیاکارییان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا ئاستدار دەبن. ماك و ئاسۆی هەستیاری و ئاست لە بیری زمان**

وەردەگرن و پڕشنگیش لە تیشکە بەهێزەکان. یەك ئاستیش بیر و هونەر لە پاشخاپەرۆکی بێزراو وەردەگرێت و گەشەدار نابێت.

من لە ئەزموونی خۆمدا زۆر شەونوێژ و کەلکێشیم بۆ شیعری پاراو و بێگەرد کردووە. ئەو کاتەش شەونوێژ و کەلکێشی لە شاعیر وەردەگیرێت، کە شیعر بە ژیان بکێشێت و وەك کێشەی مردن و ژیانی لێی بڕوانێ و کاری بۆ بکات.

مردن و ژیان پێکهێنەری بوونن، شیعریش، کە ڕەگەزێکی بوونییە دەبێت لەم ڕوانگەیەوە لە دڵەوە لێی بڕواندرێ و کاری بۆ بکرێت. نووسین لەوپەڕی شادی، یان ئەو پەڕی ناشادی بەرهەم نایەت. کاتی ئەفسووناوی خۆی پەیدا دەبێت، کە خورپەی شاراوەی ناخ دروستی دەکات. تەنیا ئەو خورپەیەی، کە دەچێتە ناو کردەوە و کردەی نووسینەوە ڕوونی دەکاتەوە و ئاماژەی حەسانەوەی گیانی دەداتێ.

سەرنجڕاکێشترین ئەزموونی جیاکاری لە ڕووبەڕووبوونەوە و هۆشمەندیی نووسیندا بەرجەستە دەکرێت، جیاکارییەکانی ئارەزوویەکی تەنك پەیدای نەکردووە بە ڕێگای ئەزموونەوە دەیگەیتێ، بڕوایەکی بەرزی تێدا بەدی دەکرێت و هێزە سەیر و سەمەرەکانی مرۆڤ دەخاتە گەڕ و مانایەك بۆ بوون لە گیان دەبووژێنێتەوە و ئەوینداری دەکات بە ژیان. چێژ بەردەوام لە مرۆڤی هەستداردا دەگۆڕێت. بە هیچ پێودانگێکیش ژیان دامەزراو و دەوڵەمەند نابێت بەو دیاردانەی لە پێناو خۆشگوزەرانیی مرۆڤ خۆیان پێشکێش دەکەن، بگرە بەردەوام کۆمەڵێك بۆشاییی پڕ جادوی لێ بەدەردەکەوێت. پێویستە مرۆڤی نوێبەخش و جوانبەخش بچێتە



ناویان و گەوهەرەکانیان بدۆزێتەوە و مشتومالیان بکات. ئەم دۆزینەوە و مشتومالکردنە چییەتی جیاکاریی مرۆڤ و کۆششی گیانی و جیهانبینییەتی.

بەرچاوییەك لە ئەزموونی جیاکاریدا، لە بەشی زۆری دەقەکانم دێرێك وەك ناوەند هاوبەش دەکەم لەنێوان دوو وێنەدا، هەم تەواوکەری وێنەی یەکەمە و هەم تەواوکەری وێنەی دووەم.

ئەم ڕووبەر و جووڵە و ڕووداوەش بۆ سەرسامی وەرگر بەکاردەهێنم، ئەگەر وەرگر بەتەواوی هێزی هۆشمەندییەوە ئەم ناوەند و هاوبەشییە لەگەڵ هەردوو وێنەدا وەرنەگرێت و جۆرە ڕێکخستنێك لە ئاگادارییەکانی ناو دەق پێك نەهێنێ هەردوو وێنەکەی بە لێڵی و ناتەواوی دێتە بەرچاو و زەین. یەك لە گیروگرفت و لێك حاڵی نەبوونی ئەدەبی جیاکار لەگەڵ وەرگردا ئەوەیە ئەم هونەرە وردانە هەست پێ ناکەن، یان خۆیانی لە ئاستدا نەبان دەکەن، یان توانایان نییە لە جیاکارییەکانی جوانبەخشی جیاکار تێ بگەن. بەوەشەوە لەوە دەترسن هەستەکانیان لەگەڵ ئەوی دیکەدا بەشداری پێ بکەن. جیاکار پێویستە لە هۆی بوونی خۆی بپرسێت، پرسیارێك وەك دۆخگۆڕین لە پنتی پێکهێنان و بنەمای کراوەدا ئیش بکات.

(٥)

ئەوەی لە نێوان من و شیعردا درێژ دەبێتەوە، خەونە نەك واقیع. لە کردەوە و کردەی نووسیندا خەون دەکەم بە واقیعی نووسین. بە ویست و داوا و هەستیارییەکی خەونی، بە یادگەی کۆمەڵگەدا چوومەتە خوارێ و

خانەیەکی سستبووم لە جەستەی شیعری کوردیدا تەواو زیندوو ڕاگرتووە، خانەی دەقی خەونی. خەون یەکێکە لە هێما هەستیارییەکانی مرۆڤ. لە سادەترین ئاستیدا خەسڵەتی کیمیاگەریی پەیدا دەکات، دەتوانێت توخمێك بۆ توخمێکی دیکە بگۆڕێت. پێکهاتە و دارشتن و ڕایەڵێکی تووند و تۆکمەی لێیەوە درێژ بکاتەوە. لە چالاکییەکی دیکەیدا بیکات بە دیمەنێکی بە شکۆ. هەوڵێکی خوداڕسکی بەهرەمەندە، پێوەندیی مرۆیی و گەردوونیی نزیك دەکاتەوە، پەلە بکەین بە دوای هەستیارییەکانی ئەم پێوەندییە لەناو ژیانی گەشاوەدا بگەڕێین. وێنەکانی بەرپرسیاریەتی بەرانبەر چارەنووسی چێژ و جوانی بەرز دەکاتەوە و خۆی دەناسێنێت و دەبێتە هێما بۆ مانا و مەبەست.

وەك گیان پشت بەخەون دەبەستم، خەون هێز و بڕوابوون بە وریایی هەست و خەیاڵی نادیار دەبەخشێ. دڵەڕاوکێیەکانی خەیاڵی نادیار بە خەڵکی دیار دەگەیەنێ، دەرەوە و ناوەوەی گیان بەیەکەوە بە ڕێگای تایبەتیی خۆیدا دەبات، کە ڕێگای جادووییە. خەون نوێبەخشیی زۆری داوە بە بەیتی کوردی و زمان تێیدا گەرموگوڕە. شێوە و ماکی بەیتم وەرگرتووە و بەشێوەیەکی جیا لە خۆی نواندوومەتەوە، بە ئاشکرا ئەم وەرگرتنە درەوشانەوەی لە بیر و بیرکردنەوەی مندا پەیدا کردووە و ڕسکاندوویەتی، بۆ ئەوەی بەسەر هەندێك دەربڕینندا زاڵبم، پێویستیم بەخۆڕاهێنان بووە لەسەر شێوە و ماکی بەیت و خواستی ئەم شێوە و ماکەش قبووڵ بکەم، بەڵام خواستی واقیعی بەیتەکەم قبووڵ نەکردووە.



**(٦)**

دروستکردن و دروستبوونی یەکەم مرۆڤ، یانی هونەری بوون و جوانی. هەست و گیان و خەون لە هەموو چەشنە شیعر و گۆرانی و مۆسیقا و تابلۆ،... تاد. هەن و دەدۆزرێنەوە. لە دروستکردنی یەکتریدا بۆ یەك پێویستن. چالاکیی ژیان لەناو ئەم دۆزینەوەیەدا دەردەهێنن و کاریگەری بەسەر سایکۆلۆژییەتی یەکەم مرۆڤ و دوایین مرۆڤەوە دادەنێن. ئەم ڕەگەزانە دەستنیشانکەری بەهای دروستکردنی یەکەمین مرۆڤن و دەربڕین لە چەمکی جوانی و تاسە و گوڕ و تینی دوایین مرۆڤیش دەکەن.

داهێنەرەکانی ئەم چەشنە دەقە بەرهەم دەهێنن، هەموویان بەهرەداری بێ پایانن و خولیا بە تین و کاریگەرەکانی خۆیان پێشکێش بە مرۆڤایەتی کردووە، بنەما هەمە جۆرەکانی جوانیویستی و جواننواندن و جوانبەخشییان کۆ کردووەتەوە. هەست و گیان و خەون، کە سەرچاوەی ئەفسوونی دەقن. بەردەوام ئەمڕۆ بە بیرکردنەوەی دوێنێ ناپێون و لە دۆخگۆڕیندان. جوانی لە خۆیاندا پڕ خورپەی بەهێز دەکەن. دەقێکیش ئەم خورپە بەهێزکردنە لەگەڵ بیرکردنەوەی هونەری بەڕێوەی نەبەن، خۆی ئەم کردەوە و کردەیەی قبووڵە لە ژێر پاڵەپەستۆ و چەپۆکی شتە ڕووکەشەکان بخنکێت. دەقیش پەیوەستە بە ترپە و ئاوازی دڵی ژیان و بار و بوارەکانی جوانی و هونەری بوون، ئەگەر پەیوەست نەکرێت بەو ترپە و ئاوازە، دەقێکی تەکنیکاری مۆمیاکراوە، لە پێکهاتەی مێژووی گیان، دەستخەڕۆ و ڕەنجەڕۆیە. دەقی تەکنیکاری مۆمیاکراو فرەمانایی جیهان دەکوژێ و ژیان وەك جەستەیەکی داماڵدراو لە هەستەکان نیشان دەدات. بەشە هەرە گرینگە گەرم و گوڕەکەی مێژووی

گیان، ئەفسانە و ئایینەکان پێکیان هێناوە و بەردەوامی گەشەکردنیەتی، بە پیتی دەکەن و بگرە و بەردەی جیاکاریی دەورووژێنن. تەنیا وەرگرتن و کارپێکردنی دیمەنی شڵەژاوی دەرەوە و بەهرەی تایبەت، فریای شیعر ناکەوێت ئەگەر ڕەگی شکۆی خواست لەناو بوون ئاوی نەخواردبێتەوە، کە ئاو هێمای سەرەتا و هێز و بەردەوامییە. تێڕامان دروست نابێت، پڕ مایەترین ئەدەب لە جیهانی نووسیندا ئەو ئەدەبەیە، کە پەیوەست بکرێت بە ئەفسانە و ئایین. ئەو ئەفسانەیەی هاتووەتە ئاراوە دەربڕین بووە لە بلیمەتییەك، کۆمەڵێك ڕووداوم وەك ئەفسانە هێناوەتە ناو نووسین. هەموویان دروستکراوی هێزی بیرکردنەوە و خەیاڵمن. ئەفسانە و ئایین بۆ کڵپەپێکردنی مێژووی گیان گەنجینەن و لە پانتاییی بیرکردنەوەدا بە نەرمونیانی بای پەڵە جووڵە دەکەن. لێکدانەوەی گیانیم بۆ هێز و کاریگەریی کەسانی ناو ئەفسانە و مێژوو، وەك پشتیوانیکارێکیش لە بیرکردنەوە و مانا و ئاسۆی جۆراو جۆر و ئایندە بینینییان، مرۆڤ دەخەنە سەر ئەو باوەڕەی جوانییەکانی زەمین حیکمەتێکی پەرتوبڵاوە پێویستە بە تەنافەوە هەڵبواسرێنەوە بۆ حیکمەت و بینینی دیکە.

## (٧)

داهێنان ڕێخۆشکەرە بۆ یەکگرتنی کولتوورە هەمەجۆرەکان. هەرچی هونەری شێوە و شێوازە لە ڕۆشنبیرییە بە زەبرەکانی بێگانەوە فێری ببین. نەك لاسایی بکەینەوە و بیخوازین. یەکگرتنەوەی مرۆڤایەتییە لە داهێنان و جوانیدا. هاودەقی هەر لەم بار و بوارەدا دروست دەبێت. ڕەخنەگرانێکی زۆر و هەمەچەشنیش بایەخیان بە چەمکی زمان و هاودەقی داوە و



باروودۆخەکەیان لەبەرچاو گرتووە، بەڵام ئاشق بە ئەدەبی بێگانەبوون بە نیازی دەستبەرداربوون لە ڕەگی زمانی زگماك، وات لێ دەکات بەهرە و بیری زمانت ناتەواو بێت. ئەگەر بەهرە و بیری زمانیشت ناتەواو بوو هەوڵ دەدەیت خوێنەر لە کرۆکی شیعرییەت دوور بکەیتەوە و سەرقاڵی شتێکی ناکامی بکەیت، چونکە شیعرییەت لە بەهرە و بیری زمانی زگماکدا پەروەردە دەکرێت و دەڕسکێت.

خەیاڵ و زمان لەسەر ئاستی شیعرییەت و ئاستەکانی دیکەوە دەچنە ناو یەك و ڕێژەی شیعرییەت بەرەو بەرزبوونەوە دەبەن، شیعرییەتیش بە جوانیی خەیاڵ و زمانی خۆڕسك و خودایی پەیوەستە و لە چێژدا دەبێتە خاڵێکی بەهێز. هەیە زانیارییەکی بێشوماری لەڕێگای خوێندنەوە و کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا کەڵەکە کردووە، بەڵام نازانێت بەکاری بهێنێت، چونکە لە بنەڕەتدا هەڵقوڵاوی ڕستەی ناو ناخی خۆ بنیادنەر و خۆبوونی نەبووە. کاریگەری و پەرەسەندنی زمان لەو ئاستەدا دەردەکەوێ و دەستنیشان دەکرێت.

## (٨)

هەموو دیاردەکانی بوون مرۆڤی داهێنەر بەرهەمیان هێناون، پڕ کاریشن لەبەرەو پێشبردن و کرانەوەی کۆمەڵگە بۆ قبوولکردنی جیاکارییەکان. کۆششی شێلگیرانە دەکەم دەقەکانم بابەتی تێڕامان بن بەرانبەر دیاردەکانی بوون، وزەی شاگەشکەییی چێژ و جوانییان تێدا نەمر بێت، بەڵام لەوە دڵنیام بە نیازی هۆ و ئامانج و هیچ شتێکی نزیك لەو

مانایانە نانووسم. پێوەندییەك لە جەستەی دەقەكاندا نیشتەجێیە، پێوەندیی شیعرییەت و زمان.

سەرچاوەكانم لە دەروونم دۆزیوەتەوە و ڕاستییەكانی دەرەوەش تێكەڵاوی خەیاڵ و هێما و ئەفسانە دەكەم. مرۆڤێكم تێكەڵاو لە گشت گۆڕانكارییەكان، گیانم لە قووڵاییمدا دەردەهێنم و بە یارمەتیی كەش و هەوای ڕستەسازیی زمان پێشانی دەرەوەی دەدەم. ئەم خۆپیشاندانەم ختووكەیەكی كورتخایەن نییە. ڕەگەزی حەز بەڕێوەی ببات، شێوازی ژیانە مرۆڤی خاوەن سیمای پاك لەناویدا نیشتەجێیە. گونجاویشە پێش ساڵانێكی زۆر وەك ئەم چركەیە گیانم هاتبێتە ژان و هەراسان، دوای ئەم چركەیەش بە شێوەیەكی دیكە لە چركەیەكی پڕ پشووی گیانی لەلانكی منداڵیمدا بنوومەوە. ئەم نووستنەش دوا مانا و شێوە وەرناگرێت.

شێواز دەبێتە خاڵێكی بەهێز لە داهێناندا، لەوەش گرینگتر، وشە دەبێتە خاڵێكی بەهێزتر لە ڕستەدا. هیچ شێوازێك تا سەر جێگای سەرسامیی ناوەندی ڕۆشنبیریی نییە. جێ لەق دەبێت، بەڵام ناكرێت بەكۆتاهاتنی یەكجارەكی ناوی ببەین و وەك سڕاوەیەك دڵخۆش بین پێی. تا ئەو ئاستەی دەسەڵات و هێزی ژیریم گوتویەتی، ئەوەندەم توانا و بەهرەیە، خۆم كۆكردووەتەوە شێوازی شیعریم هێڵی ڕوونی ئاشكرا بێت.

تێكۆشاوم بەهۆی پەخشان، بە گیانی شیعریی نیشانە و هێما لە داڕشتنێكی قووڵبووەوە لە ئاخاوتنی مرۆڤ و ئێستێتیكیدا بهێنمە ناو زەینی ڕۆشنبیریی پاراو و بێگەردەوە. بە دوای ئەو هۆكارانەدا بگەڕێم منی سەرنجكێش كردووە. گرفتارییەكانی ناوەوەی كۆمەڵگە بكەم بە



بابەتی جوانی. لە ناخی هەر هەموومان دەستەیەك چاودێر خۆی پەنا داوە، هەیە دەكەوێتە ژێر هەڵسوكەوت و هێزی ئەقڵییەوە. هەشە لێیان لا دەدات. خۆم لە دەستی ئەم دەستە چاودێرە ڕاپسكاندووە. ئاستە قووڵەكانی ئاگایی دەورووژێنم.

دەقی خەونیی، لە خەونی ڕاستەقینە نزیك دەكەمەوە، وەك چۆن ڕاشكاوانە قوربانی بۆ ژیان دەدەم. بەهەمان شێوەی ڕاشكاوانەش شێوازێك لە هەستیارترین ئاستدا كار پێ بكەم. شێوە و ڕستەیەكیش نییە، شێواز لەگەڵ خۆیدا نەهێنێتە ئاراوە و نەیجووڵێنێت.

## (٩)

نوێیەخشی لە داهێناندا دیمەن و هێما و هێزی بوونە. لەمڕۆ بە چەقەڵ و چەورە و پڕ مافیای ئەدەبی و حەربای هەموو لەش ڕوو، بەردەوامبوون لە نوێیەخشی و داهێنان چاوقایمی و گیانی ژیری دەوێت. تەنیا لەگەڵ ئەو نووسینانە ئاسوودەم كە شیری گیانمن و مایەی سەرسامین، دەمگەیەنن بەو ڕووناكییە خوداییەی لە هەستیاری و زەینی چالاكدا پەیدا بووە. هەموو وزەیەكی گۆڕان و پێشكەوتن لە گیانی مرۆڤی بە بڕوا و دامەزرێنەر و كەلكێش گەشە پێ دەدات، بار و بوار بۆ دەربڕین و كرانەوەی بەردەوام دەدۆزێتەوە و تێگەیشتن لە گەشەی گیان و خەون پەرە پێدەدا و لێ دەكۆڵێتەوە و دەیكات بە واقیعی نووسین. هزری دەوڵەمەندیش بەرهەم دەهێنێ و خۆشی و ئارامی ویژدانی پەناگەی خەیاڵی پاراو و بێگەردە. سەرچاوەی جوانبەخشی هێڵێكی هاوشێوەی خەون بۆ نوێیەخش دروست دەكات. ئەم هێڵە بە جووڵە خستنی نوێیەخشیی هونەری خۆیەتی،

کۆمەڵگە بانگ دەکات بۆ ناو ژیانی ئاسوودەیی ئەدەب. بەهەشتی شادمانی ژیانی ناو داهێنانە. مرۆڤی جوانبەخش دەخوازێ تەمەنێکی پڕ دانایی و کارامە لەناو ژیانی ئەدەبدا بژیت. نەك لە ئارامیی ساختە و خۆشدوویی دەسەڵات، کە هەموو دەسەڵاتێك بەشێك لە دیکتاتۆریەتی بە جووڵە و وێنەوە لەناو خۆیدا پەروەردە کردووە.

## (١٠)

بەشێکی زۆری قۆناغی دووەمی نوێبەخشی شیعری کوردی زیاتر وشەیان لەناو مانادا تواندەوە، لەوەی وشە بارگاوی بکەن بەبزێویی زمان. وشە هەست و هەستیاریی دروست نەکردووە، بگرە مانای گەیاندووە جۆرە پێوەندییەکی هێمائارا لەنێوان توانەوەی وشە لەناو مانا و وشە بارگاویکردن بە شیعرییەت خۆی ڕوون کردووەتەوە. شیعرییەتیش دەمانکات بە ئەندێشەی خۆی و ڕازی بەهێزی ئەندێشەکردنمان لە بیرکردنەوە و دۆخی دەروونیدا دەخولقێنێت. ئەمەش تەنیا لە هاڵاوی مەستی دەقدا مووچڕکە نەرمەکانی خەیاڵ و چێژ پەی پێ دەبەن. تواناکانی خۆگۆڕین و دۆزینەوەی خود ئاشکرا دەبێت. بە هۆشێکی ڕووناك و شکۆدارەوە ئەم خەسڵەتەیان دەستنیشان دەکەین. لە دید و دیدگا و قووڵبینی دووری خستوونەتەوە و لە دەربڕین نزیك. هەموو هەڵچوونە نەستییەکانی خۆیان تێیدا هەڵڕشتووە، هەڵڕشتن لە دۆخێکی دەروونی کورت خایەندا سروش وەردەگرێ و زوو دادەمرکێتەوە. ئاگری نادیار و نهێنی نووسین تەواو گەرمیان ناکاتەوە، ناوە ناوە تەزووی بەتینیان لە لەشدا پەیدا دەکاتەوە. لە بێ ئومێدی دەریاندەهێنێت و لە شەقامێکدا بەرەو پیاسە و ونگە دەیانبات.



خەیاڵ تێیدا لە قووڵایی ئەو وردەکارییانە دەکۆڵێتەوە، کە دەبێتە واقیعی نووسین.

نەست کاریگەرییەکانی خۆی کۆ دەکاتەوە و لە خرۆش و واقیعی نووسین دێنە ناو ئاگاداریی و دەبنەوە بوونێکی وشیاری، بەڵام لەسەر ئاستی هونەری و ئاستەکانی دیکەوە وتووێژیان لەگەڵ شیعر و ژیان نەکردووە، بگرە جەختیان لەمەودا دەرەکییەکان کردووەتەوە، دانەکشاونەتە ناوەوە، کە ناوەوە تایبەتکاریی کەسایەتی بەرهەمی دەهێنێ و زەینی چالاك توانای بەگەڕخستنیەتی.

مانای مەجازییان ڕاونەکردووە و بە ئەسپایی و دامەزرێنەرانە سەیری هەستیاریی زمانیان نەکردووە، کە لە هەستیاریی زماندا مرۆڤ بە پڕی ژیانی خۆی دەدۆزێتەوە و دەیبینێ و سەرلەنوێ چاوی پێدا دەگێڕێتەوە. زیاتر وەك یارییەکی ئایدۆلۆژی کاریان بە شیعر کردووە. لە بنجیشدا ئایدۆلۆژیا ڕەگی جوانیویستی و جوانواندن و جوانبەخشی دەبەستێ و هەموو هۆیەکانی گەشەسەندنیان لێ دەستێنێتەوە.

سەرەتای دامەزراندن و کرانەوەی شیعری کوردی ڕۆڵی خۆیان بەرز کردەوە و هەموومانیان بە خوێندنەوەی خۆیانەوە خەریك و سەرقاڵ کرد، کۆمەڵگەشیان خستە مشتومڕێکی ناتەبا و سەختەوە. کردنەوەی دەرگا و پیشاندانی سەرەتایەك بوون بۆ قۆناغی سێیەمی نوێبەخشیی شیعری کوردی و خاڵێك بوون بۆ جۆشدان و مامەڵەکردن لەگەڵ سروشتی ئازاددا.

قۆناغی سێیەمی نوێبەخشیی شیعری کوردی بە فۆرمی فرە پێوەندی و جیاکارییەوە ئاستی داخوازییەکانی خۆیان پیشان دەدەن. بەوەی ئەو وەڵامانەی

ئەوان بۆ واقیعیان دایەوە، ئێمە دەیکەینەوە پرسیار و لەناو گیانی دەقەکانماندا دەیکەین بە ترپە و ئاوازی نوێبەخشی و وێناکردنی جیهان و چالاکییە هونەرییەکانی کەشی خۆدەربڕین.

ترپە و ئاوازی قۆناغی دووەمی نوێبەخشیی شیعری کوردی زیاتر لە ترپە و ئاوازی مۆسیقای جەنگ دەچوو، کە جەنگاوەریان بۆ جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەسەر ڕادەهێنا. قۆناغی سێیەمی نوێبەخشیی شیعری کوردی لەو ترپە و ئاوازە دەریانهێنا و شکاندیانەوە بەرەو ناوەوەی ڕستەی سەربەخۆ و جوولەی وێنە. شاعیری نوێبەخش بڕوای بە بوونی ئەو هەقیقەتە هێناوە، کە ترپە و ئاواز پێوەندی بە جوانبەخشیی مرۆڤەوە هەیە و وزەیەکی خۆشگوزەرانیی ژیانی کۆمەڵگەیە. هەموو کۆمەڵگەیەکیش بنەمای ئازادیخوازی بە جوولە و وێنەوە لەناو خۆیدا پەروەردە کردووە.

حوزەیرانی ١٩٩٩ هەولێر



## بەشداریکردنی شیعر لە ئامادەکردنی هەقیقەتدا مانیفێستی شیعری

### نوێبەخشی

لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا هیچ سەرچاوە و وزەیەکی ئەدەبی بە ئاستی شیعر نەبووەتە مایەی بەرهەمهێنانی بیرکردنەوەی چالاك، هەروەها بەو پایە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەش پەسند نەکراوە و نەدرەوشاوەتەوە.

گیانی زمانی دەربڕینی کوردیش تا ئێستا هەر بە تەنیا لەناو پرۆژە شیعرییەکاندا زیندووە، کوردیش ویستی شیعر نووسین و هەستیاریی شیعری زۆر بەهێزە، تواناکانی خۆی تێدا تاقی دەکاتەوە، هەڵکەوتە کۆمەڵایەتییەکەشی وەری دەگرێت و ڕەوایی بە بەردەوامبوون و پەرەسەندنی دەدات، داهێنان بە وەرگرتنی قووڵاییەکانی ژیان بەرهەم دێ، لەم بەرهەمهێنانەشیدا ژیان دەخاتە ناو پرۆژەی دۆزینەوەوە.

ئەگەر دەربڕینێکیش لە فۆرمی ئاستدار و تیشکۆی خۆماڵییەوە دانەچۆڕابێتە ناو بوون و زەمینەی تەواوی دەربڕینەوە، بەهیچ شێوە و کەش و هەوایەك ناتوانێت نوێبەخش بێت و بێتە ناو پرۆژەی دۆزینەوەوە.

بۆ شاعیری نوێبەخش وەرگرتنی قووڵاییەکانی ژیان زیندووبوونەوەی زمانە، زمانی دۆزینەوەش زمانێکی یەك ئاراستەیی نییە، بەپرسیاری زۆرەوە لە ئاستە هەمەچەشنەکانی خۆی دەکۆڵێتەوە، قووڵاییەکان هێزی

وشە و ئەزموونی تێدا نووستووە، لە دەربڕیندا ئەم هێزە تاقی دەکرێتەوە و دێتە ناو پرۆژەی دۆزینەوەوە.

بەشێوەیەکی سەرەتایی نوێبەخشی لە ژیان و بیر و بیرکردنەوەی کۆمەڵگە دەرکەوتووە و هەنگاوی بۆ نراوە، بنەماکانی گۆڕان بەرەو پێداویستییە هاوچەرخەکان و هۆشیاری دەبێتە پێوەری دۆزینەوەی ئەدەبی، هەروەها نوێبەخشی هۆو ئامانجە بۆ پێوەندیکردن بە چالاکییەکانی ژیانەوە، بەشێکیش نییە لە ژیان. ڕاستەوخۆ ژیانە، مرۆڤ لەباری بەختەوەریدا وەك خوداوەند دەژێنێت، ئەفسوونێکی واشی تێدایە گیان و جەستە لە بڵندی بجەوێنێتەوە.

بابەت ورووژاندن و شێوازی شاعیر هەستکردنە بە جوانییەکانی ژیان و شۆڕبوونەوە بۆ ناو ناواخنی سروشت و لەدایکبوونی وەرزەکان. واش بەرانبەر ڕابهێنێ هەست بەم شۆڕبوونەوەیە بکات.

هەستی نووسینیش بە ساتەوەختی زۆر ناسك، یان زۆر دژوار تێدەپەڕێ. تێڕوانینەکان ئاڵوگۆڕیان تێ دەکەوێ و دەرسکێن.

شیعری ڕاستەقینەی خاوەن جیهانبینی، کە خودی مرۆڤ دابڕێژێتەوە، لە سۆز و خەونی ڕۆمانسییانە بەدەر نییە، ئەگەر شیعریش ڕووت کرایەوە لە سۆز و خەونی ڕۆمانسییانە بە هیچ جۆرێك ڕاستەقینە و خاوەن جیهانبینی نییە، کە خودی مرۆڤ دابڕێژێتەوە.

شاعیری نوێبەخش هیچ کاتێك چاوەڕوانی هاندان و ستایش ناکات، هەر کاتێکیش چاوەڕوانی هاندان و ستایشی کرد، ئەوە بڕوای بەوە نییە ئەوەی، کە نووسیویەتی داهێنان بێت. دەربڕینی نایاب بەهۆی کرداری



گەیاندن و هۆشیاریی زمانەوە لە ئاستی ئاسایی دەپەڕێتەوە بۆ ئاستی ئێستێتیکا، دەبێتە خاوەن پرسیار لەنێوان وریایی زمان و وریایی ئاخاوتن.

زمانی ئێستێتیکا شێواز و ئەدگاری خۆی لە دەربڕینکردن و دەربڕینەوە وەردەگرێت. لە ئەزەلەوەش گیان، گیانی جەستەیەکە شێوەیەکی دیاریکراوی بۆ ژیان و نەشونما دۆزیوەتەوە، شێوازیش ناوەند و گیانی نووسەرە، هیچ گیانێکیش بۆ جەستەیەکی دیکە وەرناگیرێت.

شێواز و شیعرییەت و زمان، ئەزموون بۆ ئایندە پێشنیازیان دەکات، ئایندەش پێوەندی بە هەموویانەوە هەیە، بەشدارین لە چالاککردن و بەڕێوەبردنی، پەیامی هونەریی مرۆڤگەلێکە، کە هەوڵی سڕینەوە و لەبەین بردنی ئەو شتانە نادات، کە ژیان دەخەنە بارێك بەرگری لە بە ژیانبوون و ئازاری خۆی دەکات.

ژیان و بوون و دنیاش لەناو شیعری نایاب و ئایندەدا نوێن، لەناو ڕۆشنبیریی کوردیدا نوێبەخشی هێشتان بە ڕوونی شوێنی شیاوی بۆ نەکراوەتەوە، ئاخاوتن لەبارەیەوە دەبێتە هەرا و زەنا، پێویستە ئەو بڕیارانەی لەم بارەیەوە بوونەتە مایەی سەرنج، بە ئاستێکی دیکەوە بخرێنە ناو ئاخاوتنەوە.

ئایا ئاخاوتنەکانمان لە خودی نوێبەخشیی دەقەوە دەرچوونە، یان لە دەرەوەی دەقەوە وەرگیراون و لە جەستەی تەنك و ناسکی دەق پراوەی پێ دەکەین، کە جەستەی تەنك و ناسکی دەق هیچ پراوەیەك وەرناگرێت جگە لە پراوەی گیان نەبێت.

نووسینێك گەیشتبێت بە ئاستی دەق، پێوەندیی ئاستداری چارەنووسسازی بە ئایندەوە هەیە، کە هەمیشە وەك سەرچاوەیەکی ڕوون هێزێکە بۆ بەرهەمهێنانی سەرچاوەی دیکە، بەرەنجامی خودێکی هەژاو و هۆشمەند و وریایە. بەشێکیش لە خودی هەژاو و هۆشمەند و وریا گەیشتوون بەو هەقیقەتە، کە شیعر بگەڕێتەوە ناو سۆز و هەست و ڕوونی و ئاشکرایی لە دەربڕیندا، ئەمەش وەك دیاردەیەك پێویستە بخرێتە ناو ئاخاوتنەوە. زۆر جاران گۆڕانکارییە ڕەچاونەکراوەکان کاریگەریی ڕاستەوخۆیان لەسەر چۆنیەتیی بیرکردنەوەی کۆمەڵگە و بیر و دەربڕینی تاکی نووسەرەوە هەیە. دەبێتە بابەتی نووسینەکانیان، بەڵام نابێتە مانای ڕوون و دیار، بگرە لە چێژدا دەبێتە سروشی مانا و چالاکیی وێنە.

## جیایی

پانتایی جیاکارم لە بەرهەمەکانمدا خولقاندووە، لە پانتاییەکدا دەستنیشان ناکرێم. ئەرێ لە پانتاییە شیعرییەکاندا، دەچمەوە سەر چ پانتایەکی خۆ تایبەتیکردن. تایبەتکار بۆی هەیە تەواوی هەبووەکانی، کە توانای کاریگەرییان تێدا دەرکەوتووە، ڕاکێشێتە ناو بیرکردنەوەی چالاکی، کە بەردەوام هێما و هێماپێکراو بەرهەم دەهێنێت. لە یەك کاتیش لەناو هەموو پانتاییەکاندا کار بکات و دەستیان بۆ ببات.

بەرانبەر بە ئاگایی خۆم جەنگاوەرێکی زانام و ئەهلی زیندوویتی دڵ و یەکێتی ئەشقم، پانتایی ئێستێتیکا و ڕێبازی وردبوونەوەم لە ژیانمدا هەڵبژاردووە، دەمەوێت بە ڕاناوی نادیار زمانی تێدا هەستیار بکەم،



هەستیاریی تەواوی زمانی کوردی لە شیعری کلاسیکیماندا تواوەتەوە و دەرکەوتووەتەوە. کاتێك شیعری کلاسیکی دەخوێنمەوە هەست دەکەم تەواوی زمانی کوردی ڕووبەڕووم وەستاوەتەوە. دەمباتە ناو جیهانێك، کە قسەی لەبارەی دۆزینەوە و بوون کردووە، نەك گێڕانەوە. خەون و ناوەندی وشە هەوڵدانن بۆ خۆناسین. لە ماڵی گەورەی شیعردا هەموومان پێکەوە داوای شیعرییەت دەکەین، ئەو داوایە وزەی گەشەکردنی جوانی و بەرزکردنەوەی ئاستی هەقیقەتی گیانی و درامای ژیانە. جوانی زمان لە جوانیی ئەو کەرەستەوە دێت، کە دەربڕینی لێ دەکات، زمان شانەیەکی زیندووی زۆر قووڵە لە جەستە و پێکهاتەی مرۆڤ لە گۆڕانی دید و پێوەندییەکاندا.

جیاییی تاقیکردنەوەی من ئەوەیە: جیهانی پارچە پارچە دەخولقێنم و پێوەندیی هێما و هێماپێکراویش دەپچڕێنم و دەستنیشانیان ناکەم. سەرچاوەکانی نووسین و ئاستەکانی دەنگ و تێبینیکردن و سەرنجدانم لە جوانیی بێگەرد و بێ هاوتای ژیان وەردەگرم، دەگمەن و تاقانە دەبن بە هێما و هێماپێکراو.

شیعر چەند بچێتە ناو ژیان و دنیای خودایی و هەقیقەتی ڕۆژگار، هێندەی دیکە گیانی تا هەتایە پەروەردە دەکا و دەیپارێزێت.

شتێك لە نووسین، کە وەك ئەزموونێك پێشکێشم کردبێت، بەکاربردنی زمانی خەونە بۆ زمانی نووسین و ڕاچەناندن و چالاککردنی ناخی پڕ تواناییو یادەوەری. دواجار تواندنەوەی چالاکییەکانی بیر لە هەستیاریی نووسیندا.

چامەی درێژ پڕۆژەیەکی کامڵە و لەسەر ئاستی بوون و کرانەوەی بەردەوام ڕادەوەستێت، سروشتی دایکی هەستەکانمە، ئاسۆیەکی ئەفسانە ئاساییە ناتوانم لێی دەربازبم بە کاملترین فۆرمی شیعریی دەزانم و پەیڕەوی دەکەم، لە ڕایەڵی ڕستەکانیدا توانای جوولاندنی فرە دەنگی و فرە پێوەندی دەڕسکێت. مانا و زمان دەگەڕێتەوە ئەو ئاستدارییەی هێزی نووسین ئاشکرای دەکات و دەیهێنێتە گۆڕێ. واتە قووڵبوونەوە بە ناخی بیندراو و شەپۆلی شوێن و سیمای بوون.

## فرە دەنگی

ڕوانینی گەردوونی بار و بوار بۆ گەشەسەندنی شیعر دەڕەخسێنێت، بڕای بڕ پێوەندیی بە شۆڕشی گەیاندن و فۆرمەکانییەوە نییە. خەیاڵ و ئەو ئاسۆیەی جیهانی بەهۆیەوە وێنا دەکەیت، لە دەرەوەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن کاری شیعرییەت بەڕێوە دەبەن، لە کەڵك وەرگرتن دەست والا و دیموکراسین، سەرسامیی خۆشیان بە نەشونمای نوێیەخشیی گیانی ژیان ناشارنەوە.

دەتوانین لەوە دڵنیابین، کە شیعر هەموو سەنگایی ساتە وردەکانی بە تەنیا خستە سەر هەڵقولانی خەیاڵ وەك بەرزایی و ناوەندی کاریگەر چووە ناوی و کرۆکی ژیانی بە هۆیەوە وێنا کرد. بێگومان لەبارێك نزیك دەبینەوە شیعری تاك دەنگی دەبێتە خۆنیشاندانێك و دەربڕین لەو بارەی بێهێزە.



دەکرێ لە بچووکبوونەوەی دنیا لە بینینی شاشەدا، یان هەر فۆرمەکی گەیاندنەوە، شیعری فرە دەنگ لە چنین و ڕایەڵی توند و تۆڵی ببێتە جێگرەوەی خەیاڵ وەك بەرزایی و ناوەندی کاریگەر.

لە شیعری فرە دەنگیدا خەیاڵ ڕەگەزی سوودبینینە، بەرزایی و ناوەندی کاریگەر نییە. نیشاندانی باوەڕ و گیانی کراوە و دەوڵەمەندیی ئەم شێوازە بەئەندازەیەك لە شانۆنامە و ڕۆماندا بە ئاشکرایی دەگاتە لووتکەی بینین و تێگەیشتنی ڕوون.

لە شیعری درامییدا گفتوگۆ لەگەڵ هەست و ئەقڵی خوێنەر و شاکەس و کەسایەتییە جۆراوجۆرەکان دادەمەزرێنێت، هاوتاییەك دەدۆزێتەوە لەباری نووسیندا پەیڕەوی دەکات. لە پێکهاتە و بنەمای منی شیعریدا پێکدێت و دەبیندرێت، خۆی لە منی تاکە کەسی شاعیر دەکشێتەوە، ڕۆڵ و ئاستی شاکەس و کەسایەتییە جۆرا و جۆرەکان و چێژێك دەگەیەنن، چێژی ئاراستەکراوی شاکەس و کەسایەتییە جۆراوجۆرەکان و واتاناسی.

زۆرێك لە شیعری ئیمڕۆمان لەسەر سیستمی تاکدەنگی منی شاعیر وەك ڕەگەزێکی کارپێکەر بەڕێوە دەچێت، ئەم شێوازەش وەك هونەر هەرچی پێ بوو بەخشی، چاوەڕوان ناکرێت هونەرێکی کاریگەریی پێ مابێت بۆ بەخشین و سەرسامی، چونکە هیچ شتێك ڕوونادات قسەکەر یەك قسەکەرە و پانتایی نووسینەکەی داگیرکردووە، هەروەها بوونی شیعریش وەك شێواز و شێوە دەخاتە مەترسییەوە. لە کارایی و زیندوویی و هێز دووری دەخاتەوە، کە کارایی و زیندوویی و هێز بارێکن هەمیشە زیندوومان دەکەنەوە و سەرچاوەی سەرسوڕهێنەرن.

یەکەمین کردەی هەستیارکردنی زمانە، ڕستەکان درێژ دەکاتەوە بە مەبەستی گەیشتن بە چاوگە دەنگییەکان، چاوگە دەنگییەکانیش هەمیشە ئاگایی زمان تێیدا دەبێتە باری ڕاستەقینەی نووسین و وزەی ترپە و ئاواز لەم بارەیەوە ڕوو دەدات. چەند ترپە و ئاوازێکی لێ دەبێتەوە، جۆراوجۆری ترپە و ئاواز خەسڵەت و مۆرك و ئاماژەی ناسینی ئەم ژانرەن، پشت بە وێنەهێنانەوەی یەك لە دوای یەکیش نابەستێت، زیاتر گێڕانەوە دەکاتە خۆبووژانەوە و دەرکەوتن و ئاراستە وەرگرتن.

## دەستکاریکردن

دەقەکانم ئەوانەی چاپم کردوون و ئەوانەی چاپیشم نەکردوون، هەمیشە لەسەر مێزی کارکردن دەستیان بۆ دەبەم هەر چەند ڕستەیەکیان دەستکاری دەکەم و چەند لاپەڕەیەکیان دەخەمە سەر و چەند لاپەڕەیەکیشیان لێ لادەدەم. تا ئێستاش نەگەیشتووم بەدوا دارِشتنیان. ئەو هونەر و دڵەڕاوکێیەی دەستکاریکردنەش لە کارکردنی بێ وچانی کاتژمێر گواسترایەوە ناو باری دەروونیی شاعیریەتیی من.

کاتژمێر تەکان دەدا بەرەو ناو دەقی کات. دەقی کاتیش هەمیشە ئەو چرکەیەی جوانە تێیدا چاوەڕوانیت، کە هێز دەخاتە ئەو چرکەیەی بۆی دەڕوات، ڕۆیشتنی منیش هەمیشە بەرەو دەقی شیعرییە. هەموو شتەکانی کاریگەرییان بە نەشونمای ژیانەوە هەیە. لە زەینمدا ئامادەیان دەکەم و دەیانکەم بە بەشێك لە چالاکییەکانی بیرکردنەوەم. دەستکاریی بەردەوامیش کارێکی دروستە بۆ نووسەری پڕ توانای پەڕینەوە بۆ ناو پرسیارەکانی، کە بوون بەیەك جۆر دەستنیشان ناکەن، بەرگری و دەربڕین



لە داهێنان دەکەن، چونکە هەر جارێك، کە دەستکاریی دەکات، بەو نیازە بە تەواوی ژیان لەناو دەقەکەیدا ببینێت، یان ژیان بە تەواوی بهێنێتە ناو دەقەکەیەوە و بیگەیەنێت بە ئاستی خەونی نووسین. ئەویش یەك لە مەحاڵەکانی نووسینە، نووسین هەوڵدەدات بۆ مەحاڵ، مانەوەش لەناو ئەو مەحاڵە سووربوونی نووسەرە بۆ بینینی ژیان بە تەواوی لەناو دەقی بێگەرددا.

## شاعیر

شاعیر، سەر گەرمییەکانی خۆی لە سنووری بیرکردنەوە و جیهانبینییەوە دەست پێدەکات و گیانی چالاکە بەگشت جوانییە هاوبەشەکان. ئاراستەی ئالۆزکردنی جوانییە هاوبەشەکان نییە. سادەکردنەوەیەتی، بەرپرسە بەرانبەر بەرزبوونەوە و ڕسکاندنی ڕوانینی پڕ شیعرییەت و جووڵەی ئاخاوتن لە زماندا، پەیوەستیشە بەوەی پێوەندییەکانی نێوان جوانی و فۆرمەکانی کۆمەڵگە وەك پرۆژەیەکی پەرەپێدان وەربگرێت.

کاری گوتار دامەزراندنیش لە پێوەندییەکانەوە بکاتە وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەزموونکراوی هەقیقەتی مرۆڤ. لە هەمان کاتدا لە تواناکانی دەربڕیندا بەرزیان بکاتەوە ناو ڕایەڵی ڕستە و ترپە و ئاوازی ویژدانیان لێوە وەك نیشان و نیشانە پیشان بدات، هەروەها دەسەڵاتی هەستیاریشی بەسەر ئاشکراکردنی چارەنووسی جوانی لە شێوازی نادیاردا پاڵپشت لە بەرزبوونەوەکەی بکات.

تەوەرەکانی هەست و سۆز و خەون بخاتە گەڕ بۆ هێشتنەوەی بەردەوامیی چێژی گیانی. جوانی وەك ڕەگەزێکی چالاك و بنیادنەر لە پێکهاتەی دەقدا بکاتە ناوەندی بە یەکگەیشتنی پێوەندییەکان و باوەڕهێنان بە هەقیقەت و تواناکانی ژیان. بۆ واتای ڕاستەقینەی لەناو دەوروبەرێکی بێ هێز لە هۆشیاریی فیکریدا ئاکار دابڕێژێت. بەدواداچوونی مێژووی گیان و ئەوانی دیکە و چاونەترسیش بەرەو ڕووی ئەم ئاکار داڕشتنە بکاتە ماڵی هەر هەموومان و نرخێکی هونەری مانا دەرنەکەوتووەکان هەڵداتەوە.

کردەی نووسین وەك سەرەتایەکی هەمیشەیی و خاڵە یەکتربڕەکانی کات بپارێزێت. بە فراوانییەکی ئاستدار و کاریگەریش بانگەوازی لایەنداریی تەواوی ڕابگەیەنێت، دواجار بە ئاستی بەهای مرۆڤ بیناسێنێت، بپرسێت ئەرێ ئاستدارییەکانی شیعر و مرۆڤ چین لە واقیعدا جێبەجێیان بکات و جێی پەسندی بن. تا چەند توانیویەتی جوانی و هونەر بگەیەنێتە ئاستی ژیان و درکاندن.

## فەرهەنگ

وشە لەناو فەرهەنگدا بە یەك مانایی سنووردارە، لەسەر ئاستێکی جێگیر و نەگۆڕیش پێوەندی بۆ دەستنیشان کراوە، واتە لەناو ژیان و بزووتنەوەی بەرەو پێشچوون کار و چالاکیی لێ وەرگیراوەتەوە و خانەنشین و لا کەنارە.

شیعر هێز لە خودی زمان وەردەگرێت، بەزمانی ناو ژیانیش شیعرییەتی دەڕژێتێ و پێوەندییەکانی بە جیهان دەبەستێتەوە، کار و



چالاکیی وشە گەرمەکانی ناو ژیان وشە بێ هێزەکانی ناو فەرهەنگیان لە خەیاڵگەی نووسەری خود وریا دەربەدەر کردووە. هەست بە نائومێدییەکی ترسناك دەکەم لەو وشانەی لەناو فەرهەنگاندا وەنەوز دەدەن دوای گواستنەوەیان بۆ ناو ڕستەی شیعریی کتوپڕ خەوی دووبارەکردنەوەی لێ دەکەوێت. لەباری دووبارەکردنەوەشیاندا، بچووکتر دەبنەوە. دەستەواژە لەناو فەرهەنگدا خۆشباوەڕ و بێ ئومێدە بەیەك مانایی دڵی داکەوتووە و فۆرمەکانی کۆتایی پێ هێناوە.

شاعیریش لەناو فەرهەنگدا سڕ دەبێت نەك سەرسام. لە وشەکانی بەردەست و زەینی خۆیەوە دەست پێدەکات. ڕۆشنبیریی ئەکادیمی و فەرهەنگنووس و زمانەوان لە وشەکانی ناو فەرهەنگدا کار و چالاکییەکانیان بەرهەم دێنن. لە فەرهەنگدا ئاستی جیاکاری زمان نییە. هەموو داهێنانێکی زمان لە ئەدەبدا لە دەرەوەی فەرهەنگ ڕوودەدات، دەقی نایابیش لە کرۆکدا لە پێوەندیی زمانەوە سەرکەوتن وەردەگرێت.

لەناو مێژووی ئەدەبدا، ئەدەبێك نییە لە وشەکانی ناو فەرهەنگەوە سەرکەوتنی بە دەست هێنابێت، بۆیە فەرهەنگ لای من بووە تەلیسمێکی بکوژ، زوو خۆم لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی دەرهێنا. ژیان فەرهەنگی شیعرە، هەر شاعیرێکیش هانا بۆ وشەکانی ناو فەرهەنگ ببات نەشازیی خۆی بە شیعر ئاشکرا دەکات. مامەڵەی لەگەڵ وشەی ئامادەکراوە، بایەخی ساتە هۆشیارییەکانی ناوەوەی خۆی لە دەستداوە، ئەگەر نووسینێکی ئەدەبیش ساتە هۆشیارییەکانی ناوەوەی نووسەر خرۆشانی تواناکان و چالاکیی نەبووبێت دەقێکی بەتاڵە لە ئەفسوون و هۆشیاریی نووسین.

## مانیفێست

وەك پرۆژەیەك مانیفێستی شیعریی خۆم ڕاگەیاند، بۆ ئەوەی ئەم ڕاگەیاندنە ببێتە پاڵپشت و تیشکۆ بۆ ئەزموونی شیعریم. مانیفێست و خۆڕوونکردنەوە پەنجەمۆر و ڕوانینی تایبەتیی نووسەرن بە کەرەستەیەکی خەملّیو و ئەزموونێکی ڕاستەقینە بەرانبەر نووسین. بۆ نووسین و گەڵاڵەکردنی، بە قووڵی سەرجەم دەقەکانی خۆم بە توانای گۆڕان لە ژیان و هونەر هێنایەوە ناو زەینم. لە مەودای خاڵی لاوازی تا خاڵە سەرسوڕهێنەکانی ئەزموونم وەرگرت، بەوپەڕی هۆشمەندی جیاکاریی هەستکردن لە مەوداکانی مامەوە و تێ فکریم تا بووە پرۆژەی باش بیرکردنەوە و گفتوگۆیەکی ڕۆشن. بنەماکانیم لە شەوق و کاکڵە و ناخی ئەو مەودایانە دۆزییەوە، کە لە واقیعی نووسیندا هێناومەتە گۆڕێ. ئەو واقیعەی چۆنیشی بیر لێ دەکەمەوە و دەیجووڵێنم.

پێش نووسین بیر لە مانا ناکەمەوە، دوای نووسین مانا دەدۆزرێتەوە، هەروەها بیر و ڕاکانی ڕام گەیاندوون هەموویان لە دەقەکاندا شوێنی ژێربێژی و ئەو ئاماژە و نیشانانەی تێیدا بەرهەم هاتوون ئاشکران. چارەسەری هەندێك لە هەستە ڕۆمانسییە سەرەتاییەکانیشم کردوون، هێڵم بە ژێر دێرە لاواز و سەرسوڕهێنەکانی کێشاون. خەونم کردووە بە فۆرمی دەستپێکردن و دووبارە گەڕانەوە بۆ واقیعێکی دامەزراوی خەونیی.



## قۆناغ

شیعر وەك درێژبووەوەی قۆناغی پێشتری وەرناگیرێت، لە هەندێك ڕەگەز یەك دەگرنەوە، لە زۆر ڕەگەزیش تەواو ئاستیان دەکەوێتە نێوان، دژی قۆناغ و ڕێباز و قوتابخانە و دابەشکردنم، دەقی داهێندراو بەسەر تەواوی ژیاندا دابەش دەبێت.

ژیان و خوێندنەوەی ڕووداو و دیاردەکان بەیەك ئاراستەنایەن، بە جیاکاری بیری یاخی و کەرەستەکانی شیعری لە کەشی شێوە گۆڕیندان، ئاستیش بەرەو گۆڕان و تێکەڵاوبوون وەردەگرن. هیچ قۆناغێکیش ناتوانێت قۆناغی پێشەخۆی تەواو لەناو خۆیدا ون بکات و داهێنانەکانی لە گۆشەیەکی تەنگەبەر گەمارۆ بدات. جیاکارییەکان سروشتین. جیاکارییەکانی ئەو قۆناغ و ئەزموونانەی لە داهاتووشدا دەبنە هۆ و مایەی گفتوگۆی گۆڕانکاری هەمدیس هەر سروشتی دەبن.

شیعر لە زماندا ڕەونەقی شیعرییەت بەدەست دەهێنێت، زمانیش بە ئاراستەی هاتنی، ئاستی گۆڕان و تێکەڵاوبوون وەردەگرێت.

ئایا زمانی قۆناغەکانی ژیان درێژەپێدەر و دووبارەکردنەوەی یەکن. بە جیاکاریی ئەو دەستکەوتە هونەرییانەی لە ئاکامی پەرەسەندنی بیر و پێویستییە کۆمەڵایەتی و شارستانییەکان ئەزموونکراون و دامەزراون، یان بابەت و مەبەستەکان شێوازیان دەگۆڕێن و نیشانەکانی هەست پێ دەکرێن. زمانی شیعر، شیعرییەت لە زمانی قۆناغێکی دیاریکراو وەرناگرێت، هەموو سەردەم و مەوداکان ڕادەکێشێتە ناو بازنەی بەڕێوەچوونی خۆی، هێز دەڕژێنێتە ناو تەکانەکانی بۆ بەکاربردن و ئاماژە ژێربێژییەکان.

قۆناغێك، داهێنان تاجی لەسەر هێمایەكی دلێری نەنابێت، درێژەپێدان و مێژوویی نییە. هەندێ باری قووڵی سەرسامی سۆفییەت لە نووسینی ئەمڕۆ دەبیندرێن.

سیماكانی لە قۆناغی كلاسیكی ڕەونەقیان بیندراوە، وەك پێویستییەك لەمڕۆدا ئەزموون دەكرێنەوە، ئەو پێویستییە ونبوونی نوێبەخشی نییە لەناو كلاسیك، ئەو شتانەی لە ڕۆژ و ڕۆژگاری خۆیان دەردەچن بەرەو بە ئەدەببوون، شتەكانی لەناو كۆمەڵگە ئەدەبن و ئەوانی تواناشیان تێدایە ببنە ئەدەب دەقئاوێزان بە جیاكاری بنیادی دامەزراندن. هێڵی ڕوونیش ڕوانینەكان بخاتە باری قووڵبوونەوە و سیما هاوبەشەكان بناسێنێ. زمانی جیاكار ترپە و ئاوازی جیاكاری لێ دەبێتەوە. شێوەكانی دەربڕینیش لە ترپە و ئاواز وەردەگرێت. وەك فۆرم و پێكهاتەی ڕستە بەندیش جیاكارییەكان بەرەو چەندین ئاراستەی جیاكار ڕامان دەكێشن و بە كارامەیی بە گەڕمان دەخەنەوە بۆ دوانەخستنی ژیان، كە ژیان خۆی كردەیەكی دواخراوە. خاوەن فۆرم و توانایەكی سەرسوڕهێنیشە.

## پێویستی

لەم لێوردبوونەوەیەی هەستم بۆ ژیان و هەڵبژاردنی شتەكانی دەوروبەر هەڵوێستی وەرگرت. شەپۆلی هۆشیاری لە ناخمدا خۆی هەڵاوێشت و بەڵگەی ئەوەی پیشان دا لە ناختدا پەیامبەرێك خولقاوە پێویستی بە دەربڕین و نووسینی كتێبێكە بۆ هەموان.



لەو خرۆشانەی خەون و واقیع و ژیان داوایان لە گیانم كرد، پێویستە كۆمان بكەیتەوە، خاڵی بەیەكگەیشتنمان شیعرە. فەزای زیندووی پەیامبەریەتی لە بوونم ڕسكا.گۆڕانێكی ڕیشەیی لە ڕوانینە سەرەتاییەكانم بەرپا بوو، بەڵام لە ڕووبەڕووبوونەوەیەكی گیانیی یەكەمین ئامادەبوونی نووسین لە سەلیقە و چێژمدا چەخماخەی دا. خۆی وەك كاتێكی بەرجەستە لە بینین و نووسین پیشان دا. ژیان و مەرگم لەناودا كردە سەرمەشقی پایەداربوون.

سروشتی دەربڕینیش دەگۆڕێن، هەندێ جار واقیع و ژیان جێدەهێڵم و دەچمە ناو خەون. هەندێ جاری دیكەش خەون جێدەهێڵم و دەچمە ناو جوانییەكانی واقیع و ژیان. ئەم جێگۆڕكێكردنە بیركردنەوە و گفتوگۆ و بینین و دەروونم ئازاد دەكەن و دەچمە ناو كەشی نووسین. واتە دۆزینەوەی واقیعی نووسین. نووسینیش لە هەموو شوێنێكدا هەیە. تا لە بۆشاییەكانیش پێویستە شاعیرم لە مردنیشدا وەڵامی پێداویستییە شیعرییەكان بدەمەوە. سوپاس بۆ خودا چارەنووسی لەدایكبوونم لە وڵاتێكدا بووە، شیعری تێدا خۆشەویستە.

## ڕەخنە

نووسین لەبارەی دەقەكانم ڕێك خراون، ئایا بوونەتە هۆیەك لە دید و دیدگایانەوە بە خۆمدا بچمەوە، ڕەخنە ئامرازێكە بۆ باش تێگەیشتن لە ئەدەب، جۆرە سەرلێشێوانێك بۆ خوێنەر بەدی ناهێنێت. سەربەخۆیی دەق و خوێنەر گرینگە، كردەیەكی شارستانی و زانستییە ڕۆشنبیر سەداسەد

خۆشحاڵ پێی، بەڵام لەو ڕەخنانەی وەك مەبەست ڕای دەکێشمە ناو ئەو نووسینە یەکێکیانم بۆ دەستنیشان نەکرا پسپۆڕانە لەناو دەقێکم بە پرۆگرامێکی ئەکادیمی، یان خەیاڵێکی داهێنەرانە کاری کردبێت و بەشێك لە کردەی ڕەخنەیی لەناو خۆیدا هەڵگرتبێت. کەم ئەزموونی و کەم و کورتیی دەقی منی خستبێتە بەردەم کۆمەڵێك نیشانە، یان خوێنەری خستبێتە خوێندنەوەیەکی تایبەتییەوە، کە پشت بە میتۆدەکانی ڕەخنەگر ببەستێت.

ئەو دیاردانە وامان لێ دەکەن بپرسین ئەرێ ئەم نووسینانە بۆ ڕێك دەخرێن. هەقیقەت لە کوێیە. ئایا هیچ لەو نووسەرانەی، کە ڕۆشنبیریی خۆیان ئامادەیی لە نووسینە ڕێکخراوەکەدا نەبینیوە، توانیویانە پێوەندییەکانی نێوان دەقەکانم بخوێننەوە و خۆیان تێیدا ئامادە بکەن بۆ کارێکی زانستییانە، کە توانای مانەوەی هەبێت، خاڵێك، یان چەند خاڵێکی قەناعەت پێکەر بخاتە ناو گفتوگۆوە، کە مەترسی بێت بۆ ئەو بیروڕا هونەرییانەی من پێشکێشم کردوون، ئاراستە و بڕوای منیان پێکهێناوە.

ڕەخنەگرانی ئەکادیمی و خەیاڵ ساغیش، توانیویانە پانتاییەکی هەمیشە ئامادەی ئەزموونم پیشان بدەن. هەستیارییەکی قووڵی تێدابێت لەناوی ئاسوودە بیر بکەمەوە و پەیوەست بم بە خەونی نووسین. هەمیشە بڕوایەکی پتەویشم بە جیهانیی منداڵییەوە هەیە. ئەو هەستە پاکەی لە گیانی منداڵیەتی پەروەردە کراوە. هەمان هەستی پاکیش لە سروشتدا دەجووڵێت. منداڵی و سروشت ناوەندێکن لە هەموو لایەکەوە بۆیان دەچم.



لە پێوەندییە برادەرییەکانم بە هەموو هەستەکانمەوە ڕێز لەبەرانبەر دەگرم، کەچی زوو لەوە حاڵی دەبم بەرانبەر پێویستە وەك گوێزێکی پووچ لە لێژاییی فڕێ بدرێت. چۆلەکە پشت و پێش و تەنیشتی خۆی دەبینێت. خاوەنی بینین و مەودایەکی بێشوماریشە. بە پێچەوانەی چۆلەکە یەك ئاراستەی بینینم بۆ ژیان هەیە. ئاراستەی بینینی هەقیقەت و بەرزایی ڕۆشنبیری و داهێنان، پەیڕەویشی دەکەم. چ زیانێکیش بەو هۆیەوە پێم بگات پێی زەرەرمەند نابم.

دیاردەی بێزراو لە ئەزموونی شاعیریەتیی من بیندراوە، هەبووە بە نووسینێك بردوومیەتە کەشکەڵان، دوای ماوەیەکی ئێجگار کورتیش هەر خودی هەمان کەسی خاوەن ئاراستەی کەشکەڵان بوونی ئەدەبیمی ڕەت کردووەتەوە، کە ئەو ماوە ئێجگار کورتە ناتواندرێت وەك گۆڕان و ئەزموون لە دید و دیدگا تەماشا بکرێت.

ئەگەر نووسەر خۆی لە ئەنجامی ئەزموون و کارکردنی لەناو ئاماژە ئەدەبییەکاندا گەیشتبێت بەو دوو ئاراستەیەی کارکردنە وەك ئاکامی وەرچەرخانێك بیر لە ئاستەکان دەکەمەوە و پێی خۆشحاڵ دەبم. ئەگەر مایەی سوودوەرگرتن بێت، سوودیشی لێ وەردەگرم، بەڵام ئەگەر لەژێر چاوڕوونی و ڕازیکردنی دژەکانم ئەو هەڵگەڕانەوەیەی کردبێتە داو و هێڵێك و کردەی نووسینی بەدوادا ببات لەوانەیە بتوانێت لە ماوەیەکی ئێجگار کورتدا بە چەند ئاراستەیەکی دیکەشدا کێش و نیشانە و ئاراستەکردن وەربگرێت. کاری ڕەخنەگر لەسەر ئەم پایە دەوەستێت سەنگی ئەدەب لە ڕۆشنبیریی کوردی دەربخات. هەندێك نووسین لە ئاستی هەرە بەرز ڕایان گرتووم. بێگومان

ئەمەیان زێدەڕۆیی تێدایە. هەشە بە شێوەیەك دایپلۆسیوم لە نزمترین ئاستی ئەدەبی دیاریکراوی کردووم. ئەمەشیان بێگومان ونکردنی ڕۆشنبیریی تێدایە.

خۆشم لەو دوو بەرەی دژ بەیەکە باش حاڵیم، داهێنان لەو پاداشتە نییە، کە لە ڕەخنەگر، یان هێزی باڵادەستی سیاسی وەردەگیرێت. خورپەی دڵ فەرمانڕەواییی بەردەوامیی داهێنانە. دیارییەکە خودا و زمان ئەو خورپەی دڵەمان دەدەنێ و ئاشکرای دەکەن.

هیچ ڕستەیەك لەبارەی نووسینێك نامدرەوشێنێتەوە هەست و دەروونی نووسەرەکەی تێیدا ئازاد نەبێت تا سەر ئێسکان گیر بخوات لە خولقاندنی دوو دیوی، لەگەڵ هەموو نووسینێکدام، تەنیا لەگەڵ ئەو نووسینەدا نیم ڕك و بوغز و تاکتیکی سیاسەت تێیدا دەستەڵاتدار بێت. ئەو نووسینانە هۆشیاریی ڕەخنەیان تێدا بەکار نایەت. زیاتر چاودێری نووسینن. ئەمجۆرە ڕەتکردنەوانەش تەنیا شکست بۆ خاوەنەکەی تۆمار دەکەن. شکستییەکەش دەبێتە بابەتی لادانی ڕەخنە لە میتۆدە ڕەخنەییەکان و ئەم و ئەو ڕازیکردن لەسەر ڕەنجی ئەو دەقانەی خاوەنی هەقیقیترین بنەمای شیعرییەتن.

هەندێك لە نووسینی بێزراو بە شێوەیەکی گاڵتەجاڕانە ئاماژەیان بەو وێنە شیعرییە: (شەمەندەفەر گوڵەبەڕۆژەی مێژوو دەکرتێنێت) داوە.

لە ئایندەشدا گاڵتەکردن بە ئەزموونی سەرکێشان بەردەوام دەبێت. پێش منیش گاڵتە بە ئەزموونی سەرکێشانی دی کراون، دواتریش بوونەتە هێمایەکی ڕوون و زۆر درەوشاوە: نموونە گۆران، کە توانیویەتی سیمای داهێنانی تاقانەی خۆی دەربخات چووەتە ناو هەندێك کۆڕو کۆمەڵ، نیمچە



ڕۆشنبیریی کەم ئەزموون و ناڕۆشن بە (هەلوور بەلوور تەکامە- زەرد و سوور و شەمامە) تانەیان لێداوە. لەبەر ئەوەی شیعری لە دەرەوەی ژیان دەرهێنا و کردی بە ژیان. ئەم دەربڕینەیان وەك بەهانەیەك دەهێنایەوە، کە لەسەر ئەم کێشە خۆماڵییە سیماکانی شیعری کوردی دەرخستووە. بەهەرحاڵ ئەرێ ئەو ڕێزدارانە کێ بوون و لە مێژوودا چییان پێ کرا. لەمڕۆدا ئێمەمانان چەندیان دەناسین، وەك ڕەگ و سەرچاوەی چێژبەخش پێوەندییە نادیارەکانی خەیاڵکردن و بیرکردنەوەمان لێك ئاشکرا بکەن. لە لێکجیابوونەوە و پێکەوەبوونیانیش هاوگونجانێك نیشان بدەن، یان لە پانۆرامای داهێنان لە کوێندەر دەستنیشانیان بکەین. ئەوانەی هەقیقەتی داهێنانی مەزنیان زانیوە ئەوە دەزانن، کە گۆران توانی دیوانی نوێبەخشی شیعری کوردی بنووسێت و لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگار پێگە و ناوبانگ و شاعیرییەتی زیاتر بدرەوشێتەوە لەوەی، کە خۆی لە ژیاندا مابوو هەیبوو. کەواتە بەرهەمهێنانی شیعری بێگەرد ئەفسوونی هەموو سەردەمەکان و بەگەڕخەری هێزی ژیانە. لێکدانەوەی شیعر یەك لەو گوناهانەیە، کە لێخۆشبوونی بۆ نییە، لە لەدەستدانی ئەزموونی ئێستێتیکای بەشێك لە نووسینی کوردی، لە لێکدانەوەی ئەم وێنە شیعرییەم داوای بووردن لە گیانی بەهێزی ئەم گوناهە دەکەم، ڕەنگە خوێنەر هەندێك جار تێگەیشتنی بۆ دەق بگاتە ئاستی تێگەیشتنی نووسەرەکە و قووڵتریش بچێت.

دەقی من کەم تا زۆرێك هۆشیارییەکی جیاکاری هێناوەتە گۆڕێ و لەناو کولتووری کوردییەوە هاتووەتە بەرهەم، ڕەنگە هۆیەکەشی ئەوەبێت ویستبێتم لەناو ئەم کولتوورەدا هەوڵ بۆ خۆبوونی خۆم بدەم. ئەم وێنەیەش

بەرهەمی بیری گەرمی منە، خەیاڵی شاعیرییەتیم لە هێنانە پێشەوەی منداڵی تاقی کردووەتەوە.

یەك لە جەژنەكانی هەفتایەكان، جەژنانەكانم پەنجا فلس بوو، لەگەڵ یەك لە كوڕەكانی مامم چووین پەنجا فلسەكەمان خستە سەر هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر بەو نیازەی، كە بەسەریدا بڕوات پەنجا فلسەكە گەورە دەبێت و فۆرمی سەد فلسی وەردەگرێت. بە ئەنجامی ئەو كردارە دەتوانین چێژ زیاتر لە جەژن وەربگرین. كەچی بە شێوەیەكی وا هەردوو دیوی پەنجا فلسەكەی سڕیبووەوە شوێنەواری پارەی پێوە دیار نەما. جا شەمەندەفەر لە چێژی جەژنێك بێبەشی كردووم و چێژی ساتێك لە منداڵیی كوشتووم.

لەم وێنەیەدا سڕینەوەكەم وەك كاردانەوەیەك كار پێ كردووە و جووڵاندوومە. بەلای زۆرێك شەمەندەفەر هۆی گەیاندن و گەشت و خۆشحاڵییە، بەڵام لە دید و دیدگای ئەو كاتی من وەك دڕندەیەكی ترسناك تەماشا دەكرا، هەروەها وەك وێنەیەكی ڕووبەڕووبوونەوە و گرژبوون بەكار براوە. شەمەندەفەر هاوتا كراوە بە كەسایەتیی دیكتاتۆر و جووڵێندراوە، كە هۆی نەشونماكردنی ژیان و زمان و نیشانە دەسڕێتەوە.

هێزی خود لەم وێنەیەدا دەسەڵاتدارە، دەقئاوێزانییەكی نیشانە ناسیشم لەنێوان هێزی نووسین و هۆشمەندیی كۆمەڵگەدا دۆزیوەتەوە. دۆزینەوەی ئەم دەقئاوێزانییە لە كێشەی ڕەخنەنووسێك نییە، كە خاوەنی پرۆژەی دۆزینەوە نەبێت.



شوێن و هێما و هێزی خودی چالاك لە دەربڕینەكانمدا وێنەیان زۆرە، بەڵام تا بڵێی پڕ سروشی هەمەچەشنی مرۆڤ و شێوە و شێوازی تەقینەوەی خێرا.

لەبارخراپی كێشە و گرفتی ڕەخنەی ئەدەبی كوردیدا هەندێك لە نەوەی پێش خۆم و نەوەی دوای خۆمی گوێڕایەڵیان، بەهەوڵی گروپێكی لێك نزیك، نووسینم لەبارە ڕێك دەخەن. بە ئاشكراش كار بۆ ئەم هاوكارییەیان دەكەن. گروپ دووبارەكردنەوەی ڕەفتاری خێڵایەتییە، بەهەمان جۆر و دەستووری سەلەفییانە بەڕێوە دەچێت. هەر خەوندیدەیەك ئەفسانە و ناوەندێكی زاڵ و كاریگەرە لە نووسیندا، ئەو ئەقڵییەتە كۆنخوازانەی بڕوایان بە بیركردنەوەی ئەوی دی نییە. ترسی هەڵوەشانەوە وەك عەلیشیشی گیڤبووەوە دەیانباتەوە ناو قەبارەی سروشتیی خۆیان. كەواتە دژایەتیكردنەكە بە سروشتی و تۆماركردنی ناكۆكیی ئەوی دی وەردەگرم. نووسەر بینینی ژیان و سەیری دنیاكردنی بووە كۆنترۆڵكردنی ئەوی دی لەگەڵ دەروون و بیركردنەوەی خۆی گەیبووەتە كۆتاییەكی بێزراو. نووسەرێكیش لەگەڵ خودی خۆی گەیشتە كۆتایی، گوڕنەتەڵە و مردۆخە، پێویستە بچێت داوا بكات لە خانەی پیر و پەككەوتووەكان ناونووس بكرێت. بگرەوبەردەم لەگەڵ ئەوی دی نییە، بینینی ژیان و سەیری دنیاكردنم لەگەڵ دەروون و بیركردنەوەی خۆم هەمیشە لە ئەزموون و نیشانە ناسیدایە. گروپ دەستكردی دەسەڵات و هێزی باڵا دەستی سیاسییە. كار پێكردنیشی بە نیازی ڕێ پێ بزركردن و دوچاری گرفتكردنی ئەوی دی خۆی ترسێكی كەمەرشكێنە لە ئەزموونی پڕ شایەن بە ئاماژە، باوەڕ پتەویشم

بەهێزی خەونبینیم بۆ نوێیەخشی، وا دەبینم یەك یەك دەگلێن و ڕووبەڕووی داهێنان شەرمەزار و چاو بەرەوژێر دەبن. خاوەن پرۆژەش دەبێت بە خاوەنی ئەو سەروەرییە بێدەنگەی کە دەقە، هەروەها جیاکاریی نەوە جیاکارەکانیش بە دیاردەیەکی تەندروست دەزانم و ڕێزی لێ دەنێم، بەڵام بێز لەو بارە ناسروشتییە دەکەمەوە لەسەر بنیادی ڕوانین دروستی ناکەن و ئیرەیی و حوکمی پێشینەی بێ سوود بەڕێوەی دەبات. بە هیچ جۆرێکیش بیرم لەوە نەکردووەتەوە هێڵی هاوبەشی خۆم لە شیعری کوردیدا جیا بکەمەوە، بەڵام هەردەم ئەو بیرکردنەوەیە دەمخواتەوە، کە هەنگاوێکی چوست و بنچینەیی دیکەم لە ئەزموونی قەناعەت پێهاتووی خۆم. لە هەموو ناوەندێکی بە گێچەڵیش دوور دەکەومەوە، سەرگەرمی بەدیهێنانی خەونی نووسین دەبم.

لە سەرجەم دەقەکانیشدا ئاراستەیەکی خەونیم دەربڕیوە، خەون سروش و سروشتی پێغەمبەرانە خوا دەیدات بە کەسی پەیامدار. من وەك کەسایەتیی خەونێکم لە شیعرەوە بەرهەمهاتووم، خەونیش ڕادەگەیەنم. نادیارییەك لە خەوندا هەموو گەمارۆکانی شکاندووە، نووسین ڕاوی ئەو نادیارییەیە. خەون درەوشانەوەی واقیعە، زمان لە دەقی خەونیدا ئامرازی گەیاندن نییە، ئامرازی سروش و چالاکیی وێنەیە. ئاسانە بگەیت بە ئەوی دی، بەڵام ئاسان نییە بگەیت بە خودی وریای خۆت، کە گەیشتی بە خودی وریای خۆت، دەرەوە و ئەوی دی بەلاتەوە دەبنە شتێکی لاوەکی، یان زۆر لاوەکی. گەیشتووم بەو قەناعەتە ڕەهایە تەمەن و کات هەر هێندە بار و بوار و ماوەم دەدەن بزانم من چیم لە ژیان دەوێت، بە گرینگیشی نازانم، بزانم دەرەوە و ئەوی دی چییان لە من دەوێت.



ئیلتیزامم بە بڕوا هونەرییەکانی خۆمەوە هەیە، کولتووری تایبەت بە خۆشم هەڵبژاردووە و کاری پێ دەکەم. هەستیش دەکەم کۆمەڵگەی ئێمە چووەتە ناو نەریت و ڕابردوو، پێویستە دەربهێندرێت.

## خوێندنەوە

شێوازی خوێندنەوە بەشێك لە بەهای چێژی لەناو خۆیدا هەڵگرتووە، سەرەنجام ئەم گواستنەوەی چێژەش دەبێتە بەشێك لە ڕۆشنبیریی گوێگر.

شیعر وەك دەق، شیعر وەك شێوازی خوێندنەوە. دوو یەکەن لە یەك سەرچاوەوە پەرەیان نەگرتووە.

وەك دەق دەسەڵاتی جوانی و بیرکردنەوە لە چێژدا دروست دەکات.

وەك شێوازی خوێندنەوەش، دەنگ و جووڵە و هێماکانی دەست و ڕوخسار ڕۆڵی جوانی و بیرکردنەوە دەگێڕن و دروستی دەکەن.

ئەزموونی شیعر خوێندنەوەی ناو هۆڵ و بەر میکرۆفۆنم هەیە، بەڵام شێوازی خوێندنەوە و دەنگ و جووڵە و هێماکانی دەست و ڕوخسارم پەیوەندیی خۆی لەگەڵ گوێگر نادۆزێتەوە، نەتوانینی گواستنەوەی مانا و جوانی لە نائاگاییم دەجووڵێت و مەوداکانی بیرکردنەوەی خۆم لەگەڵ مەوداکانی چێژی گوێگر سەرچاوەکانیان تا ڕادە و ئاستی ڕژانە ناویەك لێك نزیك نابێتەوە.

شیعر شوێنی ڕاستەقینەی گرتووە. چڕبوونەوەی چێژی کۆمەڵگەی کوردیش لە شیعردا بووەتە ناوەند. هیچ هونەرێکی دی هێندەی ئەم بەشە پەروەردەی چێژی کۆمەڵگەی نەکردووە. هەندێك خورپەی بزربووی ناخ

هەن، ڕەگەزەکانی دیکەی ئەدەبی نایدۆزنەوە. تەنیا شیعر لەباری دەروشانەوەیدا دەتوانێت بیاندۆزێتەوە. نووسین و هونەر ئاراستەیان بەرەو ژیان و چێژە، بەڵام کردەی داهێنانی پەتی، ستایشی ژیان نییە لە پێناوی چێژدا، تێڕوانینی نوێ لەبارەی ژیان و چێژ دەخولقێنێ و دەیکاتە قەناعەتی مرۆڤ، مرۆڤی نوێیەخش و بەخشندەش ڕازەکان دەدۆزێتەوە.

## تێپەڕاندن

به هیچ شێوەیەك بڕوام بە تێپەڕاندن نییە، بگرە بڕوام بەگۆڕان و جیهانبینیی جیاکار هەیە. تا ئێستاش نەمتوانیوە بڕوا بەوە بهێنم نالی، باباتاهیری تێپەڕکردووە، هەروەها گۆران جەستەی شیعری کلاسیکی بەتەواوی جێ هێلاوە. ئێمەمانانیش خالّی جیابوونەوەی ڕەهامان لەگەڵ نەوەی پێش خۆماندا نابێت. دەقئاوێزانییەکی بەهێز لەنێوان هەموو نەوەکاندا ئاشکرایە و لەوانەی دوای ئێمەمانانیش بەردەوامیی دەمێنێت. وا دەبینم هەر ڕۆژ و ڕۆژگارێك جیهانبینی خۆی بەسەر کەسی خاوەن جیهانبینی ڕۆشنکەر و هێمای هەمەچەشن دەسەپێنێ. وەك چۆن هەموو وەرزێك بە فراوانی سەیری ئاو و هەوای تایبەت بەخۆی دەکات و دەیسەپێنێتیش، ئەم ئاو و هەوایەش کەم و زۆرێك کاریگەریی بە بارستی خۆی بەسەر نەشونمای درەختەکان جێ دەهێڵێت. ئەوەی تێبینم کردووە نەوەی پێش ئێمە ستوونی ژیانیان هێنایە ناو شیعر و ئەزموونیان کرد. ئێمە ستوونی و ئاسۆیی و بازنەیی ژیان و خەیاڵ و خەونمان هێنایە ناو شیعر و فراوانتر ئەزموونمان کرد و دەروشاوە و دەوڵەمەندتر ناساندمان.



نەوەی دوای ئێمەش کۆمەڵێك جیهانبینیی زیاد دەکەنە سەر قۆناغی شیعری ئێمە. ئەمە یاسای ژیانە و دەبێت قبووڵمان بێت. قبووڵکردنی ئەم هەقیقەتە ناوەندێکی چەسپاوە لە بڕوابەخۆبوون و هەقیقەت بینین و دیاردەکانی پێوەندیدار بە چییەتی بوونەوە.

پرۆژەی تێپەڕاندنم نییە، زیاتر خەوندیدەی پێکهێنانی هێماکانی خۆمم، شیعرییەت سیمای ڕوونی گشت نەوەکانە و شانەیەکی زیندووی زۆر قووڵە لە جەستە و پێکهاتەی مرۆڤدا.

دەقئاوێزانی دەتگەیەنێت بە فۆرمی ڕۆشنبیری و بیرکردنەوەی چالاك و دەتدرەوشێنێتەوە. ئەگەر ڕۆشنبیرییەك دەقئاوێزانی لەگەڵ گیانی بەهێزی ڕۆشنبیریی دنیا نەهێنێتە ئاستی هەست پێکردن، نەیتوانیوە لە پێوەندی و گفتوگۆ و بیرکردنەوەی ئەوانی دیکە ببێتە کەسایەتییەك بتوانێت زانستی ژیان کۆ بکاتەوە. ڕۆشنبیرییەکیش نەتوانێت ببێتە کەسایەتییەك زانستی ژیان کۆ بکاتەوە، لەناو ڕۆشنبیریی دنیا خەیاڵی باش بەڕێوە نەچووە.

لە بەرزبوونەوەی هێڵی هونەری دەتوانێت لەناو ڕۆشنبیریی دنیا نیشتەجێ بێت و لە گەڕان بۆ بنەڕەتیش چالاك و بەرهەمدار بێت، خەسڵەت و ئاسۆی خۆبوونی بدۆزێتەوە. چرکەساتی خۆبوونیش، چرکەساتێکی چڕە لە ژیاندا.

## بەهرە

لە دامێنی هەر دەقێکم، مێژوویەك تۆمارکراوە، بڵێی بڕوام بەوە هەبێت نووسین هەڵچوون و کاتی تایبەتییە، یان بەهرە و سروش ماوەیەکی دوور و درێژ بەردەوام بەشدار و هاوکارم بن لە نووسینی بەشە پێکهێنەرەکانی دەق. لەو تەمەنەی نووسیندا، کە نزیکە چارەگە سەدەیەکە بەکامی دڵ لەناو سنوورەکانی لە هاتوچۆدام. ڕاوی چەند دەقێکم کردوون، ئەوانەی نووسیویشمن هێشتان لە نووسینیان تەواو نەبوویمە و نەگەیشتووم بەدوا دارشتنیان. بڕواشم وایە بەهرە و سروش کار لە ئامادەبوونی نووسەر دەکەن بۆ کەشی خرۆشان، بەڵام وەك هاندەر و خورپەیەکی شاراوە نەك شتێکی بنەڕەتی و تەواوکەری بنیادی بەردەوامیی نووسین، لە نووسیندا زیاتر تێڕامان و خەون و ئێستێتیکای ویژدانی بە پلەی یەکەم کاریگەری و بەشداریی بەردەوامیم دەدەنێ. ناخی وریام ئامادەی بنیادی بەردەوامیی نووسین دەکەن.

سەرەتاکانی نووسین لە هۆشیاری و یاداشت و خەونمدا ئامادە دەبێت. چاوەڕوانی کەشی نووسین دەکات. لەوانەیە ئەم کەشە چێژبەخشە شکۆ و بەهرە و سروشی نووسین بێت و بنەماکانی بەڕێوە ببات. تا ڕادەیەکی زۆر باش نووسین پێویستی بە ژیری هەیە تا دەستت بەسەر ئامرازە هونەرییەکاندا بشکێت و ئەفسوونی نووسین بەهۆی بەهرەیەکی پەروەردەکراودا بەجێ بهێنێت.



## خوێنەر

لەناوەوەی خۆم بە بۆچوون و تێگەیشتنی زاهیدێك ژیانم هەڵبژاردووە و بە چاوی چاکەخوازی سەیری شیعری کوردی دەکەم و شیعری مرۆڤدۆستانەشم خۆشدەوێت، شیعر هەڵگری وزەی ژیانە. لەناو شیعریشدا ژیان دوچاری نەسرەوتن و هەندێك جەنگی پێویستی کردووم. بوێرییەکانی ڕووبەڕووبوونەوە بەرانبەر ئەو مەترسییانەی لە لەناوچووندا دەبن بە هەست، کتێبی دەگمەنن هەوڵ دەدەم تێیان بگەم، دواجاریش بیاننووسمەوە، ئەو ژیانەم لا جوان و پەسەندە، هەست و خەون لەناو دەقی شیعریدا دەیکەنە ئاماژە و ئاخاوتن. لە ئاخاوتندا لە خاڵی هاوبەش نزیك دەبینەوە، یان دەگەین بە وەڵامێك بۆ ئاخاوتن. خەون و یادەوەری لە سێبەریدا بە یەکتری دەگەن و دەبن بە واقیعێك لە واقیعەکانی بوون. لەنێوان پەسندکردن و ڕەتکردنەوەی خوێنەرانی هۆشیار و خوێنەرانی ئاساییدا نووسین لەکوێ خۆی دەدۆزێتەوە. جیاکاریی نێوان خوێنەری زۆر و جەماوەر ئاشکرایە. قۆناغی شیعری کلاسیکی کوردی پڕ خوێنەرە، بەڵام جەماوەری نییە.

ئەو مشتومڕە لەنهێنی ئەو دەقانەدا بە دەست دەکەوێت وەك سەرچاوەی چێژبەخش پێویستمان بە خوێندنەوەیانە. پێوەندییەکی دڵخۆشکەریان لەگەڵ مووچڕك و تەزوو و خورپەی شاراوەی ناخ پێکهێناوە.

من یەك بەباری خۆم، کە پەستی دامدەگرێت و لە هەموو دنیا بێ ئومێد دەبم پەنا بۆ دیوانی مەحوی، جاروباریش بۆ دیوانی دیلان دەبەم، ئامادەم دەکەنەوە بۆ گرینگیدان بە هەموو بوارەکانی ژیان. یان دەگەمە فۆرمی گەیشتن بە هەموو شتەکان. هەر هەموو ئاستێکیش ڕێز لە ژیان دەنێت و هەوڵی بەرەو پێشەوەی و ئایندەی باشتر دەدات، هەریەکیش بە تێگەیشتنی خۆی چێژی لێ وەردەگرێت. نووسەریش لەسەر بنەما و فراوانبوونی مەوداکانی

زمان و هێشتنەوەی بە زیندوویێتی ئەو متمانەیەی دەبێتە خەونێکی بەدیهاتوو، لە خەونەوەش دەست پێ دەکاتەوە. من خەونم هەیە، لە خەونەکانمدا دەست پێ دەکەمەوە و دەچمە ناو مەوداکانی بیرکردنەوە و نووسین.

## وشە

وشەی خەون و منداڵیی و مردن، بێئاگاییم دەجووڵێنن و لام دووبارە دەبنەوە، دەبێت لە پەرەسەندنی خۆیاندا قسەم لەبارەیانەوە هەبێت و چوارچێوەکیان بۆ بگرم، فەزا و ڕەگەزی ئەم وشانە دیدگای منیان دیل نەکردووە زیاتر بەلای خۆیاندا بەکێشیان کردووم. لەناو مندا ڕەگیان وریایە و بەگەشەکردنم ناساندوون، کەش و هەوان بۆ ئەزموونی خەونیم، لە شیعردا ئیلتیزامم بە فەزای بوونەوە هەیە، نەك فەزا و ڕەگەزی وشە. بوون لە دەقدا دەبێتە شەپۆلی مانا و جوانی و شیعرییەت. شیعری من مەبەستی مێژوویی تێدا نییە. داڕشتنێکی بوونی و خەونییە. کار لەناو خەون دەکەم بۆ دروستکردنی جیهانبینی، خەون و منداڵیی و مردن پرسیاری ئەزەلین بەدرێژایی مێژوو، نەکراوە وەڵامێکی ڕەها بۆ پرسیارەکانی ئەزەلییەت بدرێنەوە، هەر وەڵامێکی دەبێتەوە کۆمەڵێك پرسیاری دیکە. دووبارە نیاز و کەڵکەڵەی گەڕان و دۆزینەوە گەرم دەکەنەوە، دەمانخاتە بەردەم ئازادیی دەربڕین، خەون و خەیاڵمان دەجووڵێنێت، دەکرێت ئەم پرسیارە دوابخرێت بۆ دوای کۆتایی زەوی، یان دوای دۆزینەوەی بزەی مۆنالیزا و بەختیاری تا هەتایی، بڕوا بە بەختیاری تا هەتایە کاریگەرترین و بەپیتترین ناوەرۆکی مێژووی گیانی پێکهێناوە.



## لایەنگر

بەلامەوە گرینگە هەموو ئاستێك ببێتە لایەنگری دەقەکانم، یان نا. بەهای سەربەستی شوێنی نووسینی لە جیهان دۆزیوەتەوە، بە تەواوی مانای سەربەستی، سەربەستیم لە جۆری بیرکردنەوە و هونەری نوێ و چێژی نووسین بۆ خۆم دابین کردووە، سەربەستی لەناو هەستیاریی نووسین دەتوێنمەوە، کەسی دووەمیش بەهەمان سەربەستی بەڕێوە دەچێت. منی وەك نووسین بەلاوە گرینگە، یان نا. ئەو قەناعەتەشی لا وێنا دەکەم بە هەموو توانای گیانی و هێزی ئەقڵیمەوە ئاماژەکان بە دەربڕین و ناوەندی بەرهەمهێنان دەگەیەنم، بارێکی گیانیش لەناوەندی نووسین چێژی هاندانم دەگەیەنێتە پلەی توانەوە و تێکەڵاوبوون بە زۆرێك لە شتەکان. هەوڵیش دەدەم ژیانی چێژدار و بەجوانی پەیوەست بخزێنمە گیانی ئادەمیزادەوە. ئادەمیزادیش بگەڕێنمەوە باری یەکەمین فڕین. ئێستێتیکای هاوبەش و ڕۆشناییەکانی ناو دەق دەکەمە هونەری لێکدانەوە و تێگەیشتن بۆ پەخشکردنەوەی ڕۆشناییەکانی خەیاڵ و ئەندێشەی وەرگر. وابەستەی کولتووری پڕ چالاکیی کوردیم، ئەو کولتوورەی پەیوەندیی بەهەر هەموو کۆمەڵگەوە هەیە. بەرهەمی هۆشمەندییەتی، کەواتە ئێمە ناوەرۆکی گشتیی کولتوورین. تێکۆشانێکی سەخت دەکەم ناوەرۆکێکی دەوڵەمەند و بە پیت و فەڕ بم.

کولتوور بەو بارە زیندووەی خولقاندویەتی، بەناوبانگترین جۆری دەربڕینی ڕۆشنبیرییە. تا پاشەڕۆژێکی دووریش هەر بەو شێوە چالاکەی دەمێنێتەوە. مامەڵەی من لەگەڵ نووسیندا مامەڵەی ئیماندارە لەگەڵ

خودا و سەرچاوە. خودا و سەرچاوەش دەبنە پرسیار و گفتوگۆ، پرسیار لە چییەتی بوون و نەبوون و شوێنەزا. دواجاریش دەمەوێت بزانم ئەو دۆزینەوانە چین، کە پێیان گەیشتووم، پرسیار و گفتوگۆمان چۆن بوونەتە یەکانگیربوونەوەی ئاسۆکانی ناوەند و نووسینیان لێوە درێژ بووەتەوە.

## شێواز

جوانی لە سادەیی و قووڵبینی دەخولقێت. لێڵیش شتە سادەکان لەناو دەبا و دڵی جوانی تێدا هێور ناکرێتەوە. بەشێك لە هەشتایەکان لە بنیادی قووڵی تەمومژدا کارم کردووە، تەمومژ لە ئەنجامی جوانیی زمان دروست دەبێت، لێڵیش لە ئەنجامی بنیادی ڕووکەش و هەڵەی زمانەوە.

نموونە بێزمانێك دەچێتە لای مرۆڤێك، داوایەك دەخاتە ڕوو. بێزمانەکە لای خۆی مانا و لێکدانەوەیەکی بۆ داواکەی هەیە و دەزانێت چی دەوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕوونیی زمانی نییە. ناتوانێت داواکەی لە بەرانبەر بگەیەنێت.

شاعیر هەن ڕوونیی زمان و جیهانبینییان نییە. لە دەروون و هەستی یەکئاستیی خۆیان مانایەکیان بۆ نووسینەکەیان داناوە، بەڵام ناتوانن ئەم مانایەیان بە شێوازێکی ڕوون لە بەرانبەر بگەیەنن، لێڵی ئەم نەگەیشتنەیە.

ژیان خۆی پڕە لە شێوازی گۆڕان و جموجووڵ تەنانەت ڕەنگی سروشتیش گۆڕان لە خودی خۆی پەروەردە دەکات. درەخت لە پارچە زەوییەکی بچووکدا کەش و هەوای نەشونما وەردەگرێت، هەموو ساڵێکیش گەڵاکانی خۆی لەناو دەدا و هێمای ڕوون و شێوازی گەڵا نوێیەکانی دەکاتە کردەیەکی ڕاست. یەك



شێوازیش لە ئەزموونی خەوندیدە و وێڵی دۆزینەوەی ژیانی بە پیت و دەسەڵاتدار نابێت. مانەوە و کارکردنیش لەناو شێوازێك تانوپۆی داهێنان هەڵدەوەشێنێتەوە، هەموو سەربەخۆیی و دەسەڵاتێکی کەڵکێشیش زەوت دەکات، گیانی بەردەوامبوونیش دادەڕزێنێت. ئەو شێوازەی لە ناوەڕاستی هەشتایەکانەوە ئەزموونم کرد، هەوڵم دا لەو ئەزموونەدا کار لەناو مانای زمان بکەم و مانای بابەت بمرێنم.

ئەزموونێك بوو، ویستە هونەری و کەڵکێشییە زمانەوانییەکانم تێیدا پێشکێش کرد. دوای ئەم پێشکێشکردنەش خواستی گۆڕان لەناوەوە هەژاندمی، هەستم کرد کارێکی دیکە هەیە بۆ کردن، دنیایەکی دیکە هەیە بۆ بینین و شێوازی ژیان. کاتێك ڕێگا بەخۆم دەدەم ئەزموونێك واز لێ بێنم و سەرگەرمی ئەزموونێکی دیکە بم، دیارە وەك ئەزموون گەیشتوومەتە دوا ئاستی و لام تەواو بووە، ئەگەر لەناویشیدا بمێنمەوە دووچاری خۆدووبارەکردنەوە و پێکوتە دێم، خۆدووبارەکردنەوە و پێکوتەش کەشی نووسینم لەبەرچاو دادەخەن، لەو بار و بوارەدا هێزی خود و ڕستە کاریگەرەکانی مرۆڤی نوێیەخشیش بۆ جوانی و ژیان بێ کاریگەر دەبن.

## ڕاگەیاندن

ڕاگەیاندن کەناڵ و ناوەندێکی خزمەتگوزارە بۆ کردەی ڕۆشنبیری. لەناو ڕۆژنامەوانیی کوردیدا گەیشتووم بە ئەزموونی بەپیتی زۆرێك لە نووسەرانی کورد و سوودمەند بوومە بە بیر و بۆچوون و فۆرمەکانیان. لەلایەکی دیکەشەوە هێندەی لە بەشێك لە ڕۆژنامەوانی بە ناهەق لەبارەی

منەوە نووسراوە، هێندە بەهەق لەبارەی ئەهریمەنەوە نەنووسراوە. سەرەڕای ئەمانەش بەبێ هیچ هۆیەك بە مەبەست و هەڵەی ئەنقەست ناوم لە لێکۆڵینەوە و چاوپێکەوتنە ئەدەبییەکان دەسڕنەوە. بەشێك لە ڕۆژنامەوانیی کوردی هەوڵی تێدا دراوە هەقیقەتی شیعری من بشێوێنێت. لە ڕۆژگاری ژیاندا ئەوانەی لە چێژی باوەوە تەماشای ڕستە کاریگەرییەکانی ژیان دەکەن تاوانکارن، نوێبەخشەکانیش قوربانیی ئەو هێزە باڵادەستانەن، کە تاوانکاران دەجووڵێنن و ئامادەیان دەکەن بۆ بەجێهێنانی مەرام و تاکتیکە سیاسییەکانیان، دیمەنە سادە و کاریگەرەکانی ژیان وەردەگرم بە تێکەڵاوکردنی فۆرمەکانی گەیاندن چەند ئاستێکی زمانەوانیی شیعرییەتی تێدا دەکەمە ستوونی تایبەتکردن و درەوشانەوە. وەك دەقی بە ئەدەببوو دەیخەمە بەردەم کۆمەڵێك نیشان و پرسیار، شتە سادەکانیش بەردەوام لە سروتی تایبەتی و دانایی لەناو خوڵقاندنی نووسین زانیاری ویژدانی و گەرمایی هەستەکانن. بوونمان لەناو خۆیاندا لەپێناو ئایندەی باشتر بەرجەستە دەکەن تا لە ژیان کاریگەری و کردەوەی خۆیان نیشان بدەن.

## تێڕامان

بێدەنگی لە قووڵایی نەزانراودا پێوەندی دیکە لەگەڵ ژیان دەدۆزێتەوە، پێوەندییە ساردبووەکانیشی لەگەڵ واقیع زیندوو دەکاتەوە. هەندێك شت لە واقیع وەردەگرێت، لە بیرکردنەوەی ڕێکی دەخاتەوە و ئامادەی گوتنی دەکات. پێکهاتەی سروتی کەسایەتیم لە نیشتەجێبوون



لەسەر زەمین بۆ خۆ گونجاندن لەناو سەرچاوەکانی ژیان وا هەڵکەوتووە. ئاخاوتن لەناو دەق دروست دەکەم. لە قسەکردن خودی ئامادەکراو دێتە پێشەوە، لە ئاخاوتنی ناو دەقیش ئەفسوونی خودی وریا و هۆشمەند. ئەگەر زۆر بدوێم تێڕامانی ناوەوەم دەکوژێت و بنیادی ئامادەبوونی بەردەوامیی نووسینم دەشڵەژێ، ئەفسوونی خودیشم بەتاڵ دەبێت. زۆر دوان تەنیا بۆ کەسی سیاسی گونجاوە، بار و بوار بۆ گفتوگۆ لەگەڵ ئەوی دی دروست بکات، نووسەریش بار و بوار بۆ تێڕامانی تاکییەتی و هەستەکانی خۆی دەستەبەر دەکات. خۆم بە تێگەیشتن لە کرۆکی ڕۆژگار و بێباکی گرتووە، پرۆژەکانم بەهۆی زمانەوە پەرە پێ دەدەم، نازانم ئەوەی نووسیومە باشە، یان نا. بەڵام بەو ڕاستییە گەیشتووم پێویستە لە هەوڵی تێڕامان و بێدەنگی بەردەوامبم.

بێدەنگی لای من مانا قووڵەکانی خەون ئاگادار دەکاتەوە و پرسیاری ژیان و بوونی هەیە.

## گفتوگۆ

هەمیشە خۆم لە گفتوگۆ و دیمانە ڕۆژنامەوانییەکان بەدوور گرتووە، ئەو دەسکەوتانەی لە بار و بواری شیعرەوە بە دەستم هێناون، دەکرێ بکرێنە جێگرەوەی هەموو گوتن و نووسینێکی دیکە. هیچ نیازێکی گوتنیشم نییە لە دیمانە ڕۆژنامەوانییەکان بیکەم بە ناوەندی دەربڕین و درکاندن. هەموو ساتە هۆشیاری و نهێنی و درککردنەکانی تانوپۆی نووسینیان چنیوم لە هەناوم خۆیان ڕاپسکاندووەتە دەرەوە و لە

دەقەکانم درکاندوومن. خۆ تەرخانکردنیشم بۆ بەرهەمهێنانی دەق بەلاوە گرینگ و ناوەندە. دەق پێوەندییەکان جوان دەکات، فۆرمەکانی دەروونیش دەگۆڕێت. سەرەتا شتە گشتییەکان دەدۆزمەوە. دواتر گیانی بزێوی شتەکان دەنووسمەوە و هەستی تێدا دەخولقێنم.

نووسین و قسەکردن لەبارەی شیعر بە کردەی دۆزینەوە تێ ناگەم، زیاتر گواستنەوە و گەیاندنە. هەوڵ دەدەم خۆمی لێ بپارێزم، لەگەڵ ئەوەش لە هەموو بابەتێك پتر تامەزرۆی خوێندنەوەی دیمانە ڕۆژنامەوانییەکانی شاعیرانی بە ئەزموون و ژیننامەی کەسایەتییانم.

تێڕوانین و زۆر وردبوونەوەش لە شیعر دەمانباتەوە بۆ سەردەمی لەدایکبوونی یەکەمین مرۆڤ. نووسین ناتوانێت لەبارەی یەکەمین مرۆڤ ڕستەیەك بەهێز بکات، تەنیا لەرزەی گیان دەتوانێت لەناویدا وردبێتەوە و بگات بەباری تێڕامانی یەکەمین مرۆڤ.

تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ هەولێر



## شیعر و چالاککردنی هەستەکان

## مانیفێستی شیعری

سەیرکردن دەستپێکێکی پڕ بەهایە و یەکەم ورووژان لەوێوە دەست پێدەکات. دەتوانم ڕۆژێ چەندان کاتژمێر بەرانبەر خاڵێك بوەستم و هەموو هەستەکانم بەکار بهێنم. بۆ ئەوەی بزانم ئەم خاڵە چۆن و بەسەر چیدا دەکرێتەوە. لە هەر ڕۆژێکدا چاوەڕوانی زۆری ڕووداو دەکەم بۆ زانین، بەلام بۆ سەرناسین و بە مانا و دیمەندارکردنی ژیان لە ئاسۆ و دوورییەکانی شیعرەوە چاوەڕوانی ڕوودانی خەیاڵی خۆمم و سەرچاوەی سروش و پەیامی بەهرەش لەبەرچاو دەگرم. هیچ ڕۆژێکیش لە بوونم تێ نەپەڕیوە بەبێ ئەوەی تێیدا بیر لە شیعر و چێژە مەستکەر و سروشهێنەرەکانی نەکەمەوە و خەباتی گیانیی بۆ نەکەم. مەرجیش نییە نووسیبێتم.

دەشزانم هەندێك کپیی خود و گیانی مرۆڤ لە ئارادان تەنیا شیعر لە توانایدا دەبێت شتیان لەبارەوە بڵێت و پرۆژەی جوانناسییان دامەزرێنێ، پاشان بۆنی ناتەواوی گەردوون بکات.

کاریگەری و خەسڵەتی ناساندنیان لە شیعرییەتدا خەست بکاتەوە بۆ زادەی توانا و گەشکردنەوەی بیرەوەری، لە هەمان هێڵدا خرۆشاندنی خاڵی پێکهێنەری بیرەوەری لە ئاگاییەکی ڕووندا، یان گەوهەرێك لەو بۆشاییە

هەڵداتە ئاسمان، کە لە خود و گیان پەیدا بووە، خود و گیانی داهێنەریش هەمیشە لە بۆشاییدا لەگەڵ ئاسۆیەکی گەورەتر لە ئاسۆی واقیع سۆسەیەتی. ئەمە کێشەیەکی گرینگە لەمێژە مرۆڤی هەستیار پێوەیەوە خەریکە و گرژیی هەستەکانی تێدا خاو دەکاتەوە.

پرسیارێك لەمێژە بووەتە مایەی سەرسوڕمانی باڵندە ناسەکان، ئایا بۆ هێزی باڵی باز بۆ بەرزبوونەوە لە هێزی باڵی قەتێ بەهێزترە، هێزی باڵی قەتێش بۆ نیشتنەوە لە هێزی باڵی باز بەهێزتر لەنگەر دەگرێ. بەرزبوونەوە و نیشتنەوەش دوو ئاراستەی سەرەکین بەهرە و بەرهەم لە ژیان وەردەگرن.

شیعری ڕاستەقینە جەستەیەکی تەواوە، خانەکانی جەستەی مرۆڤ چەندە پێوەندییان پێکەوە هەیە و وزەیان دەڕژێنە ناو یەکترییەوە، هونەرەکانی شیعر هێندەش زیاتر هەڵدەڕژێنە ناو یەکدی و شیعرییەت لە جەستەی دەقدا پێك دەهێنن.

لەمێژە ئەم بۆچوونە باوە دۆخێکی نەگۆڕی گرتووە و هەستەکان هەڵدەبزرکێنێ.

دەگوترێت: شیعر دەربڕی گیانی سەردەمە. من خۆم لەم بۆچوونە جیا دەکەمەوە و ڕادەگەیەنم شیعر دەربڕی هێز و گیانی سەردەم نییە. چونکە پێکهێنەری هێز و گیانی سەردەم کۆیە و شیعریش هێز و گیانی تاکی جوانیبەخشە. بەشی زۆری هێز و گیانی کۆ توندوتیژی بەرهەم دەهێنێ و خۆی بە دەسەڵاتەوە گرێ داوە، هێز و گیانی جوانیبەخش هێز و گیانێکی



گەرم و نیان و خۆ بەدوورگرە لە دەسەڵات و توند و تیژی. بۆیە ئەم دەربڕینە هەڵەبەرە و پێویستە گومانی بخرێتە سەر.

چرکە دەگمەنەکان بیرەوەری بەرهەم دەهێنن. شاعیر یارییە جیاکانی بیرەوەری و ئەدەب ئەزموون دەکات، بەو مانایەی شیعری فرە دەنگ و نوێبەخش تانوپۆی لەناو هەموو لکەکانی ئەدەب و نووسین دەچنێ و خۆی لە دیوی نهێنییان تاقی دەکاتەوە، پنتی باڵای لك و نهێنییەکانیش خەملاّن و چالاککردنی هەستەکانن، لەم بارەدا وەرگر وەك توخمێکی زاڵ و کارای نووسین ئیش لە کەش و کایەکان دەکات.

هەمیشە ویستوومە کارەکتەرێکی چالاك بم لەناو شیعردا نەك وەرگرێکی تەمبەڵ و گوێڕایەڵ، کە بەشێکی زۆری شیعری کوردی کەسی تەمبەڵ و گوێڕایەڵی بەرهەم هێناوە. چونکە بەهرە و سروشی لە سروشتی تەمبەڵ وەرگرتووە و نەچووەتە ناو گەردوونی چالاك و پڕ کار و بە زەبر. ڕێکەوتم کردووە لە هەموو جووڵەکانی سەر زەمین ڕاماوم و شیعرم نەدۆزیوەتەوە، بەڵام بلقێکی سەرئاو هێڵەکانی بیرکردنەوەی جووڵاندووم و دۆخێکی بۆ دروست کردووم خولیاکانی نووسینی تێدا بەدی بهێنم، شیعر هیچ خاڵێك ڕاناگەیەنێ، بگرە خاڵ دەکاتەوە. تەنیا شیعرییەتیش یەکەی هەڵسەنگاندنیەتی. دیمەنی بە شکۆ لە زەیندا دەخاتە پاڵ یەك و گیان ڕێك دەخاتەوە.

لە نسکۆ چۆك شکێنەکاندا شیعر گیانی تاکی هەستیار و جوانیویستی ڕێك خستووەتەوە و خستوویەتییەوە سەر هێڵی بووژانەوە و بڕوا پەیداکردنەوە.

هەرچەند جارێك ویستبێتم لەبارەی شیعرەوە بدوێم، پرسیاری هاوپەیوەست بە پڕشنگی جوانیی دیکە ڕووبەڕووم دەبێتەوە و ترسێك دوانەکەم دوا دەخات. تەنیا دەقی فرە دەنگیش کە دەنگ و بەردەنگەکان تێیدا یەکتری وەردەگرنەوە و تێکهەڵکێشی یەکتر دەبن، لە سەردەمی خۆیدا بیر دەکاتەوە، لە پێوەندیی نێوان وێنە و ڕووداوی واقیعی و خەیاڵی و کەسایەتییەکان دەکۆڵێتەوە، بەهرەش بۆ بەهێزکردنی سروشتی ژیان و بە گەڕخستنی دەبەخشێتەوە و پەرجووی خۆی دەخولقێنێ. کۆ دەنگ بوێر و جەربەزە ڕادەهێنێ و لە دیلییەتی ڕزگاری دەکات، بەهای دۆزینەوەش لەم ڕزگارکردنەدا دەبێتە بوونێکی بەرجەستە و جووڵەی لێوە پەیدا دەبن.

خاوەن دەقی فرە دەنگ گشتبینە و بینینی ئاسمانی و زەوی و خەونی بەڕێوەی دەبات، نەك هەر دەبێ تەنیا تەواوی دەنگ و بەردەنگەکان ئاشق بکات، بگرە دەبێت هێزی ئاشقبوون لە یەکە یەکەی دانە پەیڤەکانیش نیشان بدات، بۆئەوەی لە ئەفسوونی یەکە یەکەی ئەشقی دانە پەیڤەکان بگەین، پێویستە ئەفسوونی ئەشق و شیعر خۆی بناسین، کە ئەفسوونێکە سەرڕێژ لە ئەشق و درووود بۆ بینینی کورت و درێژ و دروستکردنی ڕووداو لە زمان و ماڵی خودا لەسەر زەمین. ئەو زەمینەی سروشتی هەموو پێویستییەکانی گەشەکردنی ژیانی تێدا ئامادەیە. هێزی نوێکردنەوەی جوانییەکانیش لە ناخی شاعیری پەیوەست بە ئەفسوون و خەون بەهێز و چالاکە.

لەمیانی زمانەوە زیندوویەتی مرۆڤی سەرەتاکانی خەڵق و بوون دەدۆزمەوە و ئاشکرایان دەکەم، وەك کەسێکی ئێستایش قسەی خۆمیان لە هەناودا دەکەم بە فەرمووده و بۆ تا هەتایی لە هەستی چالاکیان جێی



دەهێڵم. تێکەڵکردنی زمانی قسەکردنی ڕۆژانەی خەڵك بە شیعرەوە کارێکی پڕ بگرە و بەردەیە، چونکە توانایەکی زۆری دەوێ شیعرییەت بدەیت بە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانە، تا ڕادەیەك هەوڵم داوە ئەو کارە بەجێ بهێنم.

شیعر مێژوویەکی دیاریکراوی نییە، لە دەرەوەی مێژوودا ڕێڕەوێك بۆ هاتوچۆکردنی شەق دەکات، وزەیەکی زۆری ڕێگایەکانی دیکەیش بۆ گیانی خۆی ڕادەکێشێ. بە دەگمەنیش نەبێت، پێوەندی بە مێژووی نووسینەوە نامێنێت، بگرە هەڵگری کۆمەڵێك باری لە پێشینەیە. چرکەی خرۆشاندنەکە دەبێتە مێژووی نووسینی، چرکەی خرۆشانیش تەنیا ئاوازە و ئامادەکردنە و بەس، بگرە پێکهاتە و دروستبوونەکە کۆمەڵە بارەکەی پێشینەیە. ئەم کۆمەڵەبارە هەڵگری مانان و چرکەی خرۆشانەکەش فۆرم و هێڵی ڕەوتی بەردەوام دەدات بەو مانایەی، کە کۆمەڵێك باری لە پێشینە تێیدا زاڵە. ماڵی شیعریش وەك سەرچاوەیەکی پاڵاوتن و ئاکاری باڵا بۆ دیمانەکانی داهێنەری جادوگەر، لە زماندا دەکات بە شوێنێکی شێوە بەهەشت و تاقانە بۆ چالاککردنی هەستەکان و شیعر و شیعرییەتی تێدا دەدۆزێتەوە، پاش پەروەردەکردنێکی کورت بۆ فەزایەکی نادیار هەڵی دەدا و بزری دەکاتەوە بۆ دووبارە سۆراغکردنەوەی و چرکەی خرۆشان.

نیسانی ٢٠٠٦ هەولێر

# ئەفراندنەوەی جوانییەکان لە دووبارەکردنەوەیاندا
# مانیفێستی شیعری

**(١)**

منداڵیی خۆ بەناوەندکردنی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤی ژیانپەروەر و جوانیویست و دژە داپڵۆسێنەرە. منداڵیی پێوەندی بە سروشتەوە دەکات و پاکیزەیی دەدۆزێتەوە. منداڵیی سروشدەری شاعیرە و هەستکردن و هەستیاریی بەرز دەکاتەوە.

لە تەمەنی منداڵییەوە شێوە شاعیریەتییەکی نادیار، واتا بەهرەی خودابەخش و خۆڕسك وەك بەشێك لە چالاکی بیرکردنەوە و پێکهاتەی مرۆڤ لە شاعیردا دەردەکەوێت، بەڵام ڕێك دەکەوێت ئەم نادیارییە بۆ ماوەیەك دوا بکەوێ و لەکات و ساتێك، کە چرپەکانی ناخ دەبنە دەنگ و هاواری نەرم دەربکەوێت و بنووسرێت. کۆشش و سووربوونی بەردەوام تین و تاو بە بەهرەی خودابەخش و خۆڕسك دەدا.

زمان و مانای بەهێزیش شێوازی شیاو و کاریگەریی خۆی دەخولقێنی و جوانی ڕۆشن دەکاتەوە، دووبارە گەوهەرەکان بۆ دۆزینەوە و هەڵگرتنەوەی هەڵدەڕێژێتەوە.



شاعیری نوێبەخش گیانی بە دەوری هونەری بە کاربردنی هەزاران ساڵدا دەخولێتەوە، لەنێوان زەوی و ئاسماندا لە سۆراخکردنی نوێبەخشی و چوونە ناو گیانە چالاکەکان دیدگای توندوتۆڵ دەخەملێ. وزەی گەردوونی پاڵنەری ئەم خولانەوە و دیدگا خەملێنەیە. نوێبەخشی لەگەڵ مرۆڤ لەدایك بووە و ڕۆڵی لەناو کۆمەڵگەدا تەواو نابێت، مرۆڤخوازە و پڕە لە هیوا و هێز. کار لەناو ئەو شتە جوانانە دەکات، کە پێویستییەکانی ژیان بۆ مانەوە و کار لە ناوکردنەوە پاراستوویەتی.

**(٢)**

بەرانبەر کەرەستە خاوەکان ورد دەبمەوە، پێش ئەوەی بیانخەمە ناو شیعرەوە ئاگاداریان دەکەمەوە و جۆرە ئامادەبوونێکیان لێ دەڕەخسێنم. ئەوجا بە یاریکردن لەگەڵ هەستەکانی لەناو ڕستە و وێنەدا مامەڵەی بوون بە شیعریان لەگەڵدا دەکەم، هەموو بینینەکانی ڕادەکێشمە ناو بینینی خۆم. هەستی جوانبەخشیم لا بەهێز دەکات و پاشان پێی دەگەیەنێت.

شیعر لە بەرزایی ئاسمانەوە دانابەزێتە قوولایی ژیان، بگرە لە قوولایی ژیانەوە مانایەکی شیعری پەیدا دەکات و بەرز دەبێتەوە تا ئەو ئاستەی دەبێتە پێویستییەك لە پێویستییە گیانییەکانی مرۆڤایەتی و بەدیهێنەری واقیعی نووسین و جوانیبەخشی. مرۆڤی ژیانپەروەر و جوانیویست و دژە داپڵۆسێنەر بەرهەمی دەهێنێ. گیانە و گیانی، دۆنایدۆن بەردەوامی ژیان ویستییە، کە سۆز و خەون و ویستەکانی مرۆڤی ژیانپەروەر و جوانیویست و دژە داپڵۆسێنەر لە

سەرەتاكانی بوونەوە تا بە ئێستا دەگات، دەگەنەوە ناو یەك و خورپە بە هێزەكانی لەناو یەكدا دەبن بە دەنگ و دەنگدانەوەی بەرپاكردنی ژیانخۆشی و باش بیركردنەوە.

جوانییە لەبن نەهاتووەكانی لە شیعری كلاسیكی كوردیدا دەربڕینیان لێ كراوە بە خستنە سەر و لێ زیادبوون لەناو بەرهەمی شاعیرە نوێبەخشەكان بە تاسە و تینی زیندووبوونەوە دەربڕینیان لێ دەكرێتەوە و دووبارە دەكرێنەوە.

ئەفراندن لە دووبارەكردنەوەی جوانییەكاندا پەیوەستە بە فرەیی كولتوور و پاراویی ئەزموونی دووبارەكەرەوە. دووبارەكردنەوە جیاكارە لە جووینەوە، چونكە جووینەوە لاساییكردنەوەیە و هیچ داهێنانێكی تێدا بەرهەم نایەت، بەڵام دووبارەكردنەوە جیاكاری و داهێنانی لێوە دەدۆزرێتەوە.

دووبارەكردنەوە هەمیشە جوانیی شێوە نوێ دەڕژێنێتە ناو واقیعی نووسین و جوانبەخشی. لە ئەزموونی گۆران دا دووبارەكردنەوەی مەولەوی دەبینرێت. وەك خەسڵەتی وەسف و لێك گرێدانی شوێن و مانەوە و جووڵە و بەدەنگهێنانی شوێن.

لە دووبارەكردنەوەی جوانییەكاندا دووبارەكەرەوە ڕوانینێكی تراژیدی لەبارەی ژیان لا پەیدا نابێت بۆ كاركردن، چونكە بە تەنیا چاوگەی جوانییەكان مشتوماڵ دەكاتەوە و كاری بەرهەمهێنانەوەی كولتووری جوانی لەناو كولتووری جوانی بەجێ دەهێنێ، هەروەها دووبارەكردنەوەی وشەش هێزێكی دیكە دەبەخشێت، بەجۆرێك لە ناخرا پێ دەگاتەوە و دەردەپەڕێتەوە،



وا دەزانی ئەم وشەیە سەرسوڕمانێكی دیكە ئاشكرا دەكات و دەیهێنێتە بوون و پانتایی كارتێكردن. وشە لە شیعردا وزەی دەبینرێت نەك قەوارە.

## (٣)

لە سۆنگەی سەرسامیم بە گیانی پاكژ و پڕ بەهرەی شیعری كلاسیكی كوردی هەستێك لە ناخرا دەبێتە هاواری نەرم و چینەكانی خەیاڵم گەرم دادەهێنن، خوێن بۆ چالاكبوون دەپاڵێون، چونكە دەقەكانیان لەخودی بەهێزی مرۆڤی ژیانپەروەر و جوانیویست و دژە داپلۆسێنەر ڕوانیویانەتە سروشت و ژیانیان ڕاكێشاوەتەوە ناخی قووڵبینیی خۆیانەوە. پاش لێ وردبوونەوەیەكی بێ گەرد بە پاڵاوگەی تەواوی هەستەكانیان تێپەڕاندووە. ئەوجا گەڕاندوویانەتەوە خاڵی نووسین و بەرهەمهێنان.

هەندێك مۆتیڤی شیعری كلاسیكی كوردی لەناو كاری مندا خرۆشی گیانی، یان ئاسۆی شێوە كاریگەرییەكی نا ئاشكرایان بۆ كردوومەتە خاڵی ڕسكان و لەشێوەی ڕوانینم جۆرە ئاڵوگۆڕییەكیان پەیدا كردووە.

شیعری پەیامدار بەجوانی و لەناخدا پێگەییو لەگەڵ هەستەكان پێوەندی بەتین و مانەوە دەبەستێت. ئەو پێوەندییە دەبێتە خاڵێكی بەهادار و لە هەناودا نیشتەجێ دەبێت.

دووبارە بەرهەمهێنانەوەی جوانییە لەبن نەهاتووەكان نیشانەی ژیانخۆشی و باش بیركردنەوەی تاكی چالاكە لەناو كۆمەڵگەدا.

کارکردنی بەردەوام لە جوانییە هاوبەشەکان هەمیشە هەستەکانمان لە ئاستی جیا جیا زیندوو دەکەنەوە. پێوەندیشی بەو مێژووە شاراوەیە هەیە، کە هەست بە گەرموگوڕی ڕادەهێنێ و تاوی دەدا بۆ پێکهاتن، کە دەکەوێتە ناو کەشی نووسین هەندێك وێنە لەپڕدا ڕوو دەدەن و یەك بەدوای یەکدا وەك شیر لە گوانی پڕدا دەڕژێن، تۆ لەم کاتەدا بیرت لێ نەکردووەتەوە، ڕەنگە ڕۆژانێکی لەمێژینە لە بیرتدا جوولاّبن و نەتنووسیبن. لەم کەشەدا سەر دەردێننەوە و دەبن بە بەشێك لە بیرکردنەوەی ئەمڕۆت. ئەمڕۆ، یان چرکەی نووسین تەنیا خستنە سەر کاغەزە، پێکهاتە نییە.

شیعری پەیامدار بەجوانی و لە ناخدا پێگەییو هەموو شتەکان بە یەکجار لەبەرچاو دەگرێ و لەناو شەپۆل و ترپە و ئاوازیدا تروسکەی چاو و زایەڵەی ناخی شاعیر دەبیسترێ، کە ژیانپەروەری و جوانیویستی و دژە داپڵۆسێنەر دەخاتە ناو پرۆژەی خۆشەویستییەوە، خۆشەویستی کاکڵەی ناخ و بڕوا بنەڕەتییەکانی شاعیری نوێبەخشە، شیعری پەیامدار بەجوانی و لەناخدا پێگەییویش نوێنەری هەموو جوانییەکانی ڕووی زەوییە، بەبێ ئەوەی شاعیر تەواو لە ڕاستی و کرۆکی جوانی بگات، ئەو نوێنەرایەتییە وەردەگرێت. هەرکاتێك گیانە و گیانی لەگەڵ جوانی کرد و تەواو لە کرۆکی جوانی گەیشت و بوو بەیەك پارچە لە جوانی ئەوە بێ هیچ دوودڵییەك شیعر لای دەبێتە مەترسییەکی بکوژ و بە ئاسانی ناوێرێ دەستی بۆ ببات. ئەوە هێزی تایبەتی شیعرە خەیاڵی ژیانێك لە مرۆڤی ژیانپەروەر و جوانیویست و دژە داپڵۆسێنەر دروست دەکات هاوشێوەی بەهەشت. بەهەشتیش لە کتێبە کۆنەکان پێکهاتووە. لەم پێکهاتەیەدا کار



بۆ ئەوە دەکەم لەنێوان بوون و شیعردا هێڵی جوانبەخشی بدۆزمەوە. بیکەم بە ناوەندی دامەزراندن و نوێبەخشی، خەمی ڕۆژانەی سیاسی و ئایدۆلۆژیاش پەراوێز بخەم، کە بەشی هەرە زۆری شاعیرانی پێشە من، کەم کاریان لەناوەندی بوون کردووە، زۆرتر خەمی ڕۆژانەی سیاسی و ئایدۆلۆژیا هەڵی سووڕاندوون.

## (٣)

تامەزرۆیی بۆ نووسین پرۆژەیەکە بۆ چوونە ناو جوانییەکان و جوانبینی و جوانبەخشی، نوێبەخش خەیاڵێکی بەهێز و ناوازە لەخۆیدا پەروەردە دەکات و دەست بۆ شیعر دەبات، بەڵام کە چووە ناو تێڕامان و خەڵوەتەوە زیاتر بیروباوەڕ و خەیاڵی درەوشانەوە دەدا. تێڕامان و خەڵوەت مەستییەکی هەمیشەییە بۆ شاعیر، کە هەموو جوانییەکان بە یەکجار لەبەرچاو دەگرێت و لەناو خۆیدا ڕێکی دەخاتەوە، زمان چۆنیەتی ڕێکخستنەکە دەدرکێنێت، هەستەکان جێگۆڕکێ و پێوەندی بەیەکەوە دەکەن. شیعر لە منداڵدانی زماندا گیانی دێتە بەر و هێزی ڕاستەقینەی شاعیر لەو زمانەدایە، کە شیعرییەتی تێدا ئاشکرا دەکات. نەك لەو زمانەی ژیانی ڕۆژانەی پێ بەڕێوە دەبات، بۆ شیعر سەرکەوتن و دابەزین بە پەیژەی زماندا گرینگ نییە، بگرە نووسینەوەی نۆتەی زمان گرینگە.

زمان چارەنووس و بوونی شیعرە لە بنیادێکی کاریگەردا، گفتوگۆ لەگەڵ واقیعی تایبەت و خەون و هەستەکان دەکات، نەك لەگەڵ کەلوپەلی ڕۆژانە و کەشی گشتی. لەگەڵ ئەوەشدا کەلوپەلی ڕۆژانە و

کەشی گشتیش پێویستە بخرێتە ناو داهێنانەوە، بەوەی ئاسۆ و دوورییەکی جوانبەخشی و زمانی، لەگەڵ بوونە ئاساییبیەکەی بخوڵقێندرێت. لەم خوڵقاندنەدا ئەو جیاکارییانە دەردەکەون، کە لەنێوان دووبارەکردنەوە و لاساییکردنەوەدا دەستی بۆ دەبردرێت.

ئاداری ٢٠٠٧ هەولێر



## لە ئاهەنگی بیست ساڵەی زێواندا
## مانیفێستی شیعری

شیعری بێگەرد وەك مەسیح لە دایکێکی پاکیزە لە دایك دەبێت. لەو ئەزموونەی خۆمدا، کە لەتەنیشت مەرگەوە ژیاوە و کەم و زۆر گەشەی کردووە، هەوڵم داوە ئەو جۆرە شیعرە بەرهەم بهێنم، کە لە دایکێکی پاکیزە لە دایك بووبێت، ئەگەر نەشم توانیبێت بەرهەمی بهێنم، تێکۆشاوم لێی نزیك ببمەوە و وەك ڕۆشنبوونەوەیەکی گیانی پێوەی خەریکبم.

دوای ئەوەی بیست ساڵ بە سەر چاپکردنی یەکەمین کتێبم زێوان تێپەڕی بیرم بۆ ئەوە جوولا وەك نیمچە ئەزموونێك چەند دێڕێکی لەبارەوە تۆمار بکەم، یان ئەو هەرێمەی ئەو دەقەم تێیدا حەواندووەتەوە جارێکی دیکە بچمەوە ناوی و مەودا و ئاکارەکانی بپێومەوە.
لەو دەقەدا هەوڵم داوە بگەڕێمەوە بۆ کرۆك و ناوکی گیانی منداڵی و بە تاسە و سۆزێکی تایبەتەوە لە زەینێدا سەردانی شوێنی منداڵیم بکەمەوە.
ئەو شوێنەی شیعر تێیدا بێگەردە و خولیایەکی بەهێزە بۆ بێگەردبوون.
بەهرە و سروشم لە سروشتی پاکیزە و نەژاکاوەوە وەردەگرت، وەك سەرچاوەیەکی بە پیت و یارمەتیدەر بۆ خەملاندنی بیرکردنەوەم، لێی نزیك

دەبوومەوە.
لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا یەکەم هەناسەی ئەم دەقە بە سییەکانمدا گەڕا و ڕژایە ئاسۆی هەستەکانمەوە. پێویست بوو هەڵیبگرمەوە، لە بیست و دوو ساڵیدا بەرهەم هات و تەواو گەڵاڵە بوو. وەك پرۆژەیەکی ئاراستەکراو و خۆدامەزراندن بیرم لەوە نەکردبووەوە درێژە بە نووسینی دەقێکی لەمجۆرە دوور و درێژ و تاکدەنگی و خەمئامێز بدەم، هەرچەند دەمنووسی پارچەکانم بە یەك دەگرتن هەمووی یەك کەش و هەوا بوون و دەچوونە هەمان دۆخی خەمئامێزی نووسینەوە. وەك ژوورێکی ئاوێنەیی لە هەموو لایەکەوە خۆمی ڕووبەڕووکردمەوە، لە دڵەوە لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەم پرسی و بە دوایدا گەڕام، بۆ ئەوەی لە سەرگەرمیی گەڕاندا دووبارە خۆم بە بوون بناسێنمەوە و بڕیاری دیکە بۆ چۆنیەتی ژیان بدەم، هەموو لك و پۆپەکانیش بە ژیانەوە گرێ بدەمەوە و لای مەرگ ڕای بگرم، چونکە نوێبەخش هەمیشە بە خۆناساندنەوەی دووبارە ئاشق دەبێتەوە و پێویستییەکانی ئەشق وەك ئاگرێکی ئەفسووناوی لە ناوەوە گەرمی دادەهێنێ بۆ گەڕان و پەیبردن بە ئاڵۆزییەکان و دۆزینەوەی هێڵ و دۆخی نووسین. سەرەتا سێ ناونیشان بە خۆیانەوە خەریکیان کردبووم.

یەکەم: منداڵی بەرزەخییەکان.

دووەم: زێوان.

سێیەم: گۆڕان لە ئاکاری مەرگدا.



بە درێژایی ماوەی نووسین نیگەرانییەکیشم لەگەڵدا بوو بۆ هەڵبژاردنی ناونیشان.

لەم دەقەدا گشتێکی یەکگرتوو هەیە. لە دوای ئەو ئەزموونە ئەم گشتە یەکگرتووە لە ئەزموونی مندا بەرەو کزی و نەمان دەچێت. ڕەگەزی کتوپڕی زاڵ دەبێت و تانوپۆی شێوازی لەمەوبەدوام دەچنێت.

خاڵی جێگیرکردنی ڕەگەزی کتوپڕی و دیاریکردنی سنوورەکانی و بەکارهێنانی بە شێوەیەکی دیار لە شیعری تازەی کوردیدا تایبەتە بە ئەزموونی من و بەهرەزادە و دەستمایە و ڕووبەری بیندراوی منە. تێیدا وزەیەکم بە دەست هێناوە، کە وەرگر دوچاری جۆرێك ئا و نا و دڵەڕاوکێ و خۆخواردنەوە دەبێت. سەرەڕای ئەم خۆدەستنیشانکردنە لەم شێوازەدا زیاتر هەست بە پرۆژەی ناخ و ئێستێتیکای شیعری دەکەم، دەشزانم دەبێ باجی خوێنەری یەکئاست و ڕەخنەگری بێ گوتاری ڕەخنەیی و ناخ چەپەڵ بدەم.

ڕێك ئەو چوارساڵەی بەو شیعرەوە خەریك بووم، هەڵاتووی سەربازی بووم. ژیانم لەناو خانوویەکی ڕووەو هەتاوی دوو ژووری، کە بنمیچەکەی دارەڕێ و قامیشبەند بوو، بە سەر دەبرد. ئەو دارەڕێیە و قامیشبەندەم هەمیشە وەك دارستانێکی سەوزی پڕ بەروبووم و پشت و پەنا خەیاڵ دەکرد و بیرم لە قۆناخی سەوزیی دار و قامیشەکان دەکردەوە. حەوشەیەك، کە باخچەیەکی دڵگیرم تێیدا دامەزراندبوو، لاولاوە بە سەر دیواری حەوشەدا بەرز ببووەوە، نێوانی دیوار و لاولاوەکە دالآنێکی دروست کردبوو، بە دڵفراوانییەوە جێگامی تێدا دەبووەوە، شوێنێکی هێمن و لەبار و بەهرەبەخش بوو بۆ نووسین و خوێندنەوە. بە وریاییەوەش سوودم لە کاتی خۆم وەردەگرت.

هێڵی نووسین هەستێکی سەیری لەگەڵ خۆیدا دەهێنا زیاتر ئەزموونی ژیان و هاواری خود بوو، لەوەی ئەزموونی کتێب و زانیاری و فێربوون بێت. ئەم ژیانە نیمچە داخراوە لەو ماوەیەدا گیانێکی چالاك و سەرڕێژ لە هەوڵدانی بۆ نووسین لە جەستەمدا ڕسکاند بوو، زۆر لە مردن و تارمایی مردن دەترسام، دڵم بە تەقەی دەرگایەك دادەخورپا، کەچی بەردەوام لە باری شیعریدا ئەم ترسە پێچەوانە دەبووەوە و بیرکردنەوە لە خۆکوشتن لە دەقەکەدا زاڵ دەبوو. بە وریاییەوە چاودێریی سروشت و پێوەندییەکانیم دەکرد. میوە و گوڵی وەرزەکانم پەیدا دەکرد و لێیان ورد دەبوومەوە، هەستم بە ئاسوودەیی و پشتیوانی دەکرد. دڵم نەدەهات میوەکان بخۆم، کە ڕەنگیشیان دەگۆڕا و بۆن لێی دەدان. هەست و ترسی مردن زیاتر لەلام مەترسیدار و قووڵتر دەبووەوە.

ئەو بارو دۆخ و دەوروبەرە هەناسەی توند گرتبووم، بەڵام هەوڵم دەدا بارودۆخە بوونییەکە تانوپۆی تەواوی دەقەکە نەچنێت و داگیری نەکات، بگرە سوودی لێ وەربگرم بۆ دروستکردنی کەشێکی هەستی. لە پێناوی ئەوەی تا شیعر بە شیعر بمێنێتەوە، کەمێك دووربکەوێتەوە لەو بیندراوانەی، کە دەبنە مایەی خرۆشانی کاتی.

لەو سەروبەندەدا کۆ شیعری یەك لە شاعیرە ناودارەکانی حەفتایەکانم خوێندەوە بە شێوەیەك شیعری ملکەچی واقیع کردبوو، ڕۆڵی بیرکردنەوەی خوێنەری تێدا کوشتبوو. لە کاتێکدا شیعر ملکەچی ئەو پێویستیانەیە، کە کاری هونەری و شیعرییەت و زمان دەیخوازن. واقیعی لە دۆخی خۆی هێشتبووەوە، ڕاینەکێشابووە ناو چوارچێوەی شیعرییەت. شیعر پێش ئەوەی



واقیع دروستی بکات، یان یارمەتیدەری بێت بۆ دروستبوون کەشێکی هەستی و بنیادێکی زمانییە.

تاڕادەیەك ئەدەبی واقیعی لەبەر دڵ و چاوم سیما و سایە گران کرد. لەوەش دڵنیابووم لە ئەدەبی واقیعیدا شاکاری نایاب هەیە و هەموو توخمەکانی شیعرییەتی تێدا بەجێ هێنراوە، بەڵام ئەم شاعیرەی خۆمان نەیتوانیبوو واقیع بە دەوری خۆیدا بخولێنێتەوە. بگرە ئەو سست و تەمبەڵانە بە دەوری واقیعدا خولابووەوە.

لەم دەقەدا نەگەیشتم بە تەواوی ئارەزووەکانم، ئەگەر بگەیشتبوومایە بە تەواوی ئارەزووەکانم درێژەم بە نووسین نەدەدا و لە هەوڵدان دەکەوتم. هونەرە جوانەکان دەربڕین لە تەواوی پێویستە گیانییەکانی مرۆڤی هەستپەروەر دەکات. زمان و بیر و خەون و سۆزیش تێیدا فۆرم وەردەگرن. ئاستەکانی فۆرم وەرگرتنیش لە شێوازدا هاوسەنگییان دەوێت. وورووژان و نامۆییەکی بکوژ لە ناخمدا دەستی پێ کردبوو، مەرج نییە تەنیا ئەو شاعیرانەی لە دەرەوەی سنووری وڵات دەژین تاراوگەکراوبن، نامۆبوون لەو بارەدایە، کە شاعیر تێیدا هەڵسوکەوت دەکات و پێوەندی بەو هەلومەرجەوەیە، کە چۆن هەستەکانی دەکاتە بابەتی شیعری.

پێم وایە پێویستە بەو پێناسەیەدا بچینەوە کە نامۆبوون تەنیا لە دەرەوەی سنوورەوە بێت. من لەناو وڵات و کەس و کار وماڵەکەی خۆمدا ئەو دەقەم بەرهەم هێناوە. کەچی نامۆبوون تەواو تانوپۆی چنیوە و بە ئەزموونی تاراوگەکراو و نامۆبوون تێدەپەڕیم. ڕەچاوی گۆڕانی بار و دۆخەکەشم دەکرد. ئەم دەقە دەقێکی مۆنۆدرامییە، سروشتێکی زەینی و گیانی هەیە. بە شێوازی

مەنەلۆگی ناوەوە بەرهەم هاتووە. پێش ئەوەی لە لاپەڕەی دەفتەردا نووسرابێت. لە ناخمدا نووسرابوو، بە پرتاو و هاوارەوە دەهاتە دەرەوە. وەك مندالێك، کە سووری گەشەی خۆی تەواو کردبێت و بە ئاسایی و جەستە و گیانێکی تەواوەوە لە دایك بێت. خودا چارەنووسی ئاو و خۆڵ و ئاگر و با و شیعری لا ڕوون بوون. بۆیە منی وا گیرۆدە کردوون. لە ئەزموونی مندا شیعر وەك سەمەندەر لە خۆڵەمێشی سووتانی خۆمدا لە دایك دەبێت و گیانێکی غەمگینی دێتە بەر.

بۆ ئەوەی شاعیر بە شیعرییەت بگات پێویستە بە نامۆییدا گوزەر بکات، یان لە نامۆییدا بژێت. چونکە بەشێك لە بوونی شیعر لە جەستەی نامۆییدا دەمێنێتەوە و دەبێتە ئەفسوون و ڕاز. ئەفسوون و ڕازیش شیعرییەت و پێکهاتەکانی تێدا گەشە دەکات و دەدۆزرێتەوە. هەست بە نامۆییکردن لە باری دەروونی و کەسایەتیی داهێنەردا بەرجەستە دەبێت و چرکەی هەژان و بەرزبوونەوەی ناخ دەیدۆزێتەوە. لە هەموو سەردەمە دڕدۆنگ و نالەبارەکاندا شیعر ڕۆڵی جوانیبەخشی خۆی وازی کردووە و کرۆك و ناوکی شیعرییەتی نەدۆڕاندووە. شیعر هەقیقەتی جوانییە، نابێتە سیمایەکی دیار لە سیما گشتییەکانی کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی. ڕوونتر شیعر دەربڕین نییە لە بوونی کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی، دەربڕینە لە بوونی جوانییەکانی کۆمەڵگە و مرۆڤایەتی و گەردوون.

شیعرم نەکردووە بە ئامرازی مەبەستە سیاسییەکان، یان دەربڕی سۆزی سیاسی، بەڵام باوەڕ و بیری سیاسیم ڕاکێشاوەتە ناو مەبەستە شیعرییەکانم. بەهای شیعری لەناو زماندایە، نەك لە مانا و مەبەست، بەڵام چێژ لە



ئاستداری زمان و مانا و مەبەستدا دروست دەبێت.

شیعر لە بواری خۆیدا دەتوانێت هونەری شێوەکاری و فۆتۆگراف و گۆرانی و درامای شانۆیی و مۆسیقا و تەلارسازی و هونەری دیکەش وازی بکات، هەروەها هونەری دیکەش دەتوانن بەشداری لەوە بکەن شیعر وەربگێڕن بۆ زمانی خۆیان. شیعر لە هەندێ باردا دەبێتە باوکی هونەرەکان و لە هەندێ باری دیکەیشدا دەبێتە کوڕ و کوڕەزا.

ڕێکەوت هەیە شیعر دەربڕین لە بارێکی سایکۆلۆژی دیاریکراو دەکات. تەنیا هێزی ویژدان پەی پێ دەبات. وەك چۆن هەندێك جاران مووچڕکێك بە گیان و لەشدا دێت و دەربڕین لە بارێك دەکات، پاش ماوەیەکی کورت بە هیچ هەوڵ و شێوەیەك ناتوانیت بگەڕێیتەوە سەر هەمان باری موچڕکەکە. موچڕکیش زادەی بار و چرکە جوانەکان و ویژدانی مرۆڤە لە هەستپێکردنە زۆر تایبەتییەکاندا، کە لە نووسینیشدا دادەمام و نەمدەتوانی بەردەوام بم لەسەر کاغەزەکانی بەردەستم وێنەم دەکێشا، وێنەی ئێجگار سەرەتایی: شاخ و داخ و ئاسمانی بە هەور و مرۆڤ و چرا و چەتری هەڵدراو لەبەر باران و سەبەتەی مام زۆراب و جووجکە و مریشکی دانەوێڵە بۆ ڕژاوی حەوشە و ژنی بە دیارەوە وەستاو و کاتژمێری گەورەی دیوار و ئەسپ و پیکابو،... تاد، کە دەقەکە بە شێوەیەکی گشتی لام تەواو بوو، بیرم لە خۆئامادەکردن کردەوە بۆ چاپکردنی و ئەوکێشە و گیر و گرفتانەی بە هۆیەوە ڕووبەڕووم دەبنەوە. پێش ئەوەی بۆ دەزگای چاودێری بنێرم پێشانی برادەری شاعیرم (نەژاد عەزیز سورمێ)م دا، لە لاپەڕەی یەکەمدا ئەم بۆچوونەی یاداشت کردبوو: (زێوان ژانێکی پڕ بەهرەی تێدا بەکارهاتووە، چاپکردنی سەرەتای شاعیریەتییەکی باشت بۆ

دەستنیشان دەکات.) بۆچوونەکەی هاندەر و پاڵپشتێکی گیانی بوو بۆ من. سووری کردم کۆڵ نەدەم و ئەو سەرەتایە دەستنیشان بکەم.

ناردم بۆ دەزگای چاودێری. دەشمزانی پەیبردن بە تازەیی ئەم شێوازە شیعرییە دوور لە بگرە و بەردە و قووڵبوونەوە. گوتوبێژی لە دڵەوەی دەوێ، ئەوجا بڕیار لەسەردان.

دەزگای چاودێریش سێ جار ڕەتی کردەوە. بڕواشم بەوە هەیە ئەگەر جاری یەکەم سەرنەکەوتم: جاری دووەم و سێیەم و چوارەم،... تاد. هەیە. منیش سووربووم و کۆڵم نەدەدا. لەبەر ئەوەی دەمزانی کارم لە شێواز و زمانێک کردووە قبوولکردنی بێ گێچەڵ نییە. ئەو ڕۆژەی نائومێدیان دەکردم و مۆری ڕەتکردنەوەیان لێ دەدا. دوای ماوەیەکی کورت دووبارە ئامادەم دەکردەوە و دەمناردەوە. بەهانەی ڕەتکردنەوەکانیشیان هیچ پێوەندی بە هونەر و ئاستی شیعرییەت و زمانەوە نەبوو. لە سەر بنیاد و بنەما دۆخگۆڕ و بنەڕەتییەکان بمان وەستێنێت و پێگە و پێکهاتەکانمان نیشان بدات. ئەوەی زۆر جێگای گومان و سەرنجیشە دەقەکە شتێکی وای دژی ئایین و سیاسەت و شێوازی حوکمڕانی تێدا نەبوو.

بەهەر حاڵ، بۆچوونی شارەزای یەکەم جۆرێك بناخە و بنەمای تێدایە، کە تەمەنی بۆ داهێنان بە گرینگ و پێوەر زانیوە. وەك بۆچوون و جۆرێك لە بیرکردنەوە ڕێزی لێ دەنێم، بەڵام بۆچوونی شارەزای دووەم و سێیەم دژایەتییەکی بێ بنەما و ڕووتن ئەقڵی ڕاڤەکارانە نین. جۆرێك سووك تەماشاکردنی ئەدەب و سووکایەتی پێکردنیشە. هیچی تێ ناچێت بڵێی بەرد باری و کێڵگە و سروشتی سەوز و پاراو کرد، یان بەرد بارین سوودمەندە بۆ مرۆڤایەتی، بەڵام کاری پرۆگرامی ڕەخنەگر ئەوەیە



سەوزبوونەکە وەربگێڕێ بۆ باری واقیعی بەرد بارینەکە. ئەو کات درکی بە نهێنی هێزی داهێنەرانەی شاعیر بردووە و بیر و هونەری شاعیری بۆ وەرگر وەرگێڕاوە. بۆ جاری چوارەم مۆڵەتی پێدرا. کە دانە مۆڵەت پێدراوەکەم پێ گەیشتەوە ئەو شەوە یەکەم شەوە لە ژیانی خۆمدا تێیدا نەنووستبێتم تا بەیانی. لە بارێکی شاگەشکەیی ژیام. وام دەزانی ژیان هەمووی لەناو ئەو دەفتەرەدایە، کە پاش ماوەیەکی دی دەبێتە کتێب. پەلەم بوو، بڵێم منیش هەم. ڕووبەڕووی خودی خۆم ببوومەوە. شیعرم بۆ ئەوە نەبوو بە هۆیەوە جیهان بناسم. بۆ ئەوەم بوو، چیرۆکێك دروست بکەم بۆ گێڕانەوە.

ئەو سێ بۆچوونەی، کە پێی تلاومەتەوە و ئەو بۆچوونەی، کە پێشی شاگەشکە بووم. وەك خۆیان تۆماریان دەکەم.

یەکەم:(ئەم شاعیرە نەناسراو و لاوە،کەچی چەکامەیەکی درێژی نووسیوە، چەکامەی لەم شێوەیە پێویستی بە ئەزموونی دوور و درێژ و دەوڵەمەندە. ئەمە تازە لە سەرەتای ڕێگادایە. چاپکردنی دوا بخرێت سوود بە بەهرەدوارۆژی شاعیر دەگەیەنێت.)

## محەمەدی مەلا کەریم

دووەم: (ڕەشبینییەکی لە ڕادەبەدەر گەمارۆی ئەم لاوەی داوە، ئەگەر لاوی ئەم وڵاتە بەم شێوەیە دوچاری ڕەشبینی و گێژەن بووبن ئەوە کارەساتە، ئەمجۆرە دەربڕینەش یاخی بوونیانە لە دەسەڵات و واقیع. دواتریش زۆر ئاڵۆز و تەم و مژاوییە. هیچ جۆرە کێشێکی تێدا نییە. شیعری سەربەست کێشی تایبەتی هەیە. نە پەخشانی هونەرییە. نە شیعری سەربەستە. هانی ئەمجۆرە نووسینانە نەدرێت.)

## مەجید نەدیم

سێیەم: (ئەمە شیعرێکی ئاڵۆزە، کۆمەڵێك وڕێنەی لاوێکە، کە هێشتا لە شیعردا خۆی نەدۆزیوەتەوە. ئەم شاعیرە یەکێکە لەو گروپەی دەیانەوێ دوای (ڕوانگە) وەك بزووتنەوەیەکی شیعری خۆیان بناسێنن. (مەحموود زامدار) ڕابەرایەتی و پڕوپاگەندەی گەورەکردنیان بۆ دەکات، ناوی لێناون ( پێشڕەو – تەلیعی). ڕەگی ئەم گروپە لەناو کۆمەڵگەی کوردەواری نەهاتووە. پەیڕەوی ئەدەبی ئەوروپی دەکەن. ڕەوا نییە ڕێگا بۆ ئەوانە خۆش بکرێت ئەم ئاژاوەیە بنێنەوە و بیهێننە ناو ئەدەبی کوردی.)

## محەمەد بەدری

چوارەم: زێوان ئەزموونی لاوێکە، بەڵام هەڵکەوتووە، هونەر و داهێنانی تێدایە. هەوڵ و شێوازێکی ڕەسەن و خۆماڵییە بەرەو نوێخوازی، پشتیوانی لێکردنی بۆ چاپکردن پێویستە. دوای ئەوەی ئەو شوێنانەی ئاماژەم بۆ کردووە لابدرێت تین و تاوێکی بە جۆش بە شیعرەکە دەبەخشێت و لە ئەگەر و گومانیش دایدەماڵێت).

## مەحموود زامدار

لەو بگرە و بەردەیەی ڕەتکردنەوە و ڕێپێدانی کتێبەکەمدا ڕۆژنامەنووسی ناودار (مەحموود زامدار) هەستی بە باری دەروونی و نیگەرانیی من کردبوو، کە لە ناخەوە زۆر کەسەربارم، چاوپێکەوتنێکی تێر و تەسەلی لەگەڵدا سازدام بە ناونیشانی (مژدەیەکی تر بەرەو نوێخوازی) بە دوو ئەڵقە لە



ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بلاوی کردەوە. بە وردی بۆچوون و دەردە دڵەکانی خۆم دەربڕیبوو، تاڕادەیەك لە خۆڕازیبوونێکی هەرزەکارانەشی تێدا بوو، بەڵام بۆچوونەکانم لەو ئاستەدا خۆیان دەکردەوە، کە کتێبەکەم دەیویست پێشکێشی بکات، یان ئەو هیوایانە بوون، کە هەمبوون، بەڵام نەمهێنابوونە دی.

سەرەتا نووسین یەك وشە بووە. دواتر ئەم وشەیە بە ناو ژیاندا درێژ بووەتەوە و بووەتە سەرچاوەی بەهرە و سروش. ئەم دەقەی منیش سەرچاوە و بەهرە و سروشی لە یەك وشەوە وەردەگرێت. حوزەیرانی ١٩٨٨ وەك کتێبێك لە ٨٨ لاپەڕەدا چاپم کرد و هەموو دڵخۆشییەکانم هاتنە دی.

قۆناخی هەشتایەکان قۆناخێکی یەکلاکەرەوە بوو، بۆ چارەنووسی شیعری کوردی و خەیاڵی کوردیی گەیاندە ئاستی پەی پێبردن بە پاکیزەیی و بێگەردی، هەروەها شیعری لە باری هەڵچوون و توندوتیژی خستنەوە گواستەوە باری خامۆشی و تێڕامان و شۆڕبوونەوە بۆ ناخ و ڕوونبوونەوەی دیدگا. گرانایی پێکهاتەی هونەریشیان بردەوە سەر دەنگ و دیمەن و وێنە. لانی کەم کەشێکی جیاکاری هێنایە گۆڕێ. ئەم گواستنەوەیە چ لە لایەنی دەسەڵاتەوە. چ لەلای ئەو شاعیر و نووسەرانەی هەستیان دەکرد کەشێکی جیاکارتر هاتووەتە پێشەوە، خەریکە خۆی زاڵ دەکات و دەبێتە ڕووداو و دیاردە. ئەو جیاکارییەیان پێ قبووڵ نەدەکرا. دەسەڵاتیش دوور و نزیك بە دژی ئەو بزووتنەوەیە بەکاری دەهێنان.

دەقی زێوان ئەزموونێکی وێنەخوازی و زمانگەرایییە تا ناوەڕۆکخواز. پێش چاپکردنی، دەزگای چاودێری چڕنووکی لە خوێن و گۆشتی وەشاندووە، دوای چاپکردنیش کۆمەڵێکی دیکە چڕنووکەکەیان توندتر گوشی. ئەو بۆچوون و دژایەتیکردنانەم هیچ بەلاوە گرینگ نەبوون، ئەوەی گرینگ

بوو، چۆن پرۆژه شیعرییه‌کانم بگه‌یه‌نمه ناوچه به‌رزه‌کانی شیعرییه‌ت. وه‌لامیشم بۆ بیانووپێگران ته‌نیا بزه‌یه‌کی سامناك بوو، بۆ له‌مه‌وبه‌دواش هه‌ر هه‌مان بزه‌ی سامناکم ده‌مێنێته‌وه، چونکه دڵنیام خه‌ڵکی بێ به‌هره و ناداهێنه‌ر سه‌رقاڵی کاری له‌مجۆره ده‌بن. له‌م ڕووه‌شه‌وه ڕووبه‌ڕووی نووسه‌ری به به‌هره و داهێنه‌ر نامه‌وه.

درووود و سوپاس بۆ زێوان و ترپه‌ی لێدانی دڵم، که ئاگرێکی ئه‌فسانه‌ییه‌ و به‌رده‌وام هێزی گیانی و گه‌شه‌م ده‌داتێ. سه‌رکۆنه‌شی کردم و گوتی: ئه‌گه‌ر گه‌نجینه‌ی گیانت به‌تاڵ بوو، نه‌تتوانی له خۆ به پیتکردن و په‌ره‌پێدان به‌رده‌وام بیت ته‌رمی خۆت زوو له‌بن بارستێکی خۆڵدا بشاره‌وه. ئاگاداریش به شیعری بێگه‌رد به ده‌ستی گلاو ناگیرێت. گه‌وره‌م ئه‌ی شیعری بێگه‌رد تا مردن سه‌رله‌ڕێ و گوێڕایه‌ڵتم.

**حوزه‌یرانی ٢٠٠٨ هه‌ولێر**



## شوێنی زه‌ینی له شیعردا
## مانیفێستی شیعری

جوانی و کرده کاریگه‌ره‌کان، یان کاکڵه‌ی تایبه‌تییه‌کان، که مرۆڤ تێیدا ده‌گاته ناسینی خۆی له زمان و سروشتدا به ناوچه‌وانییه‌وه لکاوه، بۆ بریسکانه‌وه‌ی ئه‌م ناسینه پێویسته پێش هه‌موو شتێك بچینه ناو هه‌وا و بواری سه‌رسوڕمان و زانین له‌باره‌ی شڵه‌ژان و هێمن بوونه‌وه‌ی گیانه‌وه، چونکه جوانی و کرده کاریگه‌ره‌کان، یان کاکڵه‌ی تایبه‌تییه‌کان له شیعردا له ڕێگای گیانه‌وه لێکدانه‌وه‌یان بۆ ده‌کرێت.

بریسکانه‌وه‌ی یه‌که‌می ئه‌م ئه‌زموونه له‌وه‌وه بووه خولیا و ڕایه‌ڵی پێویستبوونی چنی، یان به‌ردی سه‌رشاربوونی خۆی دانا. له‌باره ئاماژه‌کانی ته‌مه‌ن و ژیان و بینینم له نێوان چل و په‌نجادایه، له‌ناو ورده‌کارییه‌کانی خۆی نا دڵنیایه و ملی له ئاست هیچ ده‌سه‌لات و گروپێکی داپڵۆسێنه‌ر نه‌رم نه‌کردووه. سه‌رکێشی و سه‌رمه‌شقی به‌رده‌وامبوونی له که‌ش و ئومێدی نووسیندا ده‌رسکێنێت. له ساڵێکدا تۆماریان بکه‌مه‌وه، ڕۆژه‌کان به دوای یه‌کدا یه‌که‌یه‌که به هۆی بنه‌ماکانی نووسین و بیرکردنه‌وه وزه‌یه‌کی به‌کاریان تێدا جه‌خت بکه‌مه‌وه و بیانهێنمه ناو واقیعی نووسین و هه‌قیقه‌تی ویژدانییه‌وه.

نووسین لە تەواوی ڕۆژەکانی ساڵێکدا کار و هەوڵدان و تێگەیشتنە لە ئاراستەی ڕۆیشتن و ئەو بوونەی خەیاڵ وەك پاڵپشتێك بەگەڕ دەخات بۆ گەشەکردنی بیرکردنەوە و پەیداکردن و خەملێنی تیشکە شیعرییەکان لە هەقیقەتی ویژدانییەوە.

نەمویستووە شوێن پێی تەمەن و ژیان و بینین پیشان بدەمەوە، بگرە ویستوومە ئاراستەی بخەملێنم و پێناسەی بکەمەوە. پێناسەکردنەوە گەیشتنە بە ناوکی بێگەردی شیعر. ئەگەرچی دەشزانم ناوکی بێگەردی شیعر لە پلەی مەحاڵدا بە دەست دێت و لە گرد و کۆی جۆش و خرۆشی ویژدانی و گۆشە جیاکارەکاندا گەلاڵە دەبێت، بەڵام من وەك کەسێکی پڕ جۆش و خرۆشی ویژدانی و ماندوو بە شیعرەوە، گەیشتن بە تاکە درەوشانەوەیەك ناوکی بێگەردی شیعر و ژیانمە.

من پەروەردەی کولتووری شیعرییم و لە کرۆکی زمانی کوردییەوە هاتوومەتە دەرێ، کولتوور لەناو کۆمەڵێك هەلومەرجی کاریگەردا دەڕسکێت. هیچ شتێکیشم لە دەرەوەی بیرکردنەوەی خۆمدا نەدۆزیوەتەوە، کە لێکدانەوەی جیاکاری بۆ ژیان نەبووبێ. پێویستیشە باشترین شت، کە لە بیرکردنەوەی خۆماندا گرد و کۆبووە و هەمانە ئەوە ببەخشین، بەخشینی باشترین شت بنیادت دەنێتەوە، کە هەموو بیرکردنەوە و توانات لەدوا دەقدا ڕشت هەست بە جۆرێك ڕووخان دەکەیت. کە بە شێوەیەك لە شێوەکان بەخشینەوە لات دووبارە دەبێتەوە، ڕاستەوخۆ هەست بە بنیادنانەوە و هێز و وزەی دەروونی دەکەیتەوە. لەم کار و هەوڵدانەدا ویستوومە لە هەڵچوونێك، یان ڕامانێك، یان بینینێك، یان تەزوویەك، یان خەونێك، یان



هەست پێکردنێك،... تاد. بهێنمەوە و جۆرە خەسڵەتێکی چۆن خرۆشان و وەها نووسینی پێ ببەخشم، یان هەستی کاتی و دۆخێکی سروشتی تێیدا بدۆزمەوە. واتە شیعر لەگەڵ هەر بارێك لەو بارانەی دەستنیشانم کردوون، پێم گەیشتووە و لە گیانی نزیك بوومەتەوە و گەیشتووم بە پلەی ئەشقی کەم وێنە، ئاماژەکانی تەمەن و ژیان و بینینم کردووە بە ناوەند و تیشکە شیعرییەکانم لێوە پەیدا کردوون و گەیاندوومەتە باری کپیی نووسین.

لە کپیی نووسیندا لەو گرفت و کێشانە ڕام نەکردووە، کە ڕۆژانە ڕووبەڕووم بوونەتەوە، هەندێکیانم لە بینینەوە هەڵدەگێڕایەوە، وەك نادیاری و خەیاڵێك کارم تێدا کردووە و بە مەودا و خاڵێکم گەیاندووە.

لە بەرزاییەوە داشکاومەتە خوارەوە و لە خوارەوەش بە ئاراستەی بەرزایی بەرز بوومەتەوە بۆ دامەزراندنی مەودا و خاڵ، ناوەندم کردووە بە یادگە و گفتوگۆ و کانگەی زاخاودانی مێشك. بایەخی زۆرم بە ئەفسوونی وێنەی شیعری داوە، بە هۆی دەنگی پیت و ئاوازی وشەوە هەمان بایەخم لە ڕستەی شیعریشدا دووبارە کردووەتەوە. ڕستەی شیعریم لا وەك ئەو ئۆتۆمبێلە ئەفسووناوییە بوو، کە بە منداڵیی بە ئارەزووی خۆم و بە جۆرەها شێواز دەمجوولاند و ئاستدارم دەکرد.

نەکەوتوومەتە یاریی وشە و پچڕانی پێوەندی نێوان وشەکان، پێوەندی نێوان وشەی یەکەم و سێیەم بپچڕێنم و یارییەکی دەنگی بە وشەی دووەم بکەم، بەڵام هەوڵم داوە ڕستەکان ڕستەی بێ گرێ و ئاستداربن و جۆری دەنگی وشە و سروشتی زمانی تێدا بپارێزم. ئەو ڕاپسکان و هێزە

شاراوەیەی زمان هەیەتی لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا گیانی نوێبەخشی تێیدا دەجۆشێت و دەرسکێت.

زمانی ئاخاوتنم لە زمانی نووسین جیاکردووەتەوە. هەمیشە ئەو ئاخاوتنانەی لەناو ژیاندا هاتووە و دێت پاڵپشت بووە بۆ نووسین. واتە دەقی شیعریی چووەتە پاڵ دەقی ژیان و هاوتاییان دروست کردووە.

لە کار و هەوڵدانەکانی پێشترم دەق هەبووە، چەندین ئەم پەڕ و ئەو پەڕم پێ کردووە و هێڵە گشتییەکانم گۆڕیوە. ئەوجا ڕەوایی بە خۆم داوە بڵاوی بکەمەوە، بەڵام لەم کار و هەوڵەمدا چۆن نووسراوە، ئەوها بڵاوکراوەتەوە. مەگەر بە دەگمەن وشەیەك، یان دەستەواژەیەکم جێگۆڕکێ پێ کردبێت. لەوانەشە ئەمە خەسڵەتی شیعری کورت بێت بە پڕی دێت و خورپەت دەخاتە هەناوەوە و خۆی پێشکێش دەکات، هەروەها شیعری کورت خۆی لە گشت ناناسێتەوە، بگرە خۆی لە یەك شت دەناسێنێتەوە و مانای تەواوی یەکلاکەرەوە دەدات.

هەوڵی ئەفسانە و داستان خولقانیشی تێدا نادرێت، هەوڵی بەرهەمهێنانەوەی مانا و مەودایەکی نوێی لێوە دەدرێت و دەرسکێت. شێوەی ڕسکانەکەش لەو وێنە و دەربڕینانە خۆی ڕوون دەکاتەوە، کە مانا و مەوداکانی تێدا کۆ دەبێتەوە و وێنای کەسێکی ئەفسانەیی، یان داستانیمان بۆ دەکات.

لە یەکەم ڕۆژی ئەم ساڵدا تا دوا ڕۆژی (٣٦٦)پارچەم نووسی. نووسین بۆم ببووە سروشتێکی تایبەت و ڕۆژانە، ڕۆژ، کە نوێ دەبووەوە، دەبووە خولیا و سەرهەڵدانی پارچەیەکی دیکە. وەك ئەستێرە ڕژاوێك هەر ڕۆژەی



پارچەیەکم هەڵدەگرتەوە، ڕێزم دەگرت و بەرزم دەکردەوە تا ئاستی دڵ و سەر، ڕۆژی دووەم وەك یاداشت و بیرەوەری لە نووسینی ڕۆژی پێشترم دەڕوانی.

لە دوا قۆناغی بیرکردنەوە و دیارکردندا تەواوی پارچەکانم بەیەکەوە گرت و جۆری دڵ لێدانەکانیانم پێوانە کردن. بینیم زۆرینەیان لەناو یەکدا شەپۆل دەدەن. (٢٠٠) پارچەیانم لێ فڕێدان و (١٦٦) یانم وا بینی هەریەکەیان لە تاکدا سەربەخۆیە و لە گشتدا لەناو یەکێتی ئەزموونی هەستیمدا یەکگرتوون و ئاراستەیەکیان گرتووە بۆ گفتوگۆ دروستکردن لەگەڵ ئەوی دیدا، ئەوە شیعری بێگەردە گفتوگۆ دەکاتە هۆ و ئامانج و هەموو شتێك بۆ بەرزکردنەوەی هەستی خۆشەویستی و لەدایکبوونی پێوەندی لە دڵەوە لە نێوان سروشت و گەردوون و تەواوی بوونەوەر و کۆمەڵگەکاندا.

لەو ماوەیەشدا بە شێوەیەکی پڕاوپڕ و بێ هاوتا ئالوودەی چوارینەکانی بابا تاهیر و خەیام،... تاد. ببووم. توانای ئەوەیان پێدام دووبارە نەبوونەوە لە شێواز و ئاستداری لە ئێستێتیکای زماندا یارمەتیدەرن بۆ گەیشتن بە پلەی ئەشقی کەم وێنە و بەرهەمهێنانی تایبەت و پڕ بایەخ.

ژیان بەخششێکی خوداداوە و بەرهەمهێنانی شیعر بۆ من نهێنی بوونیەتی. هەموویان بە یەك شێواز بەرهەم نەهاتوون. شێوازی جۆراوجۆر و جیاکارن. هەندێکیان سادەن لە ڕووی ڕێکخستنەوە، مانایان بە دوای یەکدا هاتوون و مانا دەپارێزن، مانایەکی ڕوون و دیار ئاشکرا دەکەن. لە هەندێکی دیکەیشدا مانا لەناو جێگۆڕکێی کات و گواستنەوەی شوێن لە

شوێنی واقیعەوە بۆ شوێنی زەینی بزر دەبێت و دەبێتە هەست پێکردن. واتە وێنەکە مانایەکی ڕوون و دیار ئاشکرا ناکات، بگرە هەست دەکەیت شتێك هەیە لەم بارەدا مانا دەگۆڕێت بۆ هەست پێکردن. لە بینینی ڕۆژانە خۆی بە دوور دەگرێت، وەك خەیاڵی کتوپڕ خۆی قووڵ نیشان دەدا. لەسەر دوو شوێن نەوەستاوم، بەهەشت و دۆزەخ. بەهەشت ئێرە و دۆزەخ ئەوێ، بگرە شوێن شوێنێکی زەینییە و زەمەنیش زەمەنی دەروشانەوەی گیانە. لە هەر نیوە بازنەیەکدا ویستبێتم کوشتیتم و پاشان بووژاندوومەتەوە، نووسین، کە شوێنی زەینی هەڵدەبژێرێت ژیان لەناو زەیندا درێژ دەکاتەوە و پێکهاتەیەکی زەینی دەداتێ و لە فۆرمی زەینیشدا ڕێکی دەخاتەوە و دایدەمەزرێنێت. شوێنی زەینی لەم کار و هەوڵەمدا دەبێتە خود و دەبێتە بابەتیش، هەروەها دەبێتە شێواز و دەبێتە ماناش، لە شوێن و کاتی واقیعیدا هەقیقەتی ڕەها هەیە. واتە دەستپێکردن و وەستان، بەڵام لە شوێنی زەینیدا هەقیقەتی ڕەها نییە. کپی و هەڵچوونی گیان هەیە، شتەکان لە بیرکردنەوە و وێنەکردنی خۆیدا دەدۆزێتەوە. هەقیقەتی ڕەها دەیەوێت واقیع بپارێزێت و لە دۆخێکدا ڕایبگرێت و نەیخاتە بەردەمی پرسیاری کاریگەر و هەمیشەیی درێژ خایەن.

بەند نیم بە بنەڕەت و چۆنێتی سروشتەوە، ئەگەر هەشمبێت لە شێوەی تاڵە دەزوویەك هەبووە و دەمێنێتەوە. خەسڵەتی مرۆڤم داوە بە کەرەستەکانی سروشت و لەبارەی بوونی خۆیەوە هێناومنەتە گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن. ئەو بارەی تێدا دەدۆزرێتەوە، کە لە زمان و خەیاڵدا بۆی دەگەڕێن. شاعیر بوون لەناو کەرەستەکانی سروشتدا ئاسانە، بەڵام بە



شاعیری مانەوە لەناو کەرەستەکانی سروشت و گۆڕینیان بۆ ڕازەکانی مرۆڤ و گەردوون. دۆخگۆڕینە. خواستی نوێبەخشی، یان ناوکی بێگەردی شیعر لەو دۆخگۆڕینەدا دەردەکەوێت و دەرسکێت.

شیعر بۆ من ئامانجە و بە دوایدا دەگەڕێم و هەوڵی بۆ دەدەم، قەتیش بە دوای قسەی ئەم و ئەویشدا ناچم، چونکە بوونی شیعر هێزە بۆ پاراستنم و بێ بایەخکردنی لەرزۆکی و لاوازیی دەروونی ئەوان. داهێنان ڕق و کینە و ئیرەیی خاو دەکاتەوە و پەراوێزی دەخات. باری بەخۆداچوونەوە دەخەملێنێ و هەقیقەت دەکاتە پێودانگ و دەیهێنێتە پێشەوە. هەموو شتێکی سروش و بەهرەبەخش لە کولتووری مرۆڤایەتیدا بۆ ئاشنایی و یەکترناسین سەری بەرز کردووەتەوە و خەڵکی بینیوە و خەڵکیش بینیویەتی. سەرنجیان تێکهەڵکێشی یەکتر بوونە و لە بوونێکی هەست پێکراویان ڕوانیوە و خاڵ و هێڵی بە دواداچوونیان دۆزیوەتەوە. شیعر بەرهەمهێنەری سروش و بەهرە بەخشی ئەم کولتوورەیە، جوانیی گشتگیریش هێمای تایبەتی کولتووری مرۆڤایەتییە، بەڵام خۆم ئەم مانایەم بەرهەم هێناوە، کە خودم ویستوویەتی و سروشتم لە شوێن و فۆرمی زەینی ئاشکرا دەکات، کە خود و سروشتی مرۆڤیش لە ڕێگای شیعرەوە لە شوێن و فۆرمی زەینییەوە ئاشکرا بوو. شیعر وەك تیشکی خۆری لێ دێت لە بەرزترین لووتکە دەکەوێت، هەروەها لە قووڵترین دۆڵیش، بەڵام ڕەنگە هێزی گەرمایی بەخشینی لە لووتکەوە بۆ دۆڵ جیاکارییان بۆ دوو ئاستی دوور لە یەکتربن.

نوێبەخشی دیاردەیەکی گەردوونی و گیانیی گشتییە، ناوکی بەهایەك نییە، بگرە کۆمەڵێك بەهایە و بەهای لێوە لە دایك دەبێ و دەرسکێت.

پاشان بە ئاسۆیی و ستوونی گەشە دەکات و خۆی بڵاو دەکاتەوە. مەرجیش نییە شیعر هەڵقوڵاوی هەلومەرجی کۆمەڵگەیەك بێت. لە زەوی تایبەتکار و هەلومەرجی جیاکاردا هەڵدەقوڵێت. مەرجە پێوەندییەکی ڕاستەقینەی لەگەڵ هەستەکان و زماندا بەڕێوە بردبێت و تێگەیشتنیان بۆیەك هەبووبێ و گونجاندن بخەنە ناو ڕووداوە زەینییەکانیانەوە. با ئەم بارە ناسروشتییەش لەسەر چاو و برۆی شیعر لابدەین، کە گوتراو پێویستە شیعر بەناو دەروونی کۆمەڵگەوە شۆڕببێتەوە و ڕازەکانیان بلاوێنێتەوە و بە پێی خواست و پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان خۆی ڕێك بخات و بێتە گفتوگۆ. گۆشتی ئەدەب لە ئێسقانی بینین و واقیعی زیندووی ویژدانی جیاناکرێتەوە. ئەو واقیعەی کە لەناوی دەژین دەبێتە هۆی هەڵچوونی کتوپڕو جووڵانەوەکانی دەروون. بەبێ هیچ شاردنەوەیەك کێشەکانی خۆی بێ پەردە دەخاتە پێش دڵ و چاو لە ڕووبەرێکی تەسکدا بە جێی ناهێڵێت. لە چرکەیەکدا بەهرەکانی دادەچڵەکێن و بە ئاوازێکی بە جۆشەوە لە درێژبوونەوەی ڕستەدا کاروبارەکانی دەروون کاکڵی جووڵانەوەکانی خۆی بە جێ دەهێنێ. لەم بارەدا بەهرە بنەمایە و واتایەکی لێ پێکدێت و دەبێتە نەمریی دەروون.

کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩ هەولێر

## تێبینی

من دانیشتووی ماڵی بەختەوەری شاراوەم، ماڵی شیعر. برای گیانی و خوێنی هەموو وشەیەکم. لە کاتی نووسینی شیعردا نزیکایەتییەك لەگەڵ خەڵکی هەموو جیهاندا دەست پێدەکات و دەستت بە نهێنی خۆشەویستی ڕادەگات، نهێنی خۆشەویستی ورە بە شیعر دەدا و خۆشحاڵی و شادمانی لە ناخی شاعیردا دەڕسکێنێت. لەو ماڵی شیعرەدا دەمەوێت درێژە بە ژیان بدەم. ئەگەر خۆشەویستی و شیعر نەبووایە من مرۆڤ نەدەبووم، یان لانی کەم مرۆڤێکی باش بیرکەرەوە و تەندروست نەدەبووم.

بەرهەمی ئەدەبی بەبێ ڕاستگۆیی خۆشەویست نابێ. ئەو بەرهەمەم وەك سەرنج و تێبینی ڕۆژنامەوانی نووسیوە، بەڵام ئەو شیعرانەم هەڵبژاردوون، کە شتێکیان تێدا هەبووە و هەستم پێی کردووە. ئەم هەستپێکردنەش بەهۆی بایەخی داهێنانەوە لە بیرکردنەوەدا دەبێتە ڕووداو. نەشهاتووم قسە لەبارەی کرۆك و شیکردنەوە و پەیژەی سەرکەوتن و دابەزینیان بکەم. بگرە قسەم لەبارەی هەستپێکردنیانەوە کردووە. لە



هەستپێکردنیشدا گیانی بێگەردی شیعر، بە تەواوەتی بۆ ئەو بارەی لەبیرکردنەوەدا بووەتە ڕووداو دەکرێتەوە و ماوەت دەدا لە ناویدا نیشتەجێ بیت.گواستنەوەی هەست لە حاڵ و باری هەستپێکردنەوە بۆ ڕووبەری کاغەز دانپێدانان و بەرجەستەکردنیەتی لە جیهانی نووسیندا. تا لە ڕێگایەوە هەستپێکردنەکان بناسرێن و بێنە زمان و ببنە زمانی نووسین. ئەم سەرنج و تێبینییانە ئاشکرابوونی ئەم ڕازەن، ڕازی دەربڕینی دوای هەستپێکردن.

# له ئەلبوومی یادگارا

ئەفسوونی شیعر، ئێستێتیکا و ئاشتی لە دەروونی کۆمەڵگە ڕادەگەیەنێ. وەفا بۆ شیعر تێپەڕاندنی قۆناغی بەر لە خۆیەتی. تێپەڕاندن وەك جیاکاری نەك ڕەتکردنەوە. ڕەتکردنەوە لە ئەدەبدا هیچ کاتێك بنەمای نەبووە، چونکە لە ڕەتکردنەوەدا بەهای گفتوگۆ دادەڕمێ و پێوەندییە کولتوورییەکان دەپچڕێن.

جوانی کەشێکی ڕشوون و باوەڕپێکراوە. کاریگەری لەسەر هەموو بوونەوەرێك جێ دەهێڵێ، هەستەکان لە دەربڕین لە جوانیدا بە باشترین شێوە ئەرکی خۆیان بەجێ دەهێنن و توانایان پاراوە و بە دیواری ژیانەوە دەلکێن.

شیعر دیاردەیەکی سیاسی نییە، دیاردەی سیاسی دۆخێکی هەڵبەرە. دەربڕین لە ناوەرۆکی واقیع وەك خۆی ناکات. واقیع لە بوونی خۆیدا لە ڕێکخستنێکی جواندا جێگای کراوەتەوە. سیاسەت دەستی لێداوە و ڕێکخستنەکەی بەملاو ئەولادا بردووە. ئەمە بڕیار و بۆچوون و پێوەرێکی شیاوە، سیاسیبوونی ئەدەب لادان و خۆدزینەوەیە لە ئامانجی ئەدەب، ئامانجی ئەدەب دامەزراندنی بڕوا و بنەمای جوانییە بۆ ژیانێکی نەشڵەژاو تا ئارامی هێزی خۆی تێدا وەرگرێت و



جوانیبەخش بیکات بە کەرەستە و وزەی دەربڕینی، بە پلە و ئاست پەیامی تایبەتکاری خۆی بەڕێوەببات. هەر شاعیرێك پشتی دا بە پشتی دەسەڵات، نەك جێگای باوەڕی گوتنی جوان، بگرە جێگای باوەڕی هونەریش نییە.

ئەم شاعیرە لە ڕووی پێکهاتەوە شیعرەکانی پڕ سۆز و دیمەنی هەستدارن. زۆرتر بەرهەمی خەیاڵن لەوەی بەرهەمی هێزی بیرکردنەوە و کۆ زانیاری بن. جۆرێك داهێنانی لەنێوان شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا پێشکێش کرد، بووە بەخشندە و ناوەندێکی کراوە بۆ شاعیرەکانی دەوروبەری و لە هێڵی پەرەسەندنیدا کاریگەریی خۆی زاڵ کرد، بەڵام لەم ماوە دیاریکراوەدا زیاتری تێ نەپەڕاند و کۆتایی پێ دێت. تواناکانی لە ئەزموونی قووڵ و دەوڵەمەندتردا، کەش و دۆخێکی تاکە کەسی پێك نەهێنا. کەواتە کاریگەرییەکەی لە یەك قۆناغدا دەرکەوت و وەستا و نەبووە گیانێکی چالاك و بەرهەمهێن لە جەستەی بەردەوام بە گوڕوتینی شیعری کوردیدا.

ئەگەر شیعر جوان لەبارەی ژیانەوە بنووسرێت، لە ژیان خۆی جوانترە. شیعری ئەم شاعیرە لەسەر بنەمای هەست و سۆز و ئاسۆکانی خەیاڵەوە شێوەی خۆی وەرگرتووە. توانیشی تەنیا لەم بوارەدا بەهرە بە باشی بەکاربهێنێت و ساتی شیعریی بە دوای بەهرەی دادێت و لەگەڵ خۆیدا دەبیات بۆ ناوچەکانی شیعر. لە دەقی ئەدەبیدا خەم و خورپە وەردەچەرخێنن بۆ ئێستێتیکا. لەو کەشە هەستی و سۆزدارییەدا شاعیر دەرەوە بەجێ دەهێڵێت و لە ناوەوەی نیشتەجێ دەبێت، لە ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵگە و خۆی

یاخییە. خەمۆکی و دڵەڕاوکێ و شاگەشکەیی و هەڵزەقینەوە هەڵسووڕێنەری کردە و کردەوەی دەبن. لەو پێودانگەوە بە زمانی ناوەوە مانا بۆ بوونی مرۆڤی و ختووکە تایبەتییەکانی دەدۆزێتەوە، هەروەها ئەو ترپە و ئاوازە خێرایەی ژیانی ڕۆژانە بەلاوە دەنێت، ترپە و ئاوازی ناوەوەی خۆی وەك سەرچاوە کار پێ دەکات، ئەو ترپە و ئاوازەش خاودەبێتەوە وەك ئەو بارە دەروونی، یان دەربڕینە دەروونییانەی، کە ژیانی بەرێوە دەبەن و دووچاری یاخیبوونیان کردووە. نموونە: وەك لە شیعری (خۆشم ویستی)، یان لە شیعری (چەند هەناسەیەك)، یان لە شیعری (چەند تاڵە بیرێکی ئاڵۆزکاو) دەردەکەوێت.

لەبارەی تێگەیشتنەوە شیعرەکانی وەك ئاوریشم و خاکی تەڕ نەرمن. وەك گۆرانی فۆلکلۆری و بەیت و داستان ڕوون و سادەن، بەڵام لەباری مانای شاراوە و چینەکانی بنیاد و داڕشتندا پڕ و فراوانن، خاوەن ئاسۆی دوور و بواری قووڵن. پێوەندییان بە کولتووری تاکە کەسییەوە هەیە. لە هێڵی گشتیی ئەزموونکردندا یەك ئازاری ئەزموون کردوو و خەیاڵی دیارە، ئەو ئەزموونەی نەگەیاندووەتە خەیاڵی نادیار و یادەوەری ڕانەچڵەکاندووە. واتە: مەودای پێوەندی لەگەڵ (خەیاڵی دیار)دا بەهێزترە لەوەی لەگەڵ (خەیاڵی نادیار).

هەستیاریی زمانی خۆی نیشانداوە، پێش ئەوەی ترپە و ئاواز لە وشەدا وەرنەگرێت، نایهێنێتە ناوەوە، یان بەسەریدا خول ناخوات، یان بەسەریدا باز نادات، هەروەها لە ڕووی بەکارهێنانی وشەوە تووشی بەد بەکارهێنان نایەت. وشە ئاراستەی باش بەکارهێنانی خۆی وەردەگرێت.



سوودی لە شێوازی بەر لە خۆی وەرگرتووە، بەڵام پەیڕەوی نەکردوون. لە نەوەی خۆشی لە شێوازدا لە زۆرینەیان ئەندازیارترە. لە مۆسیقاشدا کاری بە مۆسیقا و پیت و وشە و دەستەواژە و ڕستەی شاعیرانی بەر لە خۆی نەکردووە. هەرێمێکی بۆ دابەشکردنی ڕستە و مۆسیقا لە شیعردا بنیاد ناوە، بەڵام بۆ تێگەیشتن و بنیادنان وزە و هێزی لە ئەزموونی بەر لەخۆی وەرگرتووە.

لەبەر ئەوەی ئەم دابەشکردن و مۆسیقایەی زۆر هونەری و زاڵ بوو، شاعیرانی دوای خۆی نەیانتوانی لاسایی بکەنەوە، یان کاری لەسەر بکەن و لێ زیادبوونی بۆ بکەن، بگرە وەك دەست وەشاندن و داهێنانێکی تاکانە هێڵی بۆ کێشا و دایمەزراند. داهێنانی سادە بە ئاسانی و زۆر زوو دێتە دەست و دەتواندرێت لاسایی بکرێتەوەو کاری لێ زیادبوونی لەسەر بکرێت.

جیاکارییەکی بنەڕەتی هەیە. بەتایبەتی لە گۆشەنیگای شاعیرانەوە و ئێستێتیکییەکی ڕوون و ئاشکرا. پشت ئەستوورە بە سروشت و پێکهاتەی خۆڕسك و دەست لێ نەدراوی سروشت. لەسەر ترپە و ئاوازی پێکهاتەی سروشت وێنە دادەهێنێت. نموونە: پێوەندی دروست دەکات لەنێوان با و درەخت و مۆسیقای جوولاندنەوە. لە هەمان کاتدا هۆی پیتاندنی درەخت بە یارمەتی باوە دەکاتە دیاردەیەکی کرۆکی و ناوکیی سروشت.

واتە بە تەنیا لەسەر (زەینی سروشت) کاری نەکردووە، بگرە لەسەر (مندالدانی سروشت) کاری کردووە، پێکەوە ژیان و پێکەوە هەلکردنی پێکهاتەکانی لە ڕستە دیار دەکات و لە شیعرییەتی دیمەن دەیاندرەوشێنێتەوە. سروشتی پێوەندییەکانیش بە واقیعەکەوە ڕوون دەکاتەوە،

ئەو ڕوونكردنەوەيەش تواناييمان بۆ خوێندنەوە پێ دەبەخشێت، يان هارمۆنييەت و هاوئاهانگييەك لەنێوان ڕەنگەكان وەك خەسڵەتی وەرز لە وێنە و فۆرمی جيا جيادا گۆشە و كەنار و ناسنامەی لە يەك نەچوويان دەداتێ.

شوێنی لەدايكبوون و گەورەبوون پێناسەی زەينی شاعير دەكات بۆ ئێستێتيكا و گەڕانەوە بەرەو يەكەم ناسينی شوێن، هەروەها هەوڵدان بۆ ناسينی شوێنە نەناسراوەكانيش، كە بەشێك لە ئێستێتيكای يەكەم شوێنی دێتە ناوييەوەو هۆ و پاڵپشتێكە بۆ خەملآن و كرانەوەی بير بۆ سەر شوێنەكانی ديكە و ناسينی. شاعير ئەگەر نەتوانێت لە ئێستێتيكای سروشت تێبگات، بێ هيچ گومانێكيش ناتوانێت ئێستێتيكايەك بۆ تێگەيشتن و بەكاربردن لە زەين و هەستی خۆيدا پێكبهێنێت.

گۆشەنيگای بيناسازی و كێشانی پێوانە لە هاوسەنگی و شكۆی سروشت وەردەگرێت، بەڵآم نەيتوانيوە كار لەسەر بيری سەرهەڵدانی سروشت بكات، يان ئەم لايەنە، كە گۆشەنيگای بايەخە لەناو شيعرەكانيدا بزرە و دەستی بۆ نەبردراوە، هەموو دياردە و داهێنانێك پەيوەستە بە هۆشيارييە تايبەتييەكانی شاعير و جێكردنەوەی فەنتازيا و ئێستێتيكا لەناو زماندا.

( لە ئەلبوومی يادگارا ) ناونيشانی كتێبێكی شيعری (جەمال شارباژێڕی)يە، ساڵی ١٩٨٣ لە دووتوێی ١٧٥ لاپەڕەدا لە چاپخانەی (ئۆفسێتی سەركەوتن) لە سلێمانی چاپ كراوە، ئەم شيعرانەی تێدايە: (كسپەيەك، بۆ، هەستێك، لە سەيرانێكدا، ئەگەر، نەكەی، تاكە شيعر و



بەس، دركاندنێك، گوندێك و كچێك و يادێك و شيعرێك، ئارام، پرسيارێك وەرامەكەی لە خۆيدايە، نامەيەكی كراوە، دانيشتن لەگەڵ تۆدا، لە جەژندا، ديسانەوە خەم، هەژدەی سێ، چڵی نەرگز، لە جياتی كارت، خۆشم ويستی، بۆ مەرگی پڕشنگ، ئەگەر تۆ بۆ من بوويتايە، لەسەر سێ گڵكۆدا، چەند هەناسەيەك، لەسەر بەردە نووسێك، بەناوێكی ترەوە گەڕايەوە، گۆرانييەك بۆ شيرين، ئاخێك، خەمێكی تر، چاكتر بمناسە، چاوچاو، چەند تاڵە بيرێكی ئاڵۆزكاو، دوای دە ساڵ، پشيلە، ڕازێكی نوێ، نەوزاد، وێنەيەك، كەتەی كەر پياو، بۆ جوانێك، ئەمشەو، وەرە جوانێ، دايكی دڵسۆز، بێ ناونيشان، ئای ئای، لەسەر تۆ، باوكايەتی، مۆڵەت، بۆ كچێكی جوان، تازە من و تۆ، بەهەستێكی خاوێنەوە.)

وێنەيەك
ئەم وێنەيە
بۆچ زويرە
بۆچی بێ زەردەخەنەيە
لەبەر نيگای كامێرادا
كە وەستاوە
چی لەبيرە
چی لە دڵدا حەشار داوە
وا دڵگيرە
* * *

ئەم وێنەیە

چاوی نازی کردووەتەوە و نایترووکێنێ

جوانییەکەی بێ وێنەیە

هەر ئەمێنێ

گەنجینەیە

* * *

ئەم وێنەیە

لە ئەلبوومی یادگاردا

سبەینێ

بزەی خۆش و کزەی ناخۆش ئەهێنێ

خاوەن ئەم وێنەیە کاتێ

تەمەنی پیری ئەیگاتێ

خەم و خۆزگە ڕای ئەژێنێ

فرمێسك و خەندەی ئەداتێ

یادەکانی ئەورووژێنێ

* * *

ئەم وێنەیە

لەو شوێنەیە

کە بیلبیلەی گلێنەیە

سەرنجی ڕاکێشا بوو

لە نوێنی نەرمی هەستمدا



ڕاکشابوو

خۆی کرد بە ژووری میوانی هەڵبەستمدا

خۆی بە دیوانەکەم ناسی

بە دیوارێ

لە دیوارە سپییەکانیدا

خۆی هەڵواسی

شیعر وێنەی شاعیرە لە ئاوێنەدا، شاعیر لە ئەنجامی خراپیی بارودۆخ و زەبروزەنگی دەسەڵات و دەوروبەر، لە واقیعی دەرەوە یاخی دەبێت و بەجێی دەهێڵێت، لە ناوەوەی خۆیدا واقیعێکی شیاو بۆ نووسین و پێوەندییەکانی ژیان دادەمەزرێنێت، لەگەڵ دیاردە بنەڕەتی و ناوەکییەکانی سروشتدا تەباییەکی گیانی هەستی دەهێنێتە ئاراوە. نەك لەگەڵ ئەو دیاردانەی لە ڕێگای دەسەڵاتەوە کار لە ژیانی کۆمەڵگە دەکەن و بارودۆخ دەگۆڕن، سروشت لە پێکهاتەی ناوەوەی خۆیدا گیانێکی پڕ لە ناکۆکی هەیە، لەبەر ئەوەی زوو زوو دەگۆڕێ و جووڵە و پێداویستییەکانی وەرزێك تەواو جیاکارە لەگەڵ ئەو وەرزی بە دوای دادێ و پلە بە پلە چاودێری یەکتر دەکەن.

مامەڵەکردنی ئەم شاعیرە لەگەڵ سروشتدا کرانەوەیەکی تازە بەخش نییە لە شیعری کوردیدا، پێشتر زۆر ئەندازیارانە مامەڵە لەگەڵ سروشت و پێکهاتەی سروشت کراوە و هارمۆنییەتێکی گشتیشی تێدا دۆزراوەتەوە، لەگەڵ ئەمەش جۆرە جیاکارییەکی تێدا بەکارهێناوە. سروشتی کردووە بە جێگرەوەی خۆشەویستەکەی و بەشێك خۆشبەختی بۆ بەدەست هێناوە، کە بەهۆی خۆشەویستەکەشییەوە لە سروشت دەدوێ سەیر خوێنەر دەورووژێنێ

و ڕێگایەکی بۆ دەدۆزێتەوە تێدا بەرەو پێشەوە بڕوات تا دوا ڕادەی توانەوە و ڕووداو چێژ لە سروشت وەردەگرێت و لە ئەنجامدا هەموومان بۆ لای دەگەڕێنێتەوە و شەیدای سروشتمان دەکات، بەڵام لە ڕێگای سروشتەوە بیرمان پێ ناکاتەوە، سروشت دەکاتە بەشێك لە ئێمە بۆ بیرکردنەوەو چێژ وەرگرتن. سروشت سەرچاوەیەکی سەرسوڕهێنەرە بۆ ئەم شاعیرە و تێیدا شتە بچووکەکانی خۆشدەوێت و سەرسامان دەکات بە ئەوینی خۆی بۆ سروشت و ئافرەت.

شیعر ڕۆڵی لە دەرخستنی جیهان نییە و شاعیریش لە چەقی کۆمەڵگە ناژییێت، تا باری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریو... تاد. ڕابگرێت، لە گۆشەیەکی ئێستێتیکییەوە باری سەرنج دەنووسێت. ئەو باری سەرنجانە کاریگەریی بنەڕەتییان بۆ گۆڕان نییە. ئەگەر بشیبێت زۆر لابەلا و لاوەکی دەبێت، ئەدەبی ئەم شاعیرە جۆرە ئەدەبێکی نائومێدانەیە و ژیانێکی دیکەی تێدا ئاشکرا نابێت.

لە هەموو شێوەکاندا واقیع کاریگەریی خۆی دەبێت، شیعری هەستی، دوورە لە زیادەڕۆیی واقیع و بە دوا دەمدان. لەناو بەرهەمی هەستیدا دەتوانین ئەو تۆخمە سەرەکییانە بدۆزینەوەو دەستنیشانی بکەین، کە دەبێتە یارمەتیدەر بۆ ڕەواندنەوەی خەمۆکی و دڵەڕاوکێ، یان بۆ تۆخکردنەوەو بەرزبوونەوەی باری هەڵزەقینەوە.

واقیع جەستە و شوێنێکی نووسراوە، بۆ شاعیری هەستی، بایەخی سەرەکی نییە، چونکە شاعیری هەستی، ناگەڕێتەوە سەر نووسراو و دووبارەی ناکاتەوە. تەنیا بیر لە بنیادی مێژوویی جەنگە گەورە و بچووکەکان دەکاتەوە، ڕۆشناییەکە بۆ پرسیارکردن و ئەزموون. ئایا پێکهاتەی ئەو بارودۆخە چییە، کە پاڵنەر و ڕێخۆشکەر بووە بۆ ئەوەی



شاعیر لە واقیع هەڵبێت و لە ناخی خۆی نیشتەجێ ببێتەوە، یان بۆ ناتوانێت لەگەڵ ناهەمواریيەکانی واقیع بگونجێت، یان ئەو بارە بۆ دروست بوو. ئەمە پرسیارێکە چارەنووسی وەك ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی سروشت نادیارە و بەردەوامیش ئەو نادیارییە بووەتە خولیا و هۆی نیگەرانیی مرۆڤی هەستپەروەر.

نیسانی ٢٠٠٨ هەولێر

# ڕێگا دوورەکانی چاومان

شیعر و هونەری واقیعی ئاراستەیەکی واتادارن بۆ ژیان و لەسەر ڕێوشوێنی بینینی شتەکاندا بنیاد نراون و بەڕێوەدەچن. جوان کارکردن ئەو قەناعەتە پەیدا دەکات و دووپاتی دەکاتەوە واقیع بە هیچ شێوەیەك بارێکی نەگۆڕ و جێگیر نییە. هەندێك جار کتوپڕ گۆڕانێکی گشتگیر وەردەگرێت، لەم بارەیاندا دەستەبژێر داڕێژەری بنەمای ئەم دۆخگۆڕینەن. هەندێك جاری دیش دۆخێکی سست و ناچالاك وەردەگرێت. لەو بارەیاندا زۆرینەی جەماوەر ڕۆڵ دەبینن. دەبێت پرسیار لەو ئەدەبە بکرێت، کە بە مەبەستی ئاکاری واقیع و بزووتنەوەی واقیع دەنووسرێت، یان بارودۆخ بەرهەمی دەهێنێت. هەست و نەستیش لەگەڵ بارگۆڕینی واقیع بەرز دەبنەوە و دادەکەون، جۆرێك هەژان وەردەگرن و لە ئەنجامدا هەوڵدەدەن پێوەندی بە شتێکی نادیار و نەدۆزراوەوە بکەن. ئەمیش گەردوون و بوونی خودایە. واقیع و خەیاڵ دوو ئاراستەی پێچەوانە نین و جیاکاری نێوانیان جیاکارییەکی زۆر نییە، چونکە خەیاڵیش بەشێك لە واقیعی تێدایە و واقیع ئاراستەی دەکات بۆ بەرزبوونەوە و گەیشتن بە کانگای خەملێن.

شتەکانی واقیع دیار و بیندراون و شتەکانی ناوەوەی مرۆڤیش نادیار و نەبیندراون، بە جێگۆڕکێکردنی بیندراو و نەبیندراوەکان دۆخی شیعری بۆ



شاعیر دروست دەبێت و بیندراو و نەبیندراوەکان ئاراستەی هەست بە شتکردنی دەکەن.

ئەم شاعیرە لە قۆناغی حەفتایەکانی شیعری کوردیدا گوڕێکی بەخشندە بوو. ئەوەی لە ئەزموونیدا خەسڵەتێکی بەهێز و دیارە و سەرنج پڕ مەودا و قووڵ دەکاتەوە، کەم و دەگمەن کێش و سەروا دەمێنن. کێش و سەرواش دەنگەکان ڕێکدەخات و دەورێکی کاریگەر وەردەگرێت بۆ فراوانکردنی مانا. هەموو ڕستەیەکی شیعری کێشی تێدایە، بەڵام هەموو کێشەکان دیاری نەکراون بۆ پێوانەکردن. ترپە و ئاوازیش لە کاتی گۆکردندا دەردەکەوێت. بە چوونە ناویەکی ترپە و ئاوازی گەرم و ڕەگەزە بنیادنەرەکانی زمان مۆسیقایەك دادەهێنێت خوڕ و سەرپەڕ. وردە دەمارە قووڵەکانی هەست لە مرۆڤدا دەدۆزرێتەوە بۆ بزواندن. وا لە مرۆڤ دەکات لە شوێنی خۆی هەستێت و هەوڵ بدات شوێن بگۆڕێت. ترپە و ئاواز لەم شوێنگۆڕکێیەدا وەردەگرێت. ترپە و ئاوازێکی بە جۆش بەسەر گیان و دڵی وێنەکاندا دەڕێژێت. گیان و دڵەکان دەجمێن و ئامادە دەبن بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و نیشتەجێبوون لە ناوچەی شیعر و واقیعی زیندوودا. مۆسیقاش هاوسەنگ دەبێت بە واتا. مۆسیقا لە ڕستەدا بنیادێکە بۆ بەخشینی چێژ، بەڵام وێنە لە جەستەی دەقدا بنیادێکە بۆ بەرجەستەکردنی مانا.

لە باری ماناییەوە بە دووربینییەوە دەڕوانێتە کێشەو گرفتی مرۆڤی وڵاتەکەی وەك کێشە و گرفتی سیاسی. نەك کێشە و گرفتی مرۆڤیی، کە تاکی کورد لە ساتی لە ناخ ڕامان و هێوریدا هۆشیاری خۆی تێدا بدۆزێتەوە.

له ناخ ڕامان لای مرۆڤی هەستیار پەیمانی ئومێدە. نموونە: وەك لە شیعری (نەخشەی خەونەکان)، یان لە شیعری (لە کوێم)، یان لە شیعری (چرپەی ژانێکی نوقمبوو) یان، لە شیعری (گریە شیعر) دەردەکەوێت.

بیندراو و نەبیندراو لەناو ئومێددا بوونیان هەیە. هەموو ڕاستییە بیندراوەکانیش ڕاستییەکی شاراوەی دیکەی تێدایە بۆ مانادان بە گیان، کە گیان هەمیشە بوونێکی نادیارە، پەرجووی هێزێکی دەوێ بۆ فۆرم پێدانێکی ئەفسوونی. شیعر، کە دەبێتە تێڕامان بەرانبەر بە بوون، گیان بەهۆی دەسەڵاتی زمانەوە فۆرمی ئەفسوونیی وەردەگرێت. کەرەستەی سەرەکی دەرخستنی ڕەگەزە هونەرییەکان لە شیعردا زمان و پێکهاتەی زمانە. بوونەوەر خستنە ناو ئەو فۆرمە ئەفسوونییە، مرۆڤ تێیدا لە پێناو ناسینی ڕاستیدا هەوڵی لێکدانەوەی شتەکان دەدات، ئەو ڕاستییە شاراوەیەی لەناو ڕاستی بیندراودا دەناسرێت.

وێنە و تۆڕی چاو توانای فراوانبوونەوەیەکی کاریگەریان لێ پەیدا دەبێت و دێنە ڕوو بۆ بەکارخستنی زمان و دیارخستنی واتا و سەقامگیرکردنی وێنە لە هەندێك باردا و ناسەقامگیرکردنی لە هەندێك باری دیکەدا. بنیادنانی پێوەندییەکی فرە ڕوخساریش لە ئاستی داهێنانی هەردوو بارەکەدا.

لەلایەنی مۆسیقا و ترپە و ئاوازی شیعرییەوە ناوەند و ڕایەڵێکە دەتواندرێت لێیەوە هەنگاو بۆ داهێنانی دیکە هەڵبگرێت. بینینێکی شۆڕشگێڕانەی بۆ دۆخگۆڕین و ئیستێتیکای ژیان پێشکێش کردووین.



لەسەر هێڵی شیعرەوە پێ بە پێ جەماوەر دەهێنێت و زەمینەیان دەداتێ بۆ ڕەگ دروستکردنیان لەناو گۆڕان.

ئاڵوگۆڕی هەستەکانی لەگەڵ دەورووبەریدا دەکات و دەیانهێنێتەوە ناو بوونی خۆی لە هێڵی گۆڕانەکانیشەوە شیعر بە چنینێکی کارامەوە پەیامدار دەکات بە هونەر و نەریتی هەستیار و جوان، بەڵام لەلایەنی واتا و تێگەیشتنەوە تارادەی ساکارییەکی دوو دیوی هونەری و پڕ ئەفسوون، ڕوونێکی لە خشتەبەرە. بەردەوام لە بارێکەوە دەتگوازێتەوە بارێکی دیکە. نێوانی بارەکانیش دەخاتە بەر پێوانە و نیشان، وەك خاڵێکی ناوەند، بیر و هەستی لەسەر دەگیرسێنێتەوەو یارییە زمانییەکانی خۆی لە ڕێگای کولتووری کۆدا تێدا بەکاردەخات.

گفتوگۆی ڕۆژ وەك بەکارهاتوویەکی ئەندازەیی بەبێ کەم و زیاد بەکاردەهێنێت و توانا زەینییەکانی خۆی تێدا نیشان دەدات، ئەو زەینەی فۆرم بە شتە هەستییەکان دەدات، گیانێکی جەماوەرخوازە و شیعرەکانی دەربڕینی ڕاستەقینەن لە ناسنامەی کۆمەڵگەی کوردی وەك باری سیاسی نەك وەك باری گیانی، هەروەها دەچێتە ناو قەوارەی زاندراوی (کولتوور) و (مێژوو) بۆ دۆزینەوەی خەیاڵ و پڕ وزەکردنی زمانی هەستیارکراو بە دەنگی کۆ، بەمەشەوە هاوکێشەیەکی لەنێوان دەنگی تاك و کۆ بنیاد ناوە و دەنگی تاکیش ڕادەکێشێتە ناو دەنگی کۆوە، ناکرێت شاعیر تەواو دەنگی کۆ بێت، چونکە ئەم تێگەیشتنە شیعر بەرەو میللیبوون دەبات، کەچی ئەم شاعیرە بینینی لە دەنگی کۆدایە و مەودای هونەری و شێوازی نوێبەخشی وێنا کردووە.

تێگەیشتنیشمان بۆ چالاکبوونی ژیان لە واقیعی زیندوو توندوتۆڵ دەکاتەوەو ئاماژە دەدات لێی بکۆڵینەوەو تێی بگەین. ئەوجا لەناو (واقیعی زیندوو) ببین بە کەس و کەسایەتی کارا و دۆخگۆڕ لەبارە ئێستێتیکییەکانی کۆمەڵگەدا.

(ڕێگا دوورەکانی چاومان)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (جەلالی میرزا کەریم)ە. ساڵی (١٩٩٢) لە دووتوێی (١٤٥) لاپەڕەدا بە شێوەیەکی سەرەتایی و هەژارانە لە سلێمانی چاپ کراوە، ئەم شیعرانەی تێدایە: (ڕازەکانی هەفتە، تەمەن، نەخشەی خەونەکان، لە کوێم، پێشکێشە بەو شۆڕشگێڕانەی هێشتا نەمدیون، ئاوێنەی هیوایەکی سەرهەڵگرتوو، ڕێگا دوورەکانی چاومان، تێگەیشتنی یادگارییەکان، وەرزەکان، دووری، زەماوەندی باوەش پێداکردنەوە، ڕۆژگارە سەرگەردانەکان، ڕێگا، وەرام، هەنگاوی زام، هەڵوێست، نەورۆزی خۆزگە، گەشتە هەڵوێست، ناونیشانی یادێکی کۆچکردوو، حەز نامەیەکی ئاوارە، چرپەی ژانێکی نوقمبوو، سەرەتای حەیرانی تەمەنمان، گریە شیعر، هاوڕێ، لە خەمی هەڵەبجەی ژاردا، پەیامە ژێ.)

**ڕازەکانی هەفتە**

**دڵداری**

**من لە وانەی دڵداریدا**
**لە دوا ڕیزی قوتابییەکانی پۆلدا بووم**
**چونکە تەنیا لەگەڵ ژانی**



**ئاوارەیی خۆشەویستەکەی خۆمدا بووم**

**نهێنی**

**ئەزانن من پاسەپۆرتی**
**ڕەشکراوەی فرمێسکم لە گیرفاندایە**
**یەك یەك ئێستگەکان جێ دێڵم**
**بەبێ ئەوەی بزانن چی لە دڵمدایە**

**شەرم**

**بە ڕێکەوت کە لە ڕێگادا تۆ ئەبینم**
**شیعرەکانم شەرمەزارن**
**کە ناتبینم**
**چاوەکانی بینینەوەی وشەکانم هەر بێدارن**

**نیشتیمان**

**کە هەست لەناو ئاگری دوور وڵاتیدا**
**ڕازەکانم ئەسووتێنێ**
**بەهارە ڕێ گوڵی دەنگم**
**لە پاییزی بەستەکانمدا ئەپروێنێ**

**پەشیمانی**

**دڵدارەکەم چەقۆی ڕقی زیزبوونی خۆی**
**بست بست بەناو گیانمدا گەڕاند**
**هەتا لەناو پەڕەی دڵمدا**
**لە خوێنی خۆی دەریای پەشیمانی هەستاند**

دڵ

من ئێستاکه له دڵ دوورم نازانم هەم
یا ڕێگای نەمان ئەگرم
کامتان له دڵتان نزیکن
ئاشکرای کەن تا دەستتان لەگەڵدا بگرم

شۆڕش

ئەتانەوێ من بناسن
من عاشقی ڕێگایەکم مەرگی تیا بێ
که هەڵوێست مرد بۆچی نابێ
دەروون شیعری شۆڕشێکی تری تیا بێ

شیعری (ژانی ڕۆژانی هۆنراوە)، که له ژماره (٣)ی گۆڤاری (ڕوانگه)دا ساڵی ١٩٧٢ بڵاوی کردووەتەوە. شیعری (ڕوانینەکانی چاوی شەقام)، که له ژماره (٨)ی گۆڤاری (بەیان)دا ساڵی ١٩٧٣ بڵاوی کردووەتەوە. مەودایەك بۆ سەرنجدان دەکەنەوە. دەکرێت ئەم دوو شیعرەی وەك مانیفێستی شیعری حەفتایەکان خەسڵەتی شیعری ئەو قۆناغەیان تێدا کۆ بکرێتەوە و ببیندرێت، که شیعری ئەم قۆناغە نوێنەری دەنگی کۆیە. ئەمەش بەشێك له شیعرییەت له دەقدا وەردەگرێتەوە، یان تروسکەکان پەرش ناکات، بگرە بۆ بە ئاسانی دەستەمۆبوونیان چەپکیان دەکات.



له بواری دەنگی کۆدا قووڵ بووەتەوە و هەر لەم بوارەشدا سنووری خۆی نەخشاندووە و ناو و توانای خستووەتە ناو دوو کەوانەوە، که له ئاستی داهێنان له بواری دەنگی کۆدا فەرامۆشکردنی مەحاڵە. دەنگی کۆ و دەنگی تاکیشی بە دوو جەمسەری هاودژ بینیوە، بۆیە له کولتووری ڕۆشنبیریدا لەنوێوە بیری نەکردووەتەوە، خودی کولتوور نیشانمان دەدات کولتوور دەنگی ڕابردووی کۆیە، نواندنی بوون نییە، بوون خۆ ڕۆشنکردنەوەیە بە شیعرییەتی قووڵ و جیهانی شاراوەی داهاتوو. دەشبێت ئەو بوونە کاریگەر بێت بە سروشتی خەیاڵ و خەیاڵ بەناو هەستەکاندا تێپەڕێنێت.

مانیفێست ئەو بەرهەمەیە، که مۆرکی گەرموگوڕی و خەسڵەتی تەواوی قۆناغێکی شیعری له خۆیدا پاراستبێت. وەك ئەزموونێکی زیندوو ناسنامەی ڕوونی تێدا ئاشکرا کرابێت و هەمیشه بۆ بزواندنی خەیاڵ ئاسۆیەکی کراوە بنوێنێت.

قۆناغی دواتر وەك (ڕامانی سەرەکی) بۆ تێگەیشتن و خاڵی بینین و گەشتی دۆخگۆڕین بگەڕێتەوە سەری و گیان له ناوی ئامادە بێت بۆ دۆنایدۆنکردنی دەق، یان چوونە ناویەکی دەق.

شاعیرانی حەفتایەکان له سەرەتای ئەزموونیاندا بەشی زۆرینەیان له (ڕەنگ) و (فۆرم)دا له (ڕووبەری بیندراو)ی ئەم شاعیرە سوودمەند بوونە. دەکرێت وەك (دیاردە) و (دامەزرێنەر)ی ماوەیەکی دیاریکراو (١٩٧٠-١٩٧٥) ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی کاری زانستییانەی خۆی لەبارەوە جێبەجێ بکات و کاریگەری لەسەر شاعیرانی دەوروبەری

دیاری بکات، بەڵام دوای ئەو ماوە دیاریکراوە ئەزموونی بەرەو کزی دەڕوات تاڕادەی لە کورتیدان و شکست هێنان. ئەم ڕووداو و گۆڕانەش ئەوە بنچینە و پێشینەیەتی، کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەو بەگژداچوون شیعری بە دەنگی کۆ و دنەدانی جەماوەر زانیوە، کە لە کوردستان دەربەدەرکرا و لە تاراوگە نیشتەجێ بوو، پچڕان و بۆشاییەك کەوتە نێوان دەنگی ئەم و دەنگی جەماوەر-کۆ، لە نیشتەجێبوونی لە تاراوگەدا مەودایەکی نوێ لە شاعیریەتی ئەو زیادی نەکرد. بگرە مەودای بیرکردنەوە و دەربڕینی لە دەنگی کۆدا تێدا خاو بووەوە و لە وەستان نزیك بووەوە. لە بنەڕەتدا دەنگی شیعر دەنگێکی تاکییە لەناو ئێستێتیکادا هاوتا بۆ دەنگی خۆی دەدۆزێتەوە. دەنگی کۆ زیاتر لە ڕۆمانی فرە شاکەس و فیلم و شانۆ و سینەما ،... تاد. ڕۆڵی کاریگەر بەدی دەهێنێت نەك لە شیعردا.

(فەرمانسالاری) و (داوا) لە شیعرەکانیدا وەك دوو هێڵ بەیەك ئاست و بینین و تێگەیشتن کاری لەسەر کردوون. لە کاتێکدا وا دەخوازرێت بۆ فەرمان بە دەنگی تووڕە و ناڕەزایی بدوێت و بۆ داواش بە دەنگی نەرم و ئاوازدار.

ئەم دوو ئاست و تێکەڵکردنەش خاڵی تێڕامان و تێگەیشتنیەتی بۆ شیعر وەك ناوەرۆك و ئەوجا شیعر وەك شێوە. ناوەرۆك و شێوە لە شیعری هونەریدا یەك دەگرن و لە ئێستێتیکدا دەبن بە خاڵی توانا‌داری، واتە شیعرییەت. شیعرییەتیش پرۆژەیەکی تەواو ئێستێتیکییە و لەسەر بیر و زەین و خەیاڵی بەرز دەوەستێت و خۆی ئاشکرا دەکات.

مایسی ٢٠٠٨ هەولێر



# گەردەلوولی سپی

شیعر تەنیا پارچەیەك نووسراو نییە، بگرە شێوازێکە بۆ کۆکردنەوەی هەستەکانی مرۆڤ، بەشێوەیەکی ئەفسوونیش پێوەندی ئەو کۆکردنەوانە ڕێکخراون، یان ڕێکدەخرێن. بەو پێوەرەی هەموو مرۆڤێك لە ساتە پڕ هەستەکانیدا شاعیرە، یان پێویستی بە شیعرە بۆ بەرەنگاربوونەوەو ڕووبەڕووبوونەوەی هەندێك باری گیانی، یان لێڵکردنی بیر. شیعر لەو ساتەدا ئەو شتەیە، کە ناتواندرێت بنووسرێت و بەردەوامیش لە هەقیقەتێکی ئێستێتیکیدا دەچرپێنێ.

ئەم شاعیرە لە واقیعێکی مەترسیدار و تۆقێنەردا شیعرەکانی نووسیوە و چووەتە ناو شتە شاراوەو دەرکەوتە نوێیەکانی کۆمەڵگەوە، بەڵام نە خۆی وەك شاعیر لەناو شتە شاراوە و دەرکەوتە نوێیەکان دەرهاتووە. نە شتە شاراوەو دەرکەوتە نوێیەکانی کردووەتە (پێکهاتە) و (ئەزموون)، بگرە دەرکەوتە و شتەکانی تێکەڵ بە لاوانەوە و هەستێکی ڕۆمانسییانەی نیمچە یاخی کردووە و دووبارەی کردوونەتەوە، لە دووبارەبوونەوەکەیدا ئامادەیان دەکات بۆ هێزی ئاخاوتن و پێشاندان.

کرانەوە و بەگەڕخستنی چەمکی پرسیار، سۆراغکردن و بەڕێکەوتنە بەدوای نادیاردا، فەزایەك دەڕەخسێنێت و دەبێتە مایەی بەرهەمهێنانی

کولتوورێکی بەهێز بۆ وریاکردنەوەی کۆمەڵگە و توانایی پەیداکردن بۆ خوێندنەوەی خود، کە خود سەرچاوەی دامەزراندنی پێوەندییە لەنێوان (وشە) و (شتەکان)دا وشە دەتوانێت ژیان لەناو شتەکاندا بە شێوازێکی نەرمونیان بنیاد بنێت و بەڕێوەی ببات.

پرسیار لە درێژبوونەوەی ڕستەکانیدا هێز و بەردەوامی نامێنێتەوە، ڕستەی دواتر ڕاستەوخۆ وەڵامی ڕازیکەری پێیە، ئەم شێوازەش مایەی سەرسامی و بیر پێکردنەوە نابێت و پرسیار دوادەخات، پرسیاریش دوابخرێت دەقی سست و وەستاو بەرهەم دێت و ڕۆڵی دراما بەرەو لەناوبردن دەبردرێت.

لە دەقی جووڵاو و چالاکدا پرسیاری دیاریکراو هەیە، بەڵام وەڵام و ئامانجی دیاریکراو نییە، ڕەنگە هەندێك پرسیار لە نادیارییەکی ڕەهاشەوە بکرێت، بەڵام زۆرینەی پرسیار و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو شتانەیە، کە لەنێوان لەدایکبوون و مەرگی مرۆڤ پەیدا دەبن و لە دەوری (توانا) و (هێز)ی بوون دەسووڕێنەوە، هەم ئەم ناوەندەش دەکەن بە چەقی گرینگی پێدان بۆ پەیدابوونی (هێزی ئاخاوتن). هەموو ئەو شتانەی کاریگەرییان لەسەر توانا و هێزی بوونەوە هەیە، پێویستە لە ڕازی داهێناندا کاریان پێ بکرێت و ناخ و کرۆکیان بەرجەستە بکرێت و بکرێن بە تاقیکردنەوەی دەق و ژیان.

دەقی ئەدەبی تەواو لە خەیاڵدا نارسکێت، بەشی زۆری لەناو ژیاندا دەرسکێت. ژیانیش هەقیقەتە. خەیاڵ کێڵگەی دێرەکانی ئاوڕشێن دەکات بۆ بۆنخۆشبوون و سەرنجڕاکێشان.



هێزی ئاخاوتنی شیعرەکان زیاتر لە سروشت و هەستی یاخیبوونەوە نزیکن، یان فڕێدانی هەڵچوون و شڵەژانی بەردەوام بەشێوەیەکی تەواو تێیاندا بەرجەستە کراون. ناوە ناوەش شێوازی بیرکردنەوەی ڕێباز و تەوژمی جیا جیا لەگەڵ ئەم بارەی یاخیبوون و هەڵچوونەی ڕووبەڕوو دەبنەوە و ناکۆك دەبن، یان هاوتای باری یاخیبوون و هەڵچوونەکەی نین. لە ڕووبەری بیندراوی شیعرەکانیدا هەست بە شاکەسێکی ونبوو دەکەین لەناو ژیان و نیگەرانییەکاندا مشتومڕ، یان پرسیار و وەڵام لەنێوان (خەیاڵ) و (هەقیقەت)دا، یان لەنێوان خۆی و خودی خۆیدا هەمیشە لە بگرە و بەردە و بارێکی ناسەقامگیردایە، بەڵام لە ئەزموونێکی هێما ئامێزی بێ وێنەدا ئەم مشتومڕ و پرسیار و وەڵامانە قووڵاییان ئاشکرا دەبێت. هارمۆنییەتێکی گونجاو بۆ چرکە هاندەرەکانی نووسین و ساتە پڕ هەستەکان و چێژی خوێنەر دەدۆزێتەوە و دۆخێك دەگۆڕێت و هێزی ئاخاوتن پەیدا دەبێت.

هەندێك تێلنیشانی ڕوخساری نهێنی دەدات، کە چیتر ئەو ڕوخسارانە لە پانتاییەکی سەقامگیر و مەییودا نامێننەوەو لە فەزایەك، کە توانای وەرگرتنی بوونی هەیە، دەبن بە هێزێك بۆ ئازادکردنی (بینین) و پەیداکردنی (هێزی ئاخاوتن). دوای هەندێك ڕووداوی کاریگەر و بە زەبر، یان لەگەڵیدا نموونە: وەك لە شیعری (بتانەوێ و نەتانەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان نالی هەر بۆ شارەزوو دەگەڕێتەوە)، یان لە شیعری (گەردەلوولی سپی)، یان لە شیعری (نەخشەی دڵ)دا دەردەکەوێت. یاخیبوون، یان ئامادەبوون بۆ یاخیبوون، دەبنە ناوەند و جێگرەوەی بیرکردنەوەی. خاڵی بینینی دەکاتە هێڵی وەهمکردن و چرکەساتی سۆزدارییەکی سفتوسۆڵ.

ترس لە دەستەوەستان، یان هەڵزەقینەوە وەرگرتن بەرانبەر دەستەوەستان، گیان و دیدگای شاعیریان پڕ وزەی یاخیبوون کردووەتەوە، نەك زاڵبوون بەسەر هۆکارە جیاجیاکانی دەستەوەستان بوون. لەم یاخیبوونەیدا ئاسوودەیی دەروونی لە کەسایەتی پەیدا دەبێت، کە هۆ و پێویستییەکی یاخیبوونەکەی بووە. بە هۆشیارییەوە دەزانێت خەیاڵ لە کوێ و هەقیقەت لەکوێ بەکاربهێنێت . لەناو شتە شاراوە و دەرکەوتە نوێیەکان دەردێت و شتە شاراوەو دەرکەوتە نوێیەکان بە روونی دەکاتە (پێکهاتە) و (ئەزموون). پاش کارلێککردن و خەملێن تێکەڵ بە خەونی کۆمەڵگەیان دەکات، یان لە ڕێگای خەونی خۆیەوە دەیانکات بە خەونی گشتی.

شاعیر، کە خەریکی خەونی گشتی بوو، چاوەڕوانی ئەوەیە چی لە واقیعی ژیانی کۆمەڵگەوە ڕوودەدات تا سروشتەکەی وەربگرێ و ئیشی بەرهەمهێنانەوەی لەبارەوە بکات. بەشێوەیەکی ڕووبەڕوو واقیع دەناسێت و گفتوگۆی وەك چالاکییەکی هزری لەگەڵدا دەکات، دوای وردبوونەوە لە ڕواڵەتی شتەکان تێبینییەکانی دەنووسێتەوە. بەبێ هیچ گومان خستنەوەیەك نووسینەوەی تێبینییەکانی واقیع کەم بایەخ و بێ بەها نییە، بگرە دۆخگۆڕیی دەوێت بەرزی بکاتەوە بۆ ئاستی داهێنان و دۆخگۆڕین و هۆکارە جیاجیاکانی لەبەرچاو بگرێت.

لەم بارەدا واقیع لەناو دەقدا بە بچووکی نامێنێتەوەو دەبێتە واقیعێك، کە خۆی بۆ داهێنان کردووەتەوە. لەم کەش و هەوایەدا واقیع دیدێکی تازە بۆ داهێنان دادەهێنێت و پێشنیازی دەکات بۆ کار لەبارەوە کردن و بە



هونەرکردنی. لەگەڵ ئەمەشدا واقیع هەقیقەتی تەواوی لا نییە. شیعر لەناو بەها و بیروبڕوا هاوبەشەکانی کۆمەڵگەوە سروشتی ناکەوێتەوە. ئەو دەسەڵاتەی واقیع بەڕێوە دەبات کار بۆ ئەوە دەکات خەڵك بەو ڕێگایەدا بڕۆن، کە خۆی بۆی دەستنیشان کردوون. ئەم ئاراستەکردنە و هەموو ئاراستەکردنێکی دەسەڵات بەشێك لە بەختەوەری مرۆڤ دەشارێتەوەو زەوتی دەکات.

کاتێك دەسەڵاتی داپڵۆسێنەر، تەنگی بە واقیعی سیاسی و ژیانی کۆمەڵگەی کوردی هەڵچنیبوو، شاعیر چووەتە ناو بازنە ترسناکەکان و دەستکاری ئەو خاڵانەی کردووە، کە دەسەڵات لەسەر پێتەکانی دانابوو. ئەو دەستکاریکردنەی کردووە بە هێزی ئاخاوتن و وریاکردنەوەی کۆمەڵگە.

(گەردەلوولی سپی)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (لەتیف هەڵمەت)ە، ساڵی (١٩٧٨) لە دووتوێی (١٠٢) لاپەڕەدا لە چاپخانەی (کۆڕی زانیاری کورد) لە بەغدا چاپ کراوە، ئەم شیعرانەی تێدایە: (دوو سەرەتا، شینایی ئاسمان، چەند نهێنییەك، کانی، دوو پرسیار، تۆ بوویتەتە خۆر، دەرمانی پێکەنین، من کچێکم خۆش دەوێ، تیر، لاوانەوەی یەکەم خۆر، ڕۆژنامە، تانجەڕۆ ماچی پەمەیی لە دەمدایە، شاعیر، ڕووبار، منداڵ، دەفتەر، هەور دەبێتە چی، ئەستێرە، لاوانەوەی نیرۆدا، ئاوی کوێستان، بۆ گیڤارا، گیان، ئەگەر، هاوارم کرد، جوانترین خۆر، کچێك، بتانەوێ و نەتانەوێ ڕۆژێ لە ڕۆژان نالی هەر بۆ شارەزوور دەگەڕێتەوە، نەخشەی دڵ، دەستی شاعیر، ناونیشانی شانۆیەکی کۆن، گۆرانی ڕۆژ، گەردەلوولی سپی، گەڕانەوە، شاری گوڵ، شاعیرێك بوو، سۆراخ، دەشێ و ناشێ، بۆ مرۆڤێك

ناوی لەتیف حامید بوو، نە دایکم نازانێ، گوڵی شاعیر، بڵێ بووە بە ڕووبارێ، پێتان دەکرێ، دەریا، بەهاری مەزن، پاشەڕۆژ، یەکەم خۆشەویستی، نیشتیمان دەزگیران نییە، وەرزی ماچ، دەزانی چۆن کەوڵەکەمیان کردە بەرماڵ، نازم حیکمەت بۆ مرۆڤایەتی دەدوێ، تۆوی گۆرانی کێویلە، خۆر، گیانە بۆچی، پایتەخت، ونبوونێکی تر لە ژمارەیەکی ونبوودا، ئەو شیعرەی دەیکوژن و نایکوژن).

پایتەخت
بەفرە چڕەکان
لەسەر لووتکەیەکدا کۆبوونەوە
بوون بە چەند ڕووبارێکی زیوینی بەڕەڵا
وەکو کۆمەڵێ منداڵی چەمووش
بێستان و ڕەزەکانیان
پڕ لە گۆرانی و فیکە فیك کرد

وشە نامۆکان
لەسەر پەڕەیەکی سپیدا
یەکیان گرت
بوون بە هەندێ هۆنراوەی
لە ڕێزمانی زمانی ڕۆژانە یاخی و
نیگاری شارێکی سووتاو



چەند ئەستێرەیەکی ئاوارە
لە چاوی کچێکی شەرمندا
رووت بوونەوە
دڵی تاریکی شاعیرێکی تەنیایان
روون کردەوە

چەند دار بەڕوویەکی دڵدار
لە دۆڵێکدا
دەسلەملانی یەکتر بوون
پرچی سەوزی خۆیان
دایە بەربارانی ماچی فێنکی هەتاو
دۆڵەکە بوو بە دارستان

کابرایەك
بەدلەیەکی خاکی لەبەر کرد
سەری خۆی لەژێر سیدارەیەکدا
شاردەوە
جووتێ پۆستاڵی کردە پێی
سونگییەکی لە کەمەری خۆی دا
کابراکە بوو بە پۆلیس

**که خەونە سوورە نهێنییەکانیش**
**لە هەر دڵێکی بزێودا**
**تنۆك تنۆك کۆدەبنەوە**
**ئیتر ئەو دڵە**
**دەبێتە پایتەختێکی قەدەغە**

ڕاهێنەری ئاژەڵەکێوی چەند وریایی پێویستە بۆ ماڵیکردن و ڕاهێنانیان تا بیانهێنێتە ناو جەماوەر و باخچە تایبەتییەکان، شاعیری داهێنەر، ئەو شاعیرەی دەزانێت شیعر بریتی نییە لەو هێڵە سپی و ڕەشانەی ڕوخساری بێگەردی کاغەز دادەپۆشن، بگرە بنەما و دەرکەوتەی (ناوەندێکی ئەفسوونی)یە. ڕاهێنان و وریایی زیاتری پێویستە لە ماڵیکردنی ئاژەڵە کێوی، کە کار لە کولتووریش دەکات یاد و ژیانی ڕابردووی کۆمەڵگە بەخێرایی ڕووناك دەکاتەوە و گەشەی پێدەدات و ناونیشانێك پێشنیاز و پێشکێش دەکاتەوە. ڕابردوو بە بیر دەهێندرێتەوە، بەڵام تازە ناکرێتەوە.

دوای دروستبوونی سروشت و گەردوون و پەیدابوونی ژیان، ناولێنان ئەم نهێنی و ئەفسوونەیە هەتا ئێستا نە کتێبە ئاسمانی و نە فەلسەفە جیاجیاکان نهێنی ئەم هونەرەیان پێ نەدرکێندراوە.

ناونیشان لە ئەدەبدا ڕەونەقدان و هاندان و چێژدان نییە بە ناوەرۆك، بگرە هونەرێکی سەربەخۆ و زۆر تایبەتە. بەشێك لە شاعیران بابەت و بیری شیعر بە (ڕامانی سەرەکی) دادەنێن و ناونیشان و فەزای ناونیشان دەخەنە خزمەتی بابەت و بیر. ناونیشانیش وەك بابەت و بیر و



ئێستێتیکا دەربڕینێکی شیعرییە و خەسڵەتدارە بە خورپە خستنەوە و سروش و خەیاڵ کۆکردنەوە. لە ڕووی زمانیشەوە خۆی لە بەکارهێنانی وشەی هاوشێوە و یەك مانایی دەپارێزێت، تیشکەکانی ئێستێتیکا لە کرۆکی خۆی بەهێز دەکات و خوێنەر دەڕسکێنێ و ڕای دەهێنێت بۆ شۆڕبوونەوە بۆ ناو پانتایی (وشە) و (شتەکان)، یان بەخشینی خەیاڵێك بۆ بەدواداچوون و نهێنی هەڵێنان لە چییەتی دەقدا.

هەندێك شیعر ناوەرۆکێکی زۆر قووڵ و شێواز و داڕشتنێکی نوێبەخشی هەیە، نوێبەخشییەکەی لە شێواز و داڕشتنەکەیدا خۆی ئاشکرا دەکات، کەچی ناونیشانێکی سادە و تاڕادەیەك باوی بۆ هەڵبژێردراوە. ئەم هەڵبژاردنە هەستێکی سارد لە هەناوی خوێنەر پەیدا دەکات، مەگەر هێزی زمان و خەسڵەتی هونەرەکانی دیکە ئەم هەستە ساردە بە بارێکی تردا بگۆڕێت و قەرەبووی بکاتەوە.

ناونیشانی ئەم کۆ شیعرە پێوەندییەکی بەهێزی بە کۆی بابەت و بیری شیعرەکانەوە هەیە. وەك ڕامانێکی سەرەکی بە تەواوی جەستەی شیعرەکاندا چووەتە خوارێ و لە لێکدانەوەماندا ڕاماندەگرێت، پاشان بەرەو هێڵی بێ کۆتایی ئازار و بەختەوەریمان دەبات.

ئەم شاعیرە نزیکەی سی کتێبی لە شیعردا نووسیوە، کە هەموویان وەك شیعری داهێندراو و نوێبەخش دەتواندرێت لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی پشتی پێ ببەستێت و لە شێوە و ئاستی نموونەی هەمەجۆر و باڵادا وەری بگرێ و بەکاری بهێنێت.

حوزەیرانی ٢٠٠٨ هەولێر

## زایەڵە

شیعر خەیاڵێکی داماڵدراو نییە لە ژیان، هیچ خەیاڵێکیش بوونی ڕەهای نییە، بگرە هەمووی لێکدانەوەی جۆراوجۆرن بۆ واقیع. لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا شیعر بووەتە ڕوویەکی کولتووری، هەوڵیشی داوە لەم ڕووەوە نوێبەخش بێت، نوێبەخشیش پرۆژەیەکی بەجێنەگەیاندراوە. هەر شتێك بواری هەست پێکردن و پاشان توانای درکاندنی هەبێت لەبارە ببێتە بابەتی شیعر و داهێنانی تێدا بکرێت.

ئەنوەر قادر محەمەد لەم کۆشیعرەیدا تێڕوانینی خۆی لە ئاستی شێواز و شێوەو ڕوون دەربڕیندا بە هۆشمەندیی جیاکار و دیدگای دەگمەنەوە بنیادناوە. لە ئاستی گەڕان بەدوای شتە فەرامۆشکراو و پەراوێزخراوەکانی ناو کۆمەڵگە و واقیع، هەم نزیکبوونەوە لە کەرەستەکانی سروشت و پرسیارە بوونییەکانی کەسایەتی خۆی، لە دواتردا گەڕانەوە بۆ ناو بنەماڵە و خێزان و دەوروبەر و کۆپێکهاتە.

ئەم ئەزموونە هەوڵیداوە واقیع لەناو خۆیدا ڕێك بخاتەوەو بە هۆشیارییەوە نەیهێشتووە لەناو دەست و پێی هونەر و بیری ڕۆژئاواییدا سەرگەردان بێت و ببێتە پاشکۆیەکی بێ هێز و تین و دەمارخاو. هونەر و بیر و ئێستێتیکایەکە شارەزایەکی ماڵی خۆمان و پێوەندیدار و لکاو بە



نەتەوەو دابەوە بەرهەمی هێناوە و کەسایەتیی خۆی دەنوێنێ و مۆرکی گیان و گەوهەری هەستییەتی. واتە خەیاڵی کوردیی گەیاندووەتە ئاستی شیعرییەت و پەیبردن بە قووڵایی زاندراودا.

لەم ڕووەوە لە شیعری نوێی کوردیدا (سەرپەڕ)ی پێ دەبڕێت و هەستی خۆی بە تەواوی گەیاندووە، هەرچی بەبیریدا هاتووە و بیری لێ کردووەتەوە کردوویە بە زانین و لە بەکارهێنانی شیعردا وەك زانینێك بەکاری هێناوە. بەبێ ئاڵۆزیی زمان هەموو توانایەکی زمانەوانی و بنیادی ئێستێتیکی زمانی تێدا دەرخستووە.

دڵەڕاوکێی خۆی بەرانبەر بە تاراوگە دەردەبڕێ، تاراوگەش بەردەوام مانا بەرهەم دەهێنێتەوە، خاڵێکی بۆ دادەنێت، ئەمیش گومان دەکات ئەم خاڵە بکات بە هێڵێك و ئاراستەیەك وەربگرێت و بەدوایدا بچێت.

لە ئاست مامەڵەکردن لەگەڵ مانادا بە ئاگایی قەڵەم هەڵدەگرێت و دادەنێت. وشەیەکی نەنووسیوە ئەگەر هەستی نەکردبێت ئەو وشەیە پێویستییەکی بەهێزی بۆ نووسین نییە، وشەی پابەند نەکردووە بە ویستی خەڵکەوە، پابەندی کردووە بە ویستی شیعرییەوە، ئەو پێویستییەشی گەڕاندووەتەوە بۆ ڕێزگرتن لە وشە و بەهای شیعر. (ڕێزگرتن لە شیعری بێگەرد لە پلەی ڕێزگرتن لە شکۆی شەهیددایە). (شیعرێك لە پێناو بێگەردیی شیعردا نەنووسرێت، سەلکەپیازێك ناهێنێت). خودی خۆی وەك تاك تەواو بە ڕوونی دیاردەخات و بەرزی دەکاتەوە، هیچ خودێکی دەوروبەریش جێگرەوەی نین.

ئەم شێوازی ئێستێتیکایە پێوەندیدارە بە هێز و تێڕامانەوە، کە شێوازی (سانایی خۆ بەدەستەوە نەداو)ە. دواتر لە زماندا بەرجەستە دەبێت و وێنەیەکی تایبەت دەکێشێ. وریایە لە بەکارهێنانی زمان و هەڵبژاردنی بیرۆکە، دەقێك لە زمان و بیر و فۆرمدا پێکدەهێنێت پێی دەگوترێت شیعری بێگەرد. لە وێنەیەکەوە نامانباتە ناو وێنەیەکی دیکەی شیعرییەوە، بگرە لە پێشاندانی ئاستێکی تەکنیکی شیعرییەوە دەمانباتە ناو ئاستێکی دیکەی تەکینکی شیعرییەوە.

شاعیر خوێنەر لەو ئاست نیشاندانانە ئاگاداری هەموو پێکهاتەکانی شیعری دەکاتەوە، واتە شاعیر خوێنەری ئاگاداری هەستی خۆی و بەشداری لە جۆری بیرکردنەوە و هەستەکانییەوە پێدەکات. لە ناواخندا ئەم ئاگادارکردنەوەی خوێنەر، پرسیارە (بوون، بوونی شیعر) لە شاعیر، یان لە هۆشمەندێکی جیاکار و دیدگای دەگمەنی کردووە. شیعر بووەتە دەماری ژیان و ناوەند بۆ ئەم نیشاندانانە. لە ڕێگای پرسیار و ڕووبەڕووکردنەوەی خۆیدا ئەوی دیکە دەناسێت. لە ناسینی ئەوی دیکەدا پرسیارە بوونییەکان زیاتر دەتورووژێنن و ناچاری کردنت دەکەن. سەدایەك لەناو زمانی سادەییدایە، کە بەسەر ئاڵۆزیدا دەکرێتەوە و سەدا تێکەڵاوەکان لەناو دەبات.

لەم سادەییەدا مەبەستی یەکەمی نوێبوونەوە نییە، بە قەد ئەوەی خواستی تایبەتکارییە، نوێبوونەوەو تایبەتکاری لەمنی شیعردا بەدەست هێناوە.



نوێبەخشی وەك هێزی دەربڕین و بنیادێکی ئێستێتیکی ئاڵۆز نییە، شاعیر ئەم سادەییەی لەسەر بنەمایەکی زۆر قووڵدا دۆزیوەتەوەو بنیادی ناوە، شیعرەکان دوور نین لە هەستی کات و شوێن و پێوەندیی دەق بەکات و شوێنەوە، وا بە وردەکارییەوە تانوپۆی کات و وێنە ونبووەکانی ناو دەقی چنیوە. خوێنەر وا لێ دەکات پەیوەستێکی قووڵ و گەشەکردنی کات و شوێن لەناو دەقدا بدۆزێتەوە. نموونە: وەك لە شیعری (ئەو شەوانەی)، یان لە شیعری (سلێمانی)، یان لە شیعری (زەنگڵەی یاد)، یان لە شیعری (کۆتەڵ) دەردەکەوێت. زۆر بایەخی بە نیشتیمان وەك (شوێن) و ئەو ژیانەی، کە گوزەراندویەتی وەك (کات) داوە، مرۆڤیش لەنێوان کات و شوێندا سروشتێکی دیاریکراوی پڕ هەڵچوون و داچوونە و هاوسەنگیی بوون ڕادەگرێت، یان هەڵچوون و داچوونەکە لە خاڵی کات و شوێندا کەرەستە گیانییەکەیەتی.

دوورکەوتنەوە لە نیشتمان و دەوروبەری کاریگەرییەکی بە زەبری تێدا دەبیندرێت و بارودۆخی دوور لە نیشتمان و دەوروبەر لە باسکردن لە مەرگی جەرگبڕی ئازیزێکی نزیکی خۆیەوە بەرجەستە دەکات.

سروشتی شیعری خودی ئەوەیە لەناو سروشت و بووندا شاعیر بەدوای نەمریی خودی خۆیدا وێڵە و (پێوەندییەکی ئەفسوونی بەدنیاوە هەیە، نەك پێوەندییەکی ئەقڵی دامەزراو)، بەپێچەوانەی ئەم دەستنیشانکردنە، ئەم شاعیرە خودی خۆی لەناو ژیاندا دۆزیوەتەوە و بابەتی زەینی لێ بەرهەم دەهێنێت.

زەین وەك مرۆڤێكی چالاك تێیدا دامەزراوەو لە خودی ئەوی دیكەدا نزیك دەبێتەوە و خۆی دەچێنێت. لە هەندێك باری شیعردا هەست و سۆز لە ئەقڵ و واقیع گرینگترن، چونكە هەست و سۆز زەمینە بۆ جموجوڵی گیان دەخولقێنێت و جۆشی هەستپێكردنی خۆڕسكانەی خۆی دەدات. مرۆڤ لەسەر زەمینی واقیعدا بوونەوەرێكی بزرە، تەنیا لە ڕێگای زمانەوە خۆی دۆزیوەتەوە، زمانیش لەسەر ئاستی بەشداریكردن لە كۆزانیاری و بنیادنانی ژیان پەرە دەستێنێ و دەتوانێ بوونی مرۆڤ بدۆزێتەوە، كە واقیع گۆڕانی بەسەرداهات، بۆ ئەزموونی نوێش دەشێت و كەشی لەبار دەهێنێتەوە پێشەوە، چونكە هێز و تاو و تینێكی بەردەوام زیندوو لە هەناویدا بەرز دەبێتەوە و دادەكەوێت. ئەو زانینە نوێیەی لەگەڵ گۆڕانەكەدا دێتە بوون و دەبێتە سروشتی واقیع و خەسڵەتی روون بە سەركێشییەكانی گیان دەدات. سەركێشییەكانی گیانیش هەمیشە پرسیاری بەدوادا دێت. ئەم واقیعە لەبەر چی گۆڕا، بۆ كوێ گۆڕا، كێ گۆڕی، ئەمجۆرە پرسیار و بیركردنەوانەش چاو لە ئاستی دیاردەكان داناخات و هەندێكیشیان پەسند دەكات، كە هاوسەنگییەك لەگەڵ خەیاڵ پێكدەهێنن.

شیعر چەند مەودایەك دەكات بە سروشتی خۆی. وەك مەودای بینین، مەودای بیستن، مەودای مانا وەرگرتن و فرە پێوەندی و فرەمانایی،... تاد. كاتێك شیعر وەك پارچەیەكی نووسراو وەربگرین، لەكاتی جۆشی خوێندنەوەیدا تەنیا ئەو ڕووبەرەی خوێندنەوە نابینین. ترپە و ئاواز و مۆسیقا و وێنە هەریەك وەك مەودایەكی سەربەخۆ و تایبەت خۆی



پێشكێش دەكات و لە پارچە نووسراوەكەی، كە دەیخوێنێتەوە جیادەبێتەوەو پێشبڕكێش لەگەڵ ڕەگەزەكانی دیكەدا دەكات.

لە كۆی ئەم ئەزموونەدا هەست دەكەیت، كە شاعیر بیری ڕوون و دیاری لەبارەی ئەوەی دەینووسێت هەیە، یان (ڕەگەزی كتوپڕی) لە وێنەیەكەوە بۆ وێنەیەكی دی ناتگوازێتەوە و خەیاڵ بۆ وێنەیەكی ناجۆر ناتبات، بگرە خەیاڵ بۆ دێری دواتر و تەواوكەر دەتبات و بەردەوامیت بۆ درێژ دەكاتەوە، یان دێڕی یەكەم لە ترپە و ئاواز و مۆسیقادا خۆی پێشكێش ناكات، كە (ڕەگەزی كتوپڕی) ئاكامی پەرەسەندنی وێنە و دێڕەكان بن. هەست دەكەیت ئەو بیرە ڕوون و دیارەی شاعیر لەبارەی نووسینەوە هەیەتی دەستی بەسەر تەواوی كردە و پێكهاتە بیرییەكەیدا گرتووە، كەمتر ئەزموونێكی زمانییە، وێنەكان لە بابەتدا درێژ بوونەتەوە و ئاست و كەشی داستانی بە بنیادی ئەزموونەكەی داوە. لەم ئەزموونەدا یەكبوونی ناوەوە لە پێكهاتەی مانادا هەندێك هونەری (زەینی) و (هەستی) لە ناخی بەرانبەردا دەخولقێنێت و دەیكات بە لێكدانەوە، لێكدانەوەی زمان و بوون لەناو ژیاندا، لەكار بەیەكەوە كردنی هەردووكیان لەگەڵ یەكتردا دەق دەسازێت و ئێستێتیكای خۆی لە ئەزموونندا دەكاتەوە.

(زایەڵە)، ناونیشانی كتێبێكی شیعریی (ئەنوەر قادر محەمەد)ە. ساڵی (١٩٨٨) لە دووتوێی (١٢١) لاپەڕەدا لە چاپخانەی (نووسینگەی تارا) لە سوێد چاپ كراوە، (لە بڵاوكراوەكانی كۆمەڵەی فەرهەنگی سوێد-كوردستان)ە. ئەم شیعرانەی تێدایە: (تۆ كۆچ ناكەی، شەوانی باران، خەنجەر و خۆشەویستی، بانگ، پرس، كاكە، چەند هۆنراوەیەك بۆ دایكم، بەیادی

فەرهاد، ئەو شەوانەی، سلێمانی، ئەگەر، ئەوین، چراوگ، شەستە، غەریبی، بۆ باوە مەولەوی، ئەو کەژانە، بێچووە هەڵۆ، پایز و ئەڤین، زەنگڵەی یاد، چراو مەشقەڵان، پاکانە، سیما و ئاڵا، هۆ غەریب، چراوگ، لە کەناردا، خاچ، نوێژێکی نوێ، سووتان، تارا، تەلیسم، گوڵ سێوێ، ئاهەنگی دەنگ و ڕەنگ، شیعرەکانم، ئەوین، نائومێدی، کۆتەڵ، یاد، لە شەمەندەفەردا، جارجار، داستانی ئەڤینی سێوەخان).

**غەریبی**
**مەولانا بەو گەورەییە،**
**رۆژێ دوو دوو،**
**تەنەکە ئاوی بەسەر شان،**
**بۆ تەکیەکەی شێخی (دەهلەوی) دەهێنا،**
**لە ڕێ لایدا، تۆزێ دانیشت،**
**نەختێ ڕاما،**
**هۆن.. هۆن فرمێسك بەسەر**
**روویدا قەتارەی بەست،**
**لە پەنجەرەی تەکیەوە (شێخ) چاوی لێ بوو،**
**شێخ بانگی کرد وتی خالید!**
**لە لێزمەی فرمێسکی ئەمڕۆت نەگەیشتم!**
**وتی: قوربان! ئەو ئافرەتەی،**
**کە بە تەنیشتما تێپەڕ بوو..**
**روخساری هەر لە ڕوخساری دایکم دەچوو،**



**هەر کە بینیم، سلێمانیم کووچە کووچە هاتە پێش چاو،**
**یەکسەر ئاگرم تێ بەربوو، دڵم پڕ بوو،**
**ببوورە لێم! خۆت دەزانی قوربان سۆزو**
**قوربان! کەڵکەڵەی نیشتیمان..**

زەینی پڕە لە کولتوور و ئەفسانەی خۆماڵی، ئەفسانەی هەر نەتەوەیەك مێژووی دوور و درێژی نەتەوەکەیە، زانیاری تەواو لەبارەی ڕێوڕەسمەکانەوە لە لا پاراستراوە و وەك بنیادێکی کاریگەر لێی دەڕوانێ و کاری لەناودا دەکات و پیشانی دەدات، ڕێوڕەسمی کۆمەڵایەتیش پێوەندییەکی دوور و درێژ و قووڵی لەگەڵ ئازار و ئومێدی کۆمەڵگەوە هەیە. ئازار و ئومێدی کۆمەڵگەش گیانی بنچینەیی واقیعن. گیانی بنچینەیی واقیعیش لەوەدایە چۆن لە شیعردا پێکی دەهێنی و پیشانی دەدەیت و واقیعی لەناو ڕێکدەخەیتەوە. نالەبارترین کات بۆ شاعیر ئەو کاتەیە، کە هەست بکات لە بواری نووسیندا شتێکی نوێ و سەرنجڕاکێش لەبەر دیدە و خەیاڵی نییە بۆ دۆزینەوە. هەموو شیعرێکی داهێندراو پێویستە هەقیقەتێك بدۆزێتەوەو ژیانی لەناو ڕێکبخاتەوە و بەنرخی بکات.

ئەو ئەزموونانەی، کە واقیع دەیانخاتە ڕوو، هەموو ئەزموونە فەنتازی و ئاخاوتنە خەیاڵییەکان دەخاتە ژێر کاریگەریی خۆی، بەڵام سیمای دیاریکراوی واقیع ڕاستەوخۆ لەخۆ ناگرێت. ڕووبەڕووی ئەو دڵەڕاوکێیانە بووەتەوە، کە جوانییەکان دەشێوێنن، لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەیدا ژیان و وزەکانی ژیانی لە شیعردا نوێ کردووەتەوە.

شاعیر بۆ ئەوەی وزەکانی ژیان باش بەکاربهێنێت، پێویستە لەگەڵ واقیع شەڕی بێ ئامان بەرپا بکات و چرپە و شتە وردەکان بۆ ناو هێمنی زمان بگوازێتەوە، ئەم شەڕە لە دەروون و هەستدا دەیحەسێنێتەوە و هەقیقەتێك بۆ ژیان دەدۆزێتەوە، یان هەقیقەتێکی پێشان دەدات. ئەزموون و شارەزایی تەواوی لەم شێوازە نووسینەدا هەیە. بە شێوەیەك هۆگرت دەکات و ڕاتدەکێشێتە ناو چێژ و جوانیی سادەیی، خاڵێك وەك پرسگە ڕاتدەگرێت، ئەم خاڵە ئەزموون و شارەزایی سەرچاوەکەیەتی، لەم سادەییەشدا لایەنی هێما و نیشانەی ئەفسوونی زمان دەبینێت و بەهاکانی دیاری دەکات. وەك لەم ڕستەیەدا دەردەکەوێت (قوربان سۆز و قوربان کەڵکەڵەی نیشتمان) دووبارە کردنەوەی وشەی (قوربان) لە یەك ڕستە و وێنەدا نیشاندانی هێز و ئەفسوونی زمانە. هێز و ئەفسوونی زمانیش توانا بە شیعر دەدات و لێکدانەوە بۆ ژیان دەهێنێتە بەر بینین و خەیاڵ ڕادەوەشێنێت. زمانیش توانای مانا لە دەقی ئەدەبیدا زیاد دەکات.

تەمموزی ٢٠٠٨ هەولێر



## دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە

ئایا لە کۆمەڵگەی ئێمەدا مرۆڤ پێویستی بە شیعر هەیە، یان بەهای شیعر لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا بە چ ئاست و ئاراستەیەك وەردەگیرێت. ئایە شاعیر یەکێتییەکی لەنێوان (پێویستی) و (بەها)دا پێك هێناوە، یان لە تیشکدانەوەی ڕەسەنایەتی و بە قووڵبوونەوەی ئەم ناوەندەدا چاوی بە جیهاندا خشاندووەتەوە و پێوەندیی خۆی بە جیهانەوە دەستنیشان کردووە. پێوەندی بە جیهانەوە بڕوا و بڕواپێبوونە بە بەرهەمهێنانی جوانی بەهۆی پێویستی و بەهای ژیان و پێناسەکردنەوەیەکی دیکەی شتەکان.

شمشاڵ دێرین و هاوچەرخە، بە جارێك بیستنی شمشاڵی (قالە مەڕە) هەستی بیستن تەواو ناکرێتەوە و ئامادە و پاراو نابێت. ئەگەر شیعریش لە گیانێکی دامەزراو و گەرمدا ئەفسوونی بوونی خۆی پێك هێنابێت و گیانێکی گەرمیش بە وەرگر بدات، خۆی دەسەپێنێت و دەبێتە پرۆژەی خوێندنەوەی تەمەن، لەمجۆرە خوێندنەوەیەشدا سەرچاوەکانی (چێژ) و (هەست) و (سۆز) بەیەك دەگەنەوە. هەریەکەشیان دووبارە دەبنەوە هێزێکی سەربەخۆ و کاریگەر بۆ تەکان و جووڵانی ئارەزوو.

هەموو شتەکان لە یەك شت کۆناکاتەوە. چێژ و هەست لە (سۆز)دا کۆناکاتەوە، یان هەست و سۆز لە (چێژ)دا بەرانبەر و هاوسەنگ ناکات، یان چێژ و سۆز لە (هەست)دا ڕووبەڕوو ناکاتەوە. هەریەکەیان وەك بوون و توخم و ڕەگەزی سەربەخۆ دەجوولێنێت و لە شێوەی یەکەیەکی کاریگەر شوێنیان لە جەستەی شیعردا دەداتێ، بەڵام هەر سێ توخمەکە بەیەکەوە دەخاتە نێوان دوو کەوانەوە، ڕەهەند و پانتاییەك لەنێوانی خودی هۆشیاری و توخمەکان دەهێڵێتەوە. بە بایەخترین شتێك، کە بە ویستەوە کاری لەسەر کردووە هێشتنەوەی ئەو ڕەهەند و پانتاییەیە، واتە ئەو ڕەهەند و پانتاییە بنەمای جووڵان و ناوەند و سەرچاوەی ڕاستەقینەیەتی. نموونە: وەك لە شیعری (بارانی ڕەنگاوڕەنگ)، یان لە شیعری (تێنوێتی و زستانی جوان)، یان لە شیعری (شاری نهێنی)، یان (هەنگوینی تاڵ) دەردەکەوێت.

ڕەنگە من بۆ خۆم لە ماوەی جیا جیادا چەند جارێك گەڕابمەوە سەر ئەم کتێبە شیعرییە. ئەو بەردەوام خوێندنەوەیە بۆ کەڵك وەرگرتن نییە لە شێواز و زمان و مانای وشە و ڕستەکان، بگرە بۆ بەهێزکردن و پاراوبوونی گیانە. کاری شیعرییەت بە گشتکردنی بوونەکان و پاراوکردنی گیانە لە خلت و پیسییەکانی زەمین، نهێنی ئەوە چییە شیعر بەرەو ئەو کاریگەرییە چووە. لێیەوە بە دوای چێژەکانی ژیاندا بچین، چێژیش بە سەربەخۆیی خۆی بهێڵێتەوە، لەم سەربەخۆیی بوونەدا چێژ دەتوانێت و بۆی هەیە وەك جۆرێك لە دەق، شێوەی زەینی وەربگرێت.

ئەم شاعیرە لە ئاستێکدا کاری شیعری خۆی کردووە، کە نەوە یەك لە دوای یەکەکانی شیعری کوردی جۆرە گۆڕان و نوێبوونەوەیەك پەیدا دەکەن



و لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن و بە کۆ کار لە شێوە و زمانێك دەکەن. ئەمیش لەم ئاراستە لەسەرخۆیەدا هاتووە و لەگەڵ دەنگی کۆدا بەشداری لە گۆڕان و نوێبوونەوەدا کردووە. کەواتە (بەشدارە) لە گۆڕان و نوێبوونەوە، بەڵام (وەرچەرخێنەر) نییە. گۆڕان و نوێبوونەوەیەکی تاکەکەسی ئەنجام نەداوە بۆ ماوەیەکی نادیار کاریگەری جێ بهێڵێت، وەك دەرکەوتنێکی جیاکار و پڕ سروش بمێنێتەوە و قەوارەیەك بۆ خۆی وەربگرێت.

(دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (سەلام محەمەد)ە. ساڵی (١٩٨٨) لە دووتوێی (١٤٩) لاپەڕەدا لە چاپخانەی (حسام) لە بەغدا چاپ کراوە، ئەم شیعرانەی تێدایە: (لەدایك بوون، درۆی ئاوارە، بەیانی دێم ماچت دەکەم، دەمەو ئێواران ئەتبینم بە سوخمەیەکی زەردەوە، ئاسۆی خۆرنشین، توانەوە، شەوانی تەنیایی، بارانی ڕەنگاوڕەنگ، داری زەنگیانە، هاوین، تۆ کەناری یان ڕووباری، شیرین و یادگارەکانی ڕەحیماوە، تێنوێتی و زستانی جوان، سۆزانییەکی پیرۆز، گەشت و پێناسین، وەك هەزاران ڕێکەوتی‌تر، ماڵئاوایی، گیانە لەیلا، گوڵی نەورۆز، ساماڵی پاش بارانی نیوەشەو، سۆما، ئۆپەرێتی خۆشەویستی، ئاکسل و سارا، خۆڵەمێش، شاری نهێنی، تانیا، بارانی سووتاو، قەرسیل، بۆ کچی کوێستان، جنۆکەی ئەندێشەی شاعیر، هیچ و هەزار، وەرزی بەستەڵەك، پرشنگ، هەنگوینی تاڵ، تریفەی سوور، سێ ماچ.)

**تریفەی سوور**
**ساماڵە شەوی زستانە**

ئەستێرە بە ئاسمانەوە دەجریوێنێ
دەورووبەرم یەکپارچە وەك گۆمێکی مەنگ
کپ و بێدەنگ و خامۆشە
پێخەفی گەرم
بۆتە هێلانەی مەلۆتکەی
خۆزگە و جووتبوون و خەوبینین
شاری ماندوو
کراسێکی خۆڵەمێشی لەبەردایە
باڵندەی ئەندێشەی منیش
باوێشکەدا و خەوی نایە
بە گەردوونی بێ سەرەتا و کۆتاییدا
دەخولێتەوە
فڕی بەڵام چۆن فڕینێك
ئێجگار لە هالی خێراتر
بەسەر دەیان جیهانی نوێدا تێپەڕی
دەیان شاخی گەورە گەورەو
دوورگەی پڕ لە تەمومژ و
دەریا و ئۆقیانووسی بڕی
هەزاران ساڵی هەتاوی
لە تۆپە خڕەکەی زەوی دوورکەوتەوە
ڕۆیشت



ڕۆیشت
گەیشتە ئەستێرەیەکی تریفە سوور
ویستی بچێتە ژوورەوە
بە ماتە مات نزیك بووەوە
لە پڕێکدا
هێزێکی نادیار و ون
بە ئاستەم پاڵی پێوەنا
ملیۆنێ ساڵی هەتاوی
بۆ دواوە دوورخستەوە
کاتێ گەیشتەوە لای من
هەر ئەوەتا پەڕو باڵی پێوە مابوو
تك تك دڵۆپە ئارەقەی ئاگراوی
لە ناوچەوانی دەچۆڕێ
بەدەم گریانەوە دەیوت
من بە ئەوینی مەرگەوە هاتم بۆ لات
تۆش دەیان نهێنی ترت
خستە ناو گێژەڵووکەی بیر
جار بە جاریش
وەك دەروێشێکی گۆشەگیر
ناڵەیەکی دڵتەزێنی لێوە ئەهات
لای لایە
مرۆڤ لای لایە
ئەو مەحاڵەی

**لەم ژیانە و لەم تەمەنەدا نایگەیتێ**

**نووری خودایە**

ئەزموونی ئەم شاعیرە وەك ئەوەی لەم قۆناغەدا، کە تێیدا بەرهەمهێن بووە، ئەزموونێکی وریا و نیمچە کامڵ و خەمڵیوە، بەوەی بە وشەی زۆر و ناپێویست وێنەکانی نەشێواندووە و باری هەیکەلی گشتی دەقەکانی گران نەکردووە. بە وریاییبیەکی ئەفسوونی کاری لە بواری ئەندازەیی وشە کردووە. دەزانێت وێنە چەند وشە و چی لە وشە دەوێت. دوورە لە کەڵەکەکردن و دانە پاڵ یەکی وشە و دەستەواژە و ڕستەی بێ سوود.

کاتێك هەندێك لە شیعرەکانی دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت، لەناو هەورێکی پەمۆییدا مەلە دەکەیت، یان لەناو بەلەمی گەشتێکدایت زۆر بە هێمنی و بێ زۆر لە خۆکردن دەڕوات و حەز دەکەیت گەشتەکەت درێژ بیێتەوە. لەگەڵ فەزای شینی ئاو و فەزای شینی ئاسمان پێوەندییەك دێتە ناوەوەو دەبێتە بکەر. لە بنیادی کردەی شیعرەوە پەیدابووە و هاتووەتە ناو خانە وردەکانی ژیانمانەوە. کەواتە ئەمجۆرە ئەدەبە، ئەدەبی ڕاستەقینەیە و خۆت لەبەردەم ئەزموونێکی پاك و پوختدا دەبینیتەوە، کە بە ئێستێتیکای چێژ و هەست و سۆز چندراوە. وێناکردنێکی سۆفیگەرییانە، دید و دیدگای سۆفیگەریی خواست و بڕوابەخشینە بە مرۆڤ و پاکبوونەوەی مرۆڤ. لەسەر بنەمای کرانەوەی گیان بەسەر جوانبینی و چاکبینی و ژیاندۆستی.

لە ئەنجامیشدا دەگەین بە شوێنە باڵاکان. لە ئەزموونی شاعیردا ئەم دۆخە پێ بەپێ خۆی دادەمەزرێنێ. ئەم خۆدامەزراندنەش بەرهەمی بیرکردنەوەیەتی. بیرکردنەوەکانیشی گەیشتوون بە ئاستی بەرهەمهێنان. بەرهەمی ئەم جۆرە



بیرکردنەوەیەش مەودای میتافیزیکی فراوان دەکات و هێما و هێماپێکراو لەم فراوانبوونەوەیەدا تێکدەچڕژێن و لە چێژ، چێژدارترن. لە هەست، هەستدارترن، لە سۆز سۆزدارترن.

ئەم شاعیرە لە شیعر دوورکەوتووەتەوە. پێویستە لە هەقیقەتێکی کاریگەر و ئێستێتیکی بە ئاگا بێتەوە و بێت لەناو ماڵی شیعردا نیشتەجێ بێتەوە و ببێت بە کەسایەتییەکی زیندوو، بەوەی ڕوانینە جوانەکان هێشتان نەکوژراون، شاعیر دەتوانێت بۆی بژیێت و بەرهەمی بهێنێتەوە.

ئابی ٢٠٠٨ هەولێر

## گەرم نەبوونەوە

کاتێك شیعر ئازادیی نووسینی تەواو بەدەست دەهێنێت، ملکەچی هیچ نەخشەکێشانێکی فیکری ئامادەکراو و سیستمێکی سیاسی نابێت. شاعیری خاوەن دیدگای بەهێز لەوانەیە ئەمڕۆ شیعرێك بنووسێت و سبەینێش شیعرێکی دیکە و دووسبەیش شیعرێك. شیعری (یەکەم) لە شیعری (دووەم) نەچێت و (سێیەم)یش لە دووەم و یەکەم نەچێت.

لەم شێواز و دیدگا بەهێزەیدا ئازادیی نووسینی تەواوی بەدەست هێناوە. ئازادیی نووسین بەدوای نووسیندا ناگەڕێت، بگرە لەناو نووسیندا ئازادیی نووسین وەك سەرچاوەیەك بۆ کار لەسەرکردن بەدەست دەهێندرێت، بەڵگەی ئەم بەدەستهێنانی ئازادی نووسینە ئەوەیە، کە لە ئەمڕۆی شیعری کوردیدا چەندین شێواز پێیان دەنووسرێت و لە بەخشینیش بەردەوامن، یان شاعیرێك دەبینین لە چەند شێوازێکدا توانایی خۆی بەکاردەهێنێت و داهێنان دەخاتەوە. ئازادیی نووسینیش تایبەتە بە خودی بەرهەمهێنەری دیدگای بەهێز. بەردەوامیش کردە و واتای ئازادیی نووسین لە ئەزموونێکەوە بۆ ئەزموونێکی دیکە درێژ دەبێتەوەو (ناوەند دەشکێنێت).

شیعری بەرهەمهاتووی دیدگای بەهێز، هەوڵی گەیاندن و مانا دۆزینەوە بۆ لێکدانەوەی شتە ئاماژە بۆکراوەکان نادات، بگرە شەوق و تاسە و ئاماژە لە خاڵێکدا کار پێدەکات و دەیانباتە ناو بیرکردنەوەو زەین، واتە شەوق و تاسە و ئاماژە لەنێوان دەربڕینەکاندا نامێنێتەوە، بگرە دەکەوێتە نێوان بوونی پێوەندی وشەکان و کردەی بوون بە ڕستە و وێنە، بە یارمەتی پێوەندیی نێوان وشەکان دەچنە ناو پێکهاتەی زەینەوەو بینای زەینی دادەمەزرێنێت، بۆیە دەقەکانی دەقی زەینین، بەڵام دەقی ئەفسوونی نین.

لەم تێڕوانینەوە تێپەڕین و پەڕینەوە بوونی دەناسرێت و پێوەندییەکان لەناو دەقدا دەکرێنەوە و چەمکی جیاکاری داهێنان بۆ خاڵی پێکهاتەی زمان لە (شەوق) و (تاسە) و (ئاماژە)دا چڕ دەبێتەوە.

لە دەقدا خەسڵەتی هەقیقەت نییە، بگرە پێکهاتەی داهێنانی هەیە، چونکە شیعر بە پێکهاتەی داهێنان لە دیدی ژیانەوە بەڕێوە دەچێت و شیعرێك بەرهەم دێت، بەردەوام لە جووڵە و بەرهەمهێنانەوەی شەوق و تاسە و ئاماژە، ڕەگی دەباتەوە سەر ڕەگی ئەفسانە و ئەفسوون و فەنتازیا و خۆی ئاراستەی شێوازی ئێستێتیکی سروشت دەکات، لەمیش جێگیر نابێت و بەرەو زەین دەکشێ.

زۆر بە وریاییەوە ڕۆدەچێتە ناو سروشت و مرۆڤ لە پێکهاتەی سروشتدا دەگەیەنێتە چڕبوونەوەی چرکە سۆزدارییەکان و دەزانێت دەنگەکانی سروشت لە کوێوە سەر هەڵدەدەن و پاشان لە وێنەدا دەریاندەخات و خاڵ نیشانی نێوان دەنگ و گیان دەکات، پاشان دەنگ و گیان دەکاتە دەلالەت و هێما، لە نێوان ئاسۆکانی وێنەدا زەینی پێ دەبینێت.

زەین ناخاتە خزمەتی هیچ شتێکەوە، تەنیا شیعر خۆی و ئێستێتیکی شیعرییەت نەبێت، واتا چێژ و جوانی و نەرمونیانیی ژیان و بڕوایی و هەستی ئەوی دی تێدا قووڵ دەکاتەوە، بەهۆی زمانی بەتین و تاو.

زمانی ونبووی نەدۆزیوەتەوە. زمانی ونبوو لە سەرچاوەی پێکهێنەری دەرەکی نادۆزێتەوە. دۆزینەوەی زمانی ونبوو پەیداکردنی سەرچاوەیە، کە لە ناخی خۆتدا، یان پێوەندیکردنێکی ئەدەبییە بە ناخی خۆتەوە. ناخی خۆت وەك کولتوورێکی تاکەکەسی ئەدەبی و ژیانی گیانی. زمانی ونبوو هەمیشە دەسەڵاتی نادیاری بەسەر داهێنەرەوە هەیە بۆ دۆزینەوەی ئاستەکانی بینینی کەسی خۆی.

چەند شیعرێکی ئەم کتێبە شیعرییە. نموونە وەك: (دەشتایی گیان)، (دژوارترین کاتدا)، (رووتبوونەوەیەکی تر)، (خرۆشان) مانای بوونناسانەیان هەیە و شکۆ و بەهرەی بوونناسی لە خۆیاندا بەرهەم دەهێننەوە. یەکێتی فۆرم پشتیوانی لە مانای بوونناسی دەکات و ئەو ڕەگەزانە دەخاتە ڕوو، کە لە دەقدا بوونەتە مانا و بابەت و پێوانە بۆ بوونناسی.

یەك لە خەسڵەتە گرینگەکانی شێوازی ئەم شاعیرە ئەوەیە لە سەرەتای شیعردا کۆتایی دەدۆزرێتەوە. سەرەتا ئەفسوونی تەواوی شیعرەو لەودا بیر دەکاتەوەو بەگشت و بەشەکانی دیکە دەگات.

ناوەند و کۆتایی دەهێنێتەوە ناو سەرەتا و وێنەکان دەتوانن هاتوچۆ بکەن. وێنە لە شیعرەکانیدا، وێنەیەکی هەستی و ئەوجا بینین و نامۆیی گیانین، مەودای نێوان گیان و دەنگ دەستنیشان دەکەن. شێوازی لیریکی



لەم دیوانەدا نابیندرێت، مەگەر هەستی نۆستالژیایی نەبێت. جارجارە لەسەر گیان و هەستەکان بەکاری دەهێنێت. جێی بایەخی دەبن و ئاراستەی نووسینی دەکەن.

ئاگادارییەکی زۆر لە هەستدا بەکاردەهێنێت و لە هەستکردندا دەوڵەمەند و پڕ ئەزموونە، ئاڵۆز و خاڵی بینینی ون نییە. زوو دەگەڕێتەوە بۆ زەمینەی ئەو سەرچاوانەی کە پێی سەرسام بووە و وەك ڕەگەزێکی بەرهەمهێنان کردەی ئەم گەڕانەوەیە ئەنجام دەدات و جۆش بە هەستکردنی دەدات.

شیعری هەڵچوون لەناو گرفتی سەرچاوەکەیدا دەمێنێتەوە، زمانێکی ئێستێتیکی سەربەخۆ دەربڕینی لێ نەکردووە. خاڵێك بیری بە ئاگا دەهێنێتەوەو بە قسە دێت. فۆرمێکی تایبەت وەردەگرێت، بە ئاگا هێنانەوەی بیر نەك فۆرمێك لەناو بیرکردنەوەدا زمانێکی ئێستێتیکی سەربەخۆ دەربڕینی لێ کردبێت.

شاعیر خۆڕسکانە شیعرەکانی نووسیوە، خۆڕسك مەبەست ئەوە نییە پشت نەبەستن بە ڕۆشنبیرییەکی خەملێو و گەلاڵەبوو، یان درەوشانەوەی دیدگایەکی بەهێز، لەم ڕووەوە شاعیر خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی خەملێو و دیدگایەکی بەهێزی شیعرییە، بگرە مەبەست ئەوەیە دوور لە هەموو پەیوەستبوونێك بە لایەن و ئایدۆلۆژیایەك کردەی ئازادیی نووسینی پەیڕەوکردووە، کە ڕووبەڕووی شیعری بێگەرد بووەتەوە. دەرکەوت تەواوی توانستی ئازادیی نووسینی بەدەست هێناوە. بەهای ئازادیی نووسین دەستنیشانی داهێنانە شیعرییەکەی دەکات. نەك مەسەلە و بارودۆخ.

(گەرم نەبوونەوە)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (جەلال بەرزنجی)یە. ساڵی (١٩٨٥) لە دووتوێی (٥٦) لاپەڕەدا لە چاپخانەی (الحوادث) لە بەغدا چاپ کراوە، ئەم شیعرانەی تێدایە: (مات بوون، پڕبوونەوەی نیوەی گیان، ئاڵۆزبوونی خەونەکانم، سێبەری ڕەنگەکان، هاتن، نزیکترین تەزوو، ئاهەنگی بەردەوامی خۆم، نەورووژان، سپیاتی، دەشتایی گیان، بەتاڵبوون، کۆتایی ناکۆکییەکان، کەف، ئارەزوویەکی کۆن، برینی سێبەر، پەککەوتنی ئاو، نەگەڕانەوەی نامۆیی، لە دژوارترین کاتدا، سێبەرێکی مۆر، لەیادچوونەوە، ئاوێتەبوونی شتەکان، زەمەند، پاڵاوتنی نهێنییەکان، نەسرەوتن، دڵێکی بایی، بڵقی سەرخاك، وەرزەکانیش خۆشیان دەوێ، ناشتن، نیازی ئاو، گوڵێکی تەنیا، گەرم نەبوونەوە، مەزار، ڕووتبوونەوەیەکی تر، دوای زریان، قوڵغ، ئاونگ، یەکیەتی بوون، خرۆشان، ئەستێرەیەکی گەڕیدە، سروودی ئاوابوون.)

ئاڵۆزبوونی خەونەکانم
کتوپڕ ناخم گران بوو
دەمارەکانیشم شل بوون
ڕووناکییە شەپڵە لێدراوەکانی ڕوحیشم
هیچیان لەبارەی خۆیانەوە بەبیر نەما
ئابڵۆقە دراوم
ئابڵۆقە درانێکی هەمیشەیی و نەزۆك
هەستیشم کرژ بووەوە ناو گەرمایی بۆنکردووی خۆی
لەناو ئەو مێرگە ناوەستم



سۆزمی لێ هەڵدەپەنمێ
هەرچەندەش بمێنمەوە
شتی جاویدانی لێ ناڕوێ
ئابڵۆقە دراوم
ناشتوانم بەدیار ئەم ئەنجامە مۆمیاکراوە بوەستم
خەونێك
بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت
لەشم تێکدات
سەوزایی دەروونیشم
بەسەر سەوزایی سروشت خات
خوێنی ڕژاویشم
پێشوازی ڕووناکییە سەرما لێنیشتووەکان دەکات
ئەوەی بەم ڕێڕەوەدا ڕابووری
ئاوێکی مۆمیاکراو لە خشتەی دەبا
یان قامچی دڕندەی با
هەموو پشتی لەت لەت دەکات
کتوپڕ ناخم گران بوو
دەمارەکانیشم شل بوون
نەمتوانی ماڵئاوایی لە ئێوارەی ناو شاخان بکەم
یان خۆم لە کنێری قەدپاڵان وەردەم
بەردێك نییە سەرمی پیاکەم

ئاوێکی مۆمیا نەکراویش
قاچەکانمی لەناو جووت کەم
لەم کاتە زەرد هەڵاتووە چەماوەیە
لەم ماوە کەمەش پیاسە ناکرێ
دەرگای ئەم پەرستگایە تەمەڵەش ناکرێتەوە
هیچی تر باسی سروشت ناکەم
ئەو بوو دڵە ساکارەکەمی وا نەخۆش کرد
رێگای چوونە دەرەوەی لێ گرتم
رێگای هاتنە ژوورەوەی لێ گرتم
ناخم گران بوو
چیتر دوای جۆگەی پاش شۆرینی مردووان ناکەوم
خەونێك بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت
سەوزایی دەروونم بەسەر سەوزایی سروشت خات
یان کتوپڕ
لەناو ئەو شەوە برك کردووەدا بمرم

شیعر بەهایەکی ئێستێتیکی ڕەهای هەیە، دەشبێ بزاندرێت ئەو ئێستێتیکایە لە بینای گشتیی شیعرەکەدا چییە و دەربکەوێت. ئەگەر ئەو زانینە شێوا، یان ون بوو، شیعرەکە خواستی داهێنان و بەکارهێنانی تێدا نییە. شێواز و تایبەتکاریی شیعری بێگەردی وەرنەگرتووە. واتە زمان شێواز و ئێستێتیکای بۆ دەستەبەر نەکردووە.



لە شیعری ئەم شاعیرەدا دوو ئاستی کارکردن و شێواز هەیە.

یەکەم: پەیوەستە بە کولتووری دوور و نزیکی خۆماڵی و بێگانە، نوێبەخشی تێدا بەرهەم دەهێنێت و سیمای دەکات بە سیمای ئەمڕۆی مۆسیقادار، بەهای ئێستێتیکی لە سەرەتا لەناو مۆسیقادایە، ئەوجا لەناو واتا و وێنەدا خۆی دادەمەزرێنێت و دەردەکەوێت. واتا و وێنەی ئێستێتیکی زەینی سنووردار ناکات و بینایەکی ئاوێتەکراوی پێ دەدات، کە لە کۆمەڵێك ڕەگەز پێکهاتووە.

دووەم: پێویستییە ژیانییەکانی رۆژانەی کەسیی خۆی وەك کەسێکی هەستەوەرو تێکەڵبوو بە دەوروبەر. ئەم پێویستییە ژیانییەش لە سروشتی ئەزموونییەوە درێژ دەبێتەوە.

خەستکردنەوەی ڕستە شیعرییەکانی لەناو ڕووداوە دیار و بیندراوەکان و ڕاکێشانیان بۆ ناو هەست و خەون، کە وەك هەوێنێك بە دەروون و بیری پڕاوە و یارمەتی دەدات بۆ نزیککردنەوەی دەوروبەر بۆ ناخ و کرۆکی و خەملاندنی لە ئەزموونی ئازادی نووسیندا. شیعری (هاتن) نموونەی ئەم بۆچوونەیە.

خەیاڵ و سۆزی گەرم دەبێت و بە بیر دەینووسێت. ژیانی ڕۆژانەی خۆی وەك سەرچاوە بەکارنەهێناوە. هەر لەم خاڵ بینینەشدا دەبینین وشەی (تۆ) و (من) زۆر کەم بەرچاو دەکەوێت. ئەگەر بە دەگمەنیش بەرچاو بکەوێت ئەوە (تۆ) و (من)ێکی شیعرییە و ئاسۆیەکە هاوتای تێدا دۆزیوەتەوە و کردەی دۆنایدۆنی لێوە بەڕێوە دەبەن.

ئاڵۆزی نەخستووەتە ناو ڕستە شیعرییەکانی، بەڵام گرانی و قووڵیی واتای خستووەتەوە بۆ بەهێزکردنی پێوەندییە گیانییەکانی کەسی هەستەوەرەوە. پێشدەچێت شاعیر پێوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ شیعری کلاسیکی کوردیدا نەبووبێت، بەوەی خوازە و لێکچوون و مەجاز و خواستن و نیشانە،... تاد. لە شێوازیدا کەم دەردەکەون و تارادەیەك ونە، ئەگەر هەشبێت لاوەکی و یەك ئاستە. ڕەوانبێژیی جیاکار لەنێوان شێوازەکان دەرناکەوێت. بیر و کارکردن لە ئاسۆکانی بیر زیاتر سەرنجی ڕاکێشاوە لە هونەری ڕەوانبێژی و ئاستداریی زمان.

گەشەکردنی زمان پرۆژەیەکی درێژخایەنە بەو هێڵەی، کە لە سەرەتاوە تا بە ئێستا دەگات شیعری کوردی پێ بە پێی پێیدا هاتووەتە خوارەوە. شاعیرانمان خۆیان بۆی ماندوو کردووە. ئەوە بەها و پێوەری بنەمایەکە بە دڵنیایی و بڕواوە لە ئاستیدا هەنگاومان ناوەو لە ڕەنجمان دوودڵ نین.

ئەم شاعیرە دەسەڵاتی بیری لە زمان و وشەدا تاقی کردووەتەوە و لە کۆکردنەوەی هێزی هەرسێکیاندا شیعرییەتی لە دەقدا ڕسکاندووە. بەهای هەریەك لە (بیر) و (زمان) و (وشە)ی سەربەخۆ وەك هارمۆنییەتێك لە وێنەدا بەکارهێناوەو دەری خستووە، پاشان لە درێژبوونەوەی شیعرەکەدا ئێستێتیکایەکی شێوە ئەفسانەیی هەست پێ دەکەیت. ئەم شێوازەی نەبووەتە (تەوژم) و (ڕووداو)ێك، بگرە هەر خۆی لەناویدا درێژ بووەتەوە و لە شیعری نوێبەخشی کوردیدا شیعری گرینگی پێ نووسیوە.

ئەیلوولی ٢٠٠٨ هەولێر



## نزا سپییەکانی من

ئەو شاعیرەی، کە ژیانێکی خۆشگوزەرانی هەیە، ببڕای بڕ ناتوانێت شیعرێکی داهێنەرانە بنووسێت. بۆیە ئەو شاعیرانەی نازکێشراوی دەسەڵاتن، خاوەنی مێژووی داهێنان نین، چونکە گیانی یاخیبوونیان تێدا مردێندراوە و بەرفەرمانن و چاویلکەی ڕەنگاوڕەنگ لەچاو کراون.

ئەم شاعیرە خودی هەستیار و نیگەران و ماندوویی خۆی لەناو تێڕوانینێکی لەبیر نەکراودا کردووە بە دەقی شیعری و هەڵیداوەتە ناو پانتاییە پڕ ئاژاوەکانی ژیان، ئەو خودەی واقیع ستەمی لێ کردووە و نەیهێشتووە پڕ بە دڵی لە ناویدا بژیێت. لە کرۆکدا شیعر هێنانە گۆی دەنگە گەمارۆدراوەکانە و بەرزکردنەوەیەتی لە ئاست واقیع و پێچەوانەکردنەوەی دەسەڵات و هێزی خۆسەپێنەری ئەو واقیعەیە، کە نەیهێشتووە پڕ بە دڵی لە ناوی بژیێت و خودی هەستیار و نیگەران و ماندووی خۆی تێدا دامەزرێنێت. لە واقیعی کۆمەڵگەی زیندوودا شیعر وەك یەکەم دەرکەوتەی مرۆڤ و ڕۆشنایی بوون ناسراوەو فۆرمی وەرگرتووە، پاشان بۆ پاراستنی خۆی بەردەوام کاری لەسەر بوون و هەبوون کردووە.

واقیعی کۆمەڵگەی زیندوو درەوشانەوەی بەردەوامی تێدایە بۆ کار لەسەرکردن و خۆ دامەزراندن و بەجێهێنانی پرۆژەکانی ئەزموونی ژیان و نووسین.

واقیعی ستەمکار لە مرۆڤی هەستیار و نیگەران و ماندوو بەهێزترە و دەسەڵاتی لێ سەندووەتەوە، یان جموجووڵ و چالاکییەکانی خستووەتە ژێر ڕکێفی خۆی و بەرزەفتی کردووە.

شیعریش کە ناوکی گیانە، دەبێت لەم خاڵ و خودەوە هاتبێت و بوونی خۆی ڕاگەیاندبێت. لە خاڵ و خودی هەستیار و نیگەران و ماندووەوە، بۆ بەرزکردنەوەی تا ئاستی (واقیع) و (بڕواهێنان).

هەندێك شیعر ساکارکردنی واقیعی لێ دەکەوێتەوە، لە کاتێکدا واقیع زۆر ئاڵۆزە. خودی هەستیار و نیگەران و ماندوو نابێت لە بۆتەی شیعردا دژی واقیعی زیندوو بێت، بگرە تێیدا هەوڵ بدات پێستەکانی واقیعی زیندوو هەڵبداتەوە و ڕاوی تاڵە تیشکەکانی بکات.

(واقیعی زیندوو) هەمیشە درەوشانەوەی بەردەوامی تێدایە بۆ کار لەسەرکردن و خۆ دامەزراندن و بەجێهێنانی پرۆژەکانی ئەزموونی ژیان و نووسین، بەڵام (واقیعی ستەمکار) لە ئاوات و داوایەکانی خودی هەستیار و نیگەران و ماندوو ناپرسێت و دیکتاتۆر و سەرکوتکەر و تۆقێنەرە. لە باری سەرکوتکردن و تۆقاندا جوانی و هەست بە جوانی کردن هەڵدەبزرکێت.

لە خەیاڵی شاعیردا هەموو خودی هەستیار و نیگەران و ماندوو لەناو شیعردا دەژین و پێوەندییەکان دادەنێن. ئەوەندە ناسك دەبنەوە لە درزبردن و شکانی شەختە دەچن لەبەر خۆری بەهاراندا، یان نەرم و نیانی و دەنك پڕئاوبوونی هەنار لەبەر نمەی بارانی پاییزان. پێوەندی لەگەڵ مەرگ دەگرن، بەڵام مەرگێکی لەخۆبردوو لەناو ئەو تێڕوانینە لە بیرنەکراوەی، کە خودی



هەستیار و نیگەران و ماندووی خۆی تێدا کردووە بە (دەقی شیعری) و هەڵیداوەتە ناو پانتاییە پڕ ئاژاوەکانی ژیان.

شیعرییەت بەم هەستیارییە و نیگەرانی و ماندووبوونەی خوددا دێت و یەکێتییەکی پتەویان لەنێوان ڕایەڵ دەکات، لە درێژبوونەوەی شیعرەکەدا ئەو ڕایەڵە هەڵناوەشێتەوە و شەیدا و سەرسامتر دەبێت و تەمێك لە هەستی دڵەڕاوکێ و هەست بە نامۆییکردن تێی دەئاڵێت و تانوپۆی دەچنێت و (بنیادێکی زەینی) دەداتێ.

جوانترین شێواز لە شیعردا ئەو شێوازەیە، کە دەیخوێنیتەوە بە پڕی و کامڵی هەست بکەیت لەناو بەشێك لە هەستەکانی تۆدا کاری کردووە و لەناوی ژیاویت و کامی دڵ دەخوێنیتەوە، ژیان لەناو چێژی کاتی شیعریدا داگیرساوە و وەك چەقی ناوەند دەبیندرێت.

ئەگەرچی چەق بۆ شیعر پێوەر نییە، ئاسۆی جووڵاو پێوەرە، ئاسۆی جووڵاویش هێزی گۆڕان پێ بە پێ دەبەخشێت و هاوسەنگیی خۆی لەگەڵ زماندا دەست دەخات، بەڵام کە لە خوێندنەوەکەدا تەواو بوویت، بگەڕێیتەوە دۆخی واقیعی ژیان و هەست بکەیت هەستێکی پاراو دەربڕاوە و لە بۆتەی دەقی شیعریدا بەرجەستە بووە.

شیعرییەت لە چێژ و هەستی کاتیدا دێتە بوون و لە دەقدا دەخولقێت و خولقانی خۆی تێکەڵی هێزی ئەفسووناوی دەکات. هەست و چێژی تەندروستیش ئەرکی زمان لە ئەستۆ دەگرن، لەو ئەرکی زمان لە ئەستۆ گرتنەدا کەشێکی تاکانەی بەدەست هێناوە و خوێنەری ڕووبەڕووی زمانی ناسك بوونەوە و شیعرییەت و جیاکاریی کردووەتەوە.

(نزا سپییەکانی من)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (عوسمان شەیدا)یە. ساڵی (١٩٩٩) لە دووتوێی (٩٧) لاپەڕەدا لە چاپخانەی (هەواڵ) لە سلێمانی چاپ کراوە، ئەم شیعرانەی تێدایە: (خەزان، ئەو شەوەی بەفری تێدا باری، ئەوین، خەتا، برووسکە، دوو پارچە شیعر، گۆڕهەڵکەن، سێو، شیعرێکی سەوز، کارەسات، بیست و چوار ساتەی ئێستای من، ٢٦/٨/١٩٩٥، مریەم، سەبووری یان سەفەری ئەییووب، خمخۆرك، دروود، ڕۆژانە یاداشت، نزا سپییەکانی من، کریسماس، سەراب نا سەفەر، ئەوینێ لە گوڵ پیاوێك لە درۆ، من.. تۆ و ستۆکهۆڵم، بەشێك لە داستانی خەج، قاسید، هەندێك لە وازییەکانی ژوانی زەرێ، دامیاو).

**مریەم**
**سێ ڕۆژە ماڵەکەم دەفێکی سواوە**
**شەوانە بە پەنجەی شیعر**
**لە سینگی خۆی دەدا**
**سێ ڕۆژە گەردی ڕۆح دەسووتێ**
**سێ ڕۆژە ڕەیحانەی عومری من**
**لە ئینجانەی هەوردا**
**بۆ مانگی ناوێزەی سریشکی**
**هەواڵێ دەگەڕێ**
**ئۆف لە خۆم**
**لە منی خێر نەدیو**
**ئاخر کوا ژنە ئینجیلییەکەم**



**ئاخر کوا**
**وا لە کوێ**
**ژنە سازگارەکەی عومری وشکەڵاتووی**
**منی دڵ پەشمەك**
**پێم بڵێن ئەگەرنا**
**قورئانی مزگەوت و**
**زەنگی کەنیسە و**
**مەرقەدی پیاوچاکان بە شاهید دەگرم**
**هەرچی ئازیزتانە**
**من ئاسا ئاگری تێ بەربێت**
**ئەگەر بێ و پێم نەڵێن**
**ژنە ئینجیلییەکەم وا لە کوێ**

شیعر بەچاو ناخوێندرێتەوە، باشترین شێوەی خوێندنەوە، خوێندنەوەیە بە بیر و زەین. لە شێوازی ئەمجۆرە خوێندنەوەیەدا هەموو دووری و ئاسۆکانی دەقی پاراو بەدی دەکرێت. وەك دووری و ئاسۆ و بینین و بیستن و هێما و هێماپێکراو و زانیاری پەیدا کردن لەبارەی هونەری شیعر نووسین و ڕەوانبێژی و ئەزموونی زمانەوانی. لەم ڕووبەڕووبوونەوەیەدا هەست بە پێویستبوونی شیعر و نووسین لەناو کۆمەڵگە ڕوودەدات. باری چێژ دەگۆڕێت بۆ باری پێویستی. ئەم خوێنەرە هەمەلایەنە لە یەك کاتدا چەند

کەس و لایەکە، بەڵام لایەك لایەکی دیکەیان ناسڕێتەوە و خود کپ نابێت. واتە فرە ڕوانینە بۆ دەقی پاراو و ئەفسوونی وشە.

وشە لە وێناکردنی خەیاڵ دەبێتە ڕووداو و شتی نادیار، بەڵام وزەیەکی داهێندراوەو لە زەیندا هەست پێکراوە.

ڕووداو و شتی نادیاریش، کە تێیدا قاڵ و قووڵ بوویتەوە، دەبێتە موڵکی خودی هەستیار و نیگەران و ماندوو، لەسەر بنچینەی خەیاڵ و قاڵ و قووڵبوونەوەدا، (توانا) و (بەهرە) گیان بە شتی نادیار دەبەخشن و ڕووداوە هەستییەکان ڕوودەدەن و دەبن بە (وزەیەکی داهێندراو).

لە ١٩٥٣ لە سلێمانی لەدایك بووە، پێشبینیکردن یەك لە خەسڵەتە گرینگەکانی شاعیری ڕاستەقینەیە. ئەو ڕووداوانەی، کە بوونەتە پێکهێنەر و بنیادی نووسینی ئەم کتێبە شیعرییە پەیوەستن بە ژیانی شاعیر خۆیەوە و مانیفێستی ژیانی کەسایەتی خۆی ڕادەگەیەنن. نموونە: وەك لە شیعری (خەزان)، یان لە شیعری (مریەم)، یان لە شیعری (خەتا)، یان لە شیعری (دووپارچە شیعر) دەردەکەوێت. دەتوانین لە ڕێگای زمانەوە مانای جیا جیایش لەم مانیفێستەی ژیانی وەربگرین. لە کاتێکدا زمان تۆڕێکە هەموو وزەیەکی تێدایە بۆ دۆخگۆڕین. ئەو ئاماژانەشی داوە، کە زوو و بەجوانی ئەم ژیانە بەجێ دەهێڵێت و ژیانی نووسینی تەواو دەبێت. ٢\٥\ ٢٠٠٥ کورد یەك لە مێوانە جوانەکانی سەر زەمینی کوردستانی جوانە مەرگ بوو، کە توانای جوان نووسین و جوان ژیانی هەبوو. بەردەوامیش لەسەر مانیفێستی ژیانی کەسایەتیی خۆی ئیشی کردووە. بەو پانتاییەی تێیدا خولاوەتەوە ڕووبەری ماڵەکەی



خۆیەتی و کارەکتەری کاراشی هاوسەر و منداڵەکانیەتی: (ئایشێ، شنرویێ، ئاسۆ، دەشنێ).

هەندێك دەنگی نەمر لە ناخیدا نیشتووە و شاعیر خۆی تێکەڵی ئەم دەنگە نیشتووانەی ناخی دەکاتەوە و دەیانجووڵێنێت، کە بەردەوام لەناو ڕووداوە شیعرییەکانی دووبارە دەبنەوە و سیمایان پێشان دەدرێنەوە. گۆڕانێك، گۆڕانێکی بنەڕەتی لە ژیانیدا دێتە گۆڕێ و دواتر ئەم گۆڕانە دەبێتە بناغەی شیعرەکانی و گەشە بە تێگەیشتنی دەدات، لە توخمە زمانەوانییەکان نزیك دەبێتەوە. خودێکی لیریکی تێکەڵ بە خودی دەبێ و لە شیعرەکانیدا چاومان پێی دەکەوێت.

ئەگەرچی بەشێك لە شاعیرە بەتواناکانمان، کە (شیعرییەتی شیعری کوردییان دامەزراندووە.) وەك مانیفێستی ژیانی کەسایەتیی خۆیان دەقی سەرنجڕاکێشیان بۆ بەجێ هێشتووین و هەمیشە درەوشانەوەی بەردەوامییان تێدایە بۆ کار لەسەرکردن و خۆدامەزراندن و بەجێهێنانی پرۆژەکانی ئەزموونی ژیان و نووسین.

تشرینی یەکەمی ٢٠٠٨ هەولێر

# دڵدارەکەم پایزە گەواڵەیەك نییە

شیعر گیانی مرۆڤ لە دەربڕینە زمانییەکانیدا بەرجەستە دەکات و شێواز بەرهەم دەهێنێت، شێوازی ئاخاوتن و نووسین و گوتن. دەتوانین لە ڕێگای شاکارە شیعرییەکانی دنیا، تێگەیشتن و وێنا و هێڵکارییەکمان بۆ گیانی مرۆڤایەتی دەست بکەوێت. وەك وێنایەکی ئێستێتیکی و هەستی، نەك وەك (زانست) و (ئامار).

ڕێز لە تواناکانی بەرانبەر دەنێم و بەپێی ئاستی کار و داهێنانیانەوە بە دڵم دەبن. ئەمەش، یان لە کاتێکی کورت و دیاریکراودا لە قووڵایی دڵم نیشتەجێ بوونە و لە یادگەمدا ماونەتەوە، جاروبار یادگەم دەجووڵێنن و سۆزم بۆیان پەیدا دەبێتەوە، یان کاریگەرییان تا ماوەیەکی درێژ ماوەتەوە و لە خولیامدان و ئاراستەیەکی ڕاستەقینەن بۆ وەرگرتن لە باری گیانییەوە. ئەوانەی بۆ ماوەیەکی کورت و دیاریکراو چێژیان خرۆشاندم و کۆتاییان هاتووە، نەستم سڕیونەتییەوە، یان ئەوانەی بەردەوام خولیایان بەهێز کردووم و دەنگە دەربڕاوەکانی وشەکان هاودەنگم بوونە و خاوەنی ڕۆڵێکی کاریگەرن. بۆ ئەدەبیینی و بە پیتکردنی بۆچوون لەباری ئەدەبییەوە. لە هەردوو باردا پشتیوانییان لێ دەکرێت. ئەو کاریگەری



دانانەی لەسەر پێکهاتە هەستییەکانی ئەوی دی بۆ بەردەوام خوێندنەوە. دەرکەوتنی ڕۆڵی داهێنان و بە ئەدەبیبوونی هێزی زمانە.

ئەگەر لە شیعری حەفتایەکانی کوردیدا چەند نموونەیەکی جوان و داهێندراو لە زەین و یادگەمدا مابنەوە و بەردەوامییان لەگەڵمدا هەبووبێت یەك لەوانە شیعرێکی بە ئەزموونداچووی ئەم شاعیرەیە، (بەڕووتی لەبەر بارانی لەزەتدا)، کە لە گۆڤاری (بەیان) ژمارە (٤٥)ی کانوونی یەکەمی (١٩٧٧)دا بڵاوی کردووەتەوە. لە بوونیدا گیانی ئێستێتیکای هەڵگرتووە و پاراستویەتی. بەتایبەتی لە ڕووی قووڵبوونەوە لە (وێنە) و (مۆسیقا)دا.

پێکهاتەی ئەم شیعرە لە دڵی ساکار و ئاڵۆزی شاردا ڕایەڵی خۆی چنیوە و بە هەموو کەشوهەوا و خەسڵەتێکەوە وێنەکانی ژیانی ڕەنگ کردووە، بەردەوام لە خولیامدا بوونی داهێندراوی خۆی درێژ کردووەتەوە و خاوەنی ڕۆڵی کاریگەرە. فەزای شار فەزایەکی قەرەباڵغ و پڕ نهێنییە، بواری جیابینی و جیاکاری دەڕەخسێنێت. بەردەوام لە جووڵەدایە و لە جووڵە ناکەوێت. بە زەینێکی کراوە و ئێستێتیکی جوانییەکانی خوێندووەتەوە و بە وشە و دەستەواژەی جیاکار لە شاعیرانی دەوروبەری دەربڕینی لە بارودۆخی هەستی و بیندراودا کردووەو دەرچووە لەو زمان و دەربڕینە فەرمانسالارییەی شاعیرانی دەوروبەری کردوویانەتە ناسنامە و شێوازی قۆناغێکی شیعری. دواتر شیعری تاراوگەی کوردی، زیاتر تایبەتکارە بەو شاعیرانەی کۆچیان بۆ جوگرافیایەکی دوور کردووە. وەك دیاردەیەك لە ناوەندی ئەدەبی کوردیدا ڕوویداوە. لە چامەی (قوربانی تۆزی

ڕێگەتم)ی (نالی) و چامەی (گوتم بە بەختی خەواڵوو)ی (حاجی قادری کۆیی)یەوە ناسرا و بوو بە بابەت و شێواز و ڕووداو و دیاردە.

شاعیری ڕاستەقینە لە هیچ شوێن ناژیت، لە کۆچێکی بەردەوامدایە. شوێنی ژیان بۆ ئەو تەنیا نیشتمانی شیعرە، یان هێزی وشەیە، کە خودی پڕ سەرگەردانی داهێنەرانەی خۆی تێدا دادەمەزرێنێت و سەقامگیری دەکات.

شیعری تاراوگەکراو بنیادێکی بابەتی و چەشنێکی تایبەتییان هەیە و جۆرێك جموجووڵی گۆڕانیشیان لە زماندا پەیداکرد، یان زمانیان بردەوە سەر هاواری بە تەوژمی هەست و سۆز و ناسکبوونەوە. ئەمەش هۆیەکە بۆ تەسککردنەوەی بواری زمان.

زیاتر لە شیعری تاراوگەدا پرسیار (ڕامانی سەرەکی)ە. کاریان لەبارەی هاواری بە تەوژم و هەستی غەریبی و سۆزی گەرمی خودایی کردووە و ئەو هەستپێکردن و ئاشکرابوونە بە بۆچوونی من لە شیعری (غەریبی)ی ئەم شاعیرەدا، کە لە گۆڤاری (نەوشەفەق)ی ژمارە (٥٢)ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٨دا بڵاوکراوەتەوە دەگاتە گەلاڵەبوونی دەقێکی ئێستێتیکی و لێوانلێو لە بێگەردیی هاواری بە تەوژم و هەست و سۆز و شیعرییەت و چڕبوونەوە لە دەربڕیندا، گەیاندنێکی تەواو دەروشانەوەی لە زەین و مێشکی بەرانبەردا دەخەملێنێت. سۆزی قووڵ و برین کولانەوە و لە نیشتیمان هەڵکەنان و هەستی غەریبی کردووە بە هونەر. هونەری ئاخاوتنی شیعر لەناو ئێستێتیکادا. هونەریش تەنیا بە خاڵ و هێڵی ئێستێتیکا پێوانە دەکرێت. ئێستێتیکا هەموو ئاسۆیەك لە بوونی دەقدا



پێ دەگەیەنێت بۆ دەروشانەوە و هیچ ترووسکەیەکی دەروشانەوەش ناکوژێت.

سۆز پێوەندی شاعیر بە ڕابردووەوە ئاشکرا دەکات، لەمجۆرە شیعرەدا جەخت لەسەر هاواری بە تەوژم و سۆز و هەست بە نامۆییکردن دەکرێتەوە. ئەمەش بەهۆی پاڵنەرە سایکۆلۆژییەکەیەوە، کە نەیتوانیوە تێکەڵاوی دەوروبەری ببێت و تەبایی و پێوەندیی هاوگیانی دروست بکات و کولتووری ئەوێ وەربگرێت. ئەم بارە دەروونییە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هەست بە نامۆییکردن و بەرزبوونەوەی سۆز و هاواری بەتەوژم، کە شاعیر بارودۆخێکی گونجاوی بۆ هەڵکەوت و توانی لەگەڵ کۆمەڵگەی ئەو جوگرافیایەی کۆچی بۆ کردووە تەباییەکی کولتووری بەدەست بهێنێت و دەستکاریی ژیانی خۆی بکات بۆ ڕاهاتن بە جۆری ژیانی ئەوان و ئەوێ.

ئەو هاوارە بە تەوژمە و هەست بە نامۆییکردن و بەرزبوونەوەی سۆزەی بەرەو کاڵبوونەوە دەچێت، ئەگەر ئەزموونی شاعیرانی تاراوگەکراوی خۆمان بهێنینە بەرچاو ئەوەمان لا جێگیر دەبێت و دەبێتە خاڵێکی ئاشکرا، کە شاعیران چەند ساڵێکی سەرەتای تاراوگەبوونیان ئەمجۆرە شیعرەیان بەرهەم هێناوە. دواتر پێ بە پێ بۆ ناو شیعری بوونی کشاون. ڕەگەزی (سەرەکی) تێکەڵی ڕەگەزی (لاوەکی) دەکەن. لەو کردار و کردەیەدا هەست و سۆز و هاواری بە تەوژم دەبن بە ڕەگەزی لاوەکی.

هەر کەسێك لە کاتی دەربڕینی هەست و سۆز و هاواری بە تەوژمدا. چ لە (ئاخاوتن) و چ لە (نووسین)دا شێوازی خۆی بۆ دروست دەبێت. شێوازیش زانستە. مرۆڤ لە کاتی دەربڕینی هاواری بە تەوژم و هەست و

سۆزدا شێوازیان لێك جیا دەبێتەوە، بەلاّم لە دەربڕینکردن و دەربڕینی ئەقلّیدا شێوازیان لێك نزیك دەبێتەوە. ئەو بۆچوونە نهێنییەك نییە هەولّی ئاشکرابوونی بۆ بدرێت.

لە بنەڕەتیشدا هاواری بە تەوژم و سۆز لە ناوەرۆکە هەستییەکانی مرۆڤەوە پەیدا دەبن و لە دەربڕیندا شێواز دروست دەکەن. هاواری بە تەوژم و سۆز لەناو چرکەی کورتخایەندا گەرای خۆی دادەنێت و لە کتوپڕدا دەترووکێت. زەمینەسازی بۆ نووسین پێکدەهێنێ، یان دۆخی پرسیار و ورووژان و بیرکردنەوە دەدۆزێتەوە بۆ هاواری بە تەوژم و سۆز و هەست.

(دلّدارەکەم پایزە گەوالّەیەك نییە)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (سەلاّح شوان)ە. سالّی ١٩٧٨ لە دووتوێی ١٥١ لاپەڕەدا لە چاپخانەی (دارالحریة للطباعة) لە بەغدا چاپ کراوە، شەست و چوار شیعری تێدایە.

بەسەر سێ بەشدا دابەش کراوە.

بەشی یەکەم: لاپەڕە (٥ تا ٦٦) چل شیعری لەخۆ گرتووە.

بەشی دووەم: لاپەڕە (٧٠ تا ١٢٠) هەژدە شیعری لەخۆ گرتووە.

بەشی سێیەم: لاپەڕە (١٣٥ تا ١٤٥) شەش شیعری لەخۆ گرتووە.

گشت شتەکان بسڕەرەوە
کچۆلّەی زریانت دیوە
چۆن سوخمە و ژێرکراسەکەی
لەسەر بەفر هەلّئەخات و
خۆی ئەکوژێت



کاروان مەکە
کاروان مەرگە و مانەوەشت دیسان مەرگە
کاروان مەکە
زەردووی دارستان خوێنەکەت
ئەفەوتێنێت
لە جێگاکەی خۆتدا کپ بە
تا ئەم خولەش تەواو ئەبێت
ئەوساکە ئەگەڕێینەوە
ئەگەڕێینەوەو مندالّی
لە پەلّەیەکی ڕووناکدا هەلّئەگرین
گەورەی ئەکەین
تا ئەبێتە دەریایەك لە گلێنەدا
یان ئەبێتە خالّێك لە ناوکی لەزەت
کاروان مەکە، چونکە مانگ ئا لەم شەوەدا
خۆی لەسەر درەختی غەمی پەمەیی ڕووت ئەکاتەوە
ئەوسا ئێمەش بڕیار ئەدەین
بمرین
یاخۆ نەمرین
گشت شتەکان بسڕەرەوە
ئەوسا سەیری خۆت کە بوویتە بە گشت شتێك
تێکەلّی ئاورنگی خەونی بەیانیان ئەبیت و دەریا

شەق ئەبات و
دەنگی دڵدارەکەتت بەرگوێ ئەکەوێت
لە بازاڕی کۆیلە فرۆشانەوە بانگت لێ ئەکات
کاروان مەکە
کاروان مەکە

دەسا ئەی بەنەوشەی سەرسام با پیس نەبیت بگەڕێرەوە ناو دڵی سەهۆڵبەندان، چونکە گەرما گیان و لەشت بۆگەن ئەکات لە بیریشت نەچێت زەوی خولێکی تریشی ماوە غەم کۆترێکە گشت ڕۆژێك سێ جار بە خوێنی بەفرەکە خۆی ئەشوات و بەفرەکەش ناتوێتەوە

شاعیری نوێبەخش، سەرەتای نوێبەخشی لەوەوە دەردەکەوێت، کە نوێبەخش بێت لە (پرسیار) و (ورووژان) و (بیرکردنەوە)یدا، ئەوجا ئەو سێ خاڵ و نیشانەیە کار پێ بکات و بە ئاستدارییەکی داهێندراوەوە لە دەقدا وەك ناوەند دایانمەزرێنێت و سەقامگیریان بکات. نموونە: وەك لە شیعری (کۆچێکی بێ سەرو شوێن)، یان شیعری (چرۆی بەفر)، یان شیعری (پرۆمیسیۆس سەیری ئاسمان ناکات) دەردەکەوێت.

شاعیری حەفتایەکان هەریەك بە جۆرێك هەوڵدانی هەبوو بۆ کارکردن لەناو کولتوور و داستان و بەیت و باری کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردی،... تاد. بەتایبەت ناو خواستن لەناو کولتوور و داستان و بەیتی کوردیدا، بەڵام لە گەیاندنی دەربڕیندا زۆرینەیان لە یەك دەچوون. زیاتر ناوەکانیان دەخواست و دەیانکردن بەهێما و هێماپێکراو. کەمتر کاریان لەبارەی دنیابینیی نەوتراو و



نادیاری کەسایەتییەکان دەکرد، یان ناوهێنانەکان بەهانەیەکن بۆ ئەوەی داستان، یان بەیتەکان بە بیری خوێنەر بهێننەوە، یان لە زەینی خوێنەری نزیك بکەنەوە. ئەمەش لە بەرژەوەندیی دەقدا نییە. داهێنان لە ڕێگای خود و هاواری بە تەوژم و هەست و سۆزی ئەوی دیکەوە بەرهەم نایەت.

دارشتنێکی تۆکمە بۆ ئەم کارکردنەیان نەکراوە. ئەم کار بۆ نەکردنەش وەك لاوازی و نەتوانینێك تێبینی دەکرێت و لە داهێنانی شیعریدا بنیادێکی شلەژاو بەرهەم دەهێنێت.

ترپە و ئاواز لە دەربڕینەکانیانەوە پەیدا بووە، یان بە دەربڕینەکانیانەوە دەیانبەستایەوە. لە کاتێکدا ترپە و ئاواز لە زمانەوە پەیدا دەبێت و لە دەربڕینی زمانیدا هەڵدەقوڵێت.

شیعری ئەم شاعیرە، لە ئاست و بەهرەدا قووڵایی خۆی بۆ لای تواناکانی زمان برد، لەم ڕووەوەش ڕوانینێکی نیمچە کامڵ و خەملێوی بۆ ئەم ئەزموونە دەستەبەر کردووە. ئەزموونێك لە ناخی خۆیەوە ڕوو دەدات و پێگەیەك وەردەگرێت و دەست پێدەکات.

ڕێگاکەرەوەیە بۆ دۆزینەوەی تواناکانی زمان. خواستی مۆسیقای شیعریشی پاراستووە و بردویەتییەوە ناو پێکهاتەی زمان. دوولایەنەی مۆسیقا و زمانی هەستی گونجاندووە، ئەمەش هاوئاستکردنی (مانا) و (دەنگ)ە.

زمان ناوەندی پێکەوە گونجاندن و کۆکەرەوەی ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی شیعرە. هیچ شیعرێکیش بەبێ بیرکردنەوەی زمان ناتوانێت بوونی سەربەخۆیی خۆی دیاری بکات، زمان بیر دەکاتەوە، ئەوجا شیعر دەخولقێت و دەچێتە ناو

ئاستداریی زمانەوە، ناوەرۆکیش خۆی لە زمان جیاناکاتەوە. لەو بارەدا دەتوانین ئاستداری ناوەرۆك بۆ ئاستداری زمان بگەڕێنینەوە.

ئێستێتیکا لە ڕێگای زمانەوە دەربڕینی لێ دەکرێت و جۆرێك شیعرییەت بە ڕستە دەدات. ئەو ئێستێتیکایەی ناوەرۆك نەتوانێت بەدەستی بهێنێت زمان بەدەستی دەهێنێت، شیعرییەت دەبێتە دروستکەری پێوەندی لە دڵەوەی ناوەرۆك و زمان، یان (مانا) و (دەنگ).

کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩ هەولێر



## کۆبەرهەم

شیعری واقیعی وەك ڕەگەزێکی بایەخدار لە کولتووری کوردستان و ئەدەبیاتی کوردیدا جێگای سەرنج و بەها بووە و ڕوخساری خۆی دارشتووەو ناهەمواریيەکانی تا ناخ ئاشکرا کردووە. لەم شێوازە شیعرییەدا ڕووداوێك سۆز دەجووڵێنێت و ئامادەی دەکات بۆ دۆخی نووسین، ئەم سۆز جووڵانە بەهۆی وشەوە دەبێتە وێنە و کاریگەریی هەستی کەم لێ دەردەکەوێت، چونکە بەشێکی سەرەکی پێکهاتەی وێنەکە کرداری گواستنەوەیە. لەم دۆخەدا (خەیاڵ داهێنەر نییە)، ئەقڵ بەڕێوەبەرەو داوی پێوەندییەکان گورج و خاو دەکاتەوە، لەبەر ئەوەی دەقەکە دەقێکی لێکدانەوەیە لەبارەی ڕووداوێك، بەڵام لە شیعری مەجازیدا (بوون)ێك، کە ترپە و ئاوازێکی غەمگین دەهێنێتە ناوەوە، خەیاڵ و هەست و سۆز گەرم دادەهێنێت و بەهۆی وشەوە وێنەیەکی خەیاڵی پەیوەست بە دۆخی دەروونی شاعیرەوە دروست دەبێت، وێنەکە وێنەیەکی کاریگەر دەبێت، چونکە بینین بۆ یەکەم جار هەموو هێزی دۆزینەوە و ئاشکراکردنی کۆدەکاتەوە و لەسەری دەگیرسێتەوە. بینینێك تێڕوانینی هەیە بۆ ژیان و دەوروبەر و سروشت، لەم دۆخەدا هێزی مەجاز و خەیاڵ بەهۆی هونەرەکانی ڕەوانبێژییەوە داهێنەرن، هەست گەورەترە لە زەمینی واقیع. شاعیر لە مەجازدا کار لەبارەی شتە بە ئاستەم دیارەکان دەکات و دەیهێنێتە ناوەوە، هەروەها ناشکرێت شێوازەکان

تێکەڵ یەکتری بکەین، یان شێوازێك بەناوەندێکی گرینگ بزانین و ئەوانی دیکە بە لاوەکی. هەموو شێوازێك بە کارامەیی کاری لەناو بکرێت داهێنانی لێوە بەرهەم دێت، دەبێت بەها بە هەموو شێوازێك بدرێت و شوێنی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت. لە نیشتیمانی کورددا شیعرێکی داهێندراو نییە سیمایەکی جوانی بە دیکتاتۆر دابێت. هەمیشە ئەدەبی داهێندراو دژی ستەمە و لایەنگری جوانی و مرۆڤپەروەری بووە.

ئەم نووسەرە بەهرەدار و کەسایەتییەکە لە ناوەندی ڕۆشنبیری کوردیدا، لە کۆمەڵێك هێڵدا تواناکانی خۆی تاقی کردووەتەوە و بەرهەمهێنە.

من لێرەدا تەنیا لە هێڵی شیعرییەوە لێی دەدوێم و لەم بوارەدا خاوەنی بیرێکی زاندراوە و جیهانی نەزاندراو و هەستی ڕاناگەیەنێت، ئەو جیهانەی تێیدا کارایە بە کەمێك گۆڕانکارییەوە دووبارە وێنای دەکاتەوە، لە پلەیەکی هۆشیاریدا پێویستییەکانی مرۆڤی ئەم جیهانەی وێناکراوە، کار پێ دەکاتەوە و لەناو ڕستە شیعرییەکانیدا دایدەمەزرێنێت.

شاعیری واقیعبین خۆی سەرگەرمی ئەو شتانە دەکات، کە دەیانبینێت، یان بە ئاستەم دەیانبینێت و گەورەی دەکاتەوە بۆ ئاستی باشتر بینین و دەربڕین لێکردن، بەڵام شیعر بۆ کەس نابێتە دەستوور و یاسا و بنەما تا ژیانی لەسەر بەڕێوە ببات. دەشێ شیعرێك لە سروشتی خۆیدا باش تەماشای جیهانی کردبێت، پانتاییەك بێت لەوێدا بۆ نادیار بگەڕێین.

لە ئاسۆیەکی پڕ مانا و کاریگەرەوە، کولتوور لە فۆرمی سەرچاوەیەکی خۆڕسکەوە بەکاردەهێنێت و لێی نزیك دەبێتەوە، دوای



سوودوەرگرتن و بەکارهێنان وەك سەکۆیەك لەسەری دەوەستێت و خۆی ڕادەگەیەنێت.

لە کاتی نووسیندا ئاگاداری بارودۆخی دەروونی خۆیەتی، چی لە پێکهاتەی شیعرەکەوە ڕوودەدات، پێوەندی بە بارودۆخی دەروونی خۆیەوە هەیە و ئاشکرای دەکات.

مرۆڤ لەناو شیعرەکانیدا ئاشقێکی تا هەتایە نییە، بگرە ئاشقێکە بەرەو ڕزگارییەکی دیاریکراو، لەژێر کاریگەرییەکی مەودا کورتدا دەجووڵێت. خولیا و تانوپۆی ڕستەکانی ڕوون و لە ڕوون، پێوەندییەکانی ڕەگەزی پێکهاتەی تا ڕەگوڕیشە قووڵ ناکاتەوە، بەڵام هارمۆنییەت و تەباییەکیان لەنێواندا دروست دەکات و بە دووری و ئاسۆی ڕۆمانسییانە و کەشوهەوای گۆڕانکارییە واقیعییەکان گرێیان دەداتەوە. هەندێك جاریش یاخییەکی تۆڵەستێنە و توندوتیژی دەخاتەوە، لە کاتی هەڵچوون و توندوتیژیدا شاعیر ناتوانێت بیر و هەستی بخەملێنێت و بە چاکی بەکاری بهێنێت، پێوەندییە ئێستێتیکییەکان لە کاتی ئاسوودەیی مرۆڤەوە خاڵی پێکهاتە دروست دەکەن و پێ دەگەن بۆ بەکاربردن و کارپێکردن. هاوشێوەی سروش و جووڵاندنی بە ئاراستەی نادیار و بەرەو پرسیار چوون.

بەسەر واقیعی شێواودا شۆڕشگێڕە، شۆڕشگێڕییەکەشی پەیامێکە لە مرۆڤپەروەریدا دەیگەیەنێت و لەگەڵ کۆدا دایدەمەزرێنێت. ئەو ئەزموونەش لەوەوە کەوتووەتەوە، کە خۆی لەناو شێوەیەك لە شێوەکانی مەرگدا ژیاوە و تلاوەتەوە. ئەوەی لەو جۆرە ژیان و هەستە تراژیدییەوە لای کۆبووەتەوە و جۆشاندویەتی و لە قووڵاییەوە ڕایچڵەکاندووەتەوە،

قەوارەیەکی شیعری پێ دەدا و ویژدانی خۆی، یان ویژدانی نووسین دەدۆزێتەوە.

ویژدانی نووسین، بەتایبەتی شیعر بۆیە هەیە، تا ببێتە پەنجەرەیەك بۆ تیشکێکی نیگەران و پێشبینییەك بێت بۆ جوانی.

هەستی ژیانبینی و پێشبینی لە شێوازی ئەم شاعیرەدا زۆر بەهێز بووە و دیکتاتۆریەتی دەسەڵاتی بە هەموو ئاسۆکانییەوە دەرکردووە و لە بەشێك لە شیعرەکانیدا هەستی کۆتایی خۆی لەبارەی ئەو واقیعە دژوارە دۆزیوەتەوەو تراژیدیا، یان کوشتن و شەهیدکردنی (خۆی) بە ئاشکراترین شێوە وێنا کردووە. نموونە: وەك لە شیعری (وێنە)، یان لە شیعری (ژوورەکە)، یان لە شیعری (برمە)، یان لە شیعری (نهێنی نەکوشتن و نەنووستنم)، یان لە شیعری (بۆ هاوڕێیانم)،... تاد. لەباری دیکەیشدا شیعرەکانی ڕەنگدانەوەی گیانی گشتیی کۆمەڵگەی کوردین و مرۆڤ بەگشتی ئامادەبوونی تێدا هەیە و دەتوانین شیعرەکانی وەك ناوەرۆك بە بارودۆخی سیاسی نیشتیمانی شاعیرەوە ببەستینەوە، لەم بەستنەوەیەدا دەردەکەوێت مامەڵەیەکی وردی لەگەڵ واقیع و دەوروبەری خۆی کردووەو ناسیویەتی، کە مێژووی تایبەتی نەتەوەیەکە لە سەردەمێکی نالەباردا بە خولیای شۆڕشگێڕانە نووسیویەتی. پاشان واقیعەکەی وەك واقیعێکی نووسین نیشانداوە. لە تیشکۆی نیشانداندا دیکتاتۆر و سروشتی دیکتاتۆری کردووەتە هێما و نیشانە. ئەم جۆرە هێما و نیشانەیەی کردووە بە بنەڕەتی کارکردنی ئەدەبی، لە هەمان کاتدا شارەزای شێوە جیاجیاکانی دەربڕینە. ئەم شێوازی دەربڕینە بواری ئەوە بە شاعیر دەدات تا مانا و



تێگەیشتنی ژیانی کۆمەڵگە لەناو ڕووداوەکان ڕوون بکاتەوە و هۆکارەکان بەدوای یەکدا بهێنێ و ڕاییگەیەنێ. لە کارکردن لە واقیعدا شاعیر ناتوانێت شتێکی دیکە لەوەی هەیە زیاتر و تازەتر دروست بکات، گیانی شاعیر لەناو وشە و دێر و ڕستەدا ون دەبێت، بەڵام خەیاڵ و خەون و یادەوەری و جیاکاری و دووری و ئاسۆی دیکە بەرهەم دەهێنێت و گیانی شاعیر لەناو وشە و دێر و ڕستەدا بوونێکی بەرجەستە دەبێ و دەبیندرێت و کاریگەری و هێزی دروستکردن لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە ناو واقیعی داهێنان.

(کۆبەرهەم)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (دڵشاد مەریوانی)یە. ساڵی ٢٠٠٩ لە دووتوێی ٤٤٠ لاپەڕەدا لە چاپخانەی (ئاراس) لە هەولێر چاپ کراوە، هەشت کۆشیعری لەخۆ گرتووە.

*. کۆ شیعری یەکەم: فرمێسك و زەردەخەنە. لاپەڕە (٢٧ تا ٨٢) چل شیعری تێدایە.

*. کۆ شیعری دووەم: بین بە تیشك. لاپەڕە (٨٦ تا ١٤٠) سی و شەش شیعری تێدایە.

*. کۆ شیعری سێیەم: سەمفۆنیای وەنەوشە. لاپەڕە (١٤٤ تا ١٦٨) پەنجا و یەك شیعری تێدایە.

*. کۆ شیعری چوارەم: سەمای نێرگز. لاپەڕە (١٧١ تا ١٨٦) سێزدە شیعری تێدایە.

*. کۆ شیعری پێنجەم: ئێمەش لە خۆشەویستی دەزانین. لاپەڕە (١٨٩ تا ١٩٥) حەفت شیعری تێدایە.

*. کۆ شیعری شەشەم: پەلکەزێڕینەش نامۆ مەکەن. لاپەڕە (١٩٩ تا ٣١٦) چل و نۆ شیعری تێدایە.

*. کۆ شیعری حەوتەم: خەونی سەما دژەکان. لاپەڕە (٣١٩ تا ٣٥٢) چاردە شیعری تێدایە.

*. کۆ شیعری هەشتەم: عیشقی بێ نەخشان. لاپەڕە (٣٥٨ تا ٤٤٠) شەست و سێ شیعری تێدایە.

ـ کۆی گشتی شیعرەکان سێسەد شیعرن.

برمە

**کە چاوی بە سینییەکە کەوت**
**جامخانەکەش وەك ناو دەمی**
**ئاوی تێ زا**
**حەزی لە برمەیەك کرد و کابرا وتی بە پەنجا**
**بە گیرفانیدا دەستی گێڕا**
**پەنجاییەکە و یادی هاوسەرەکەی ژینی**
**بەدەستییەوە هات**
**راما**
**کابرای برمە سەیری کرد**
**ئەم شەرم گرتی**
**دایە و برمەکەی لێ وەرگرت**
**کە چووەوە وتی**
**بێ تۆ برمەیەکم زەهر کرد و پەشیمانم**



**بەڵام قەینا**
**سبەی کە معاشم وەرگرت**
**کیلۆیەکت بۆ دەکڕم**
**سبەی کە معاشی وەرگرت**
**هەر لە کارگەوە بردییان**
**ئەفسەرەکە لە زمانی برمە و حەزی نەدەزانی**
**هاوسەرەکەی پاش هەفتەیەك چاوەڕوانی**
**شەوێك دەرگاکەی کردەوە**
**لەجێی برمە**
**لە جنفاسێکی زەردباودا**
**باڵاکەی ئەویان بۆ هانی**

زمان بڕوایەکە و هێزێکی پێداوین دەبێت لە شیعردا ئەفسوونێك بەدەست بهێنێت و شاعیر لەناو ئەفسوونەکەدا بنووسێت و خوێنەر بباتە ئەو شوێنەی، کە ئەفسوونەکەی لێوە هاتووەو فێری ئەفسوونناسی بکات، بەڵام ئەم زمانە ڕوون و ئاهەنگدار بێت. ڕەنگە لەگەڵ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی ئەفسوونەکەدا هۆشی کۆمەڵگەی تێدا بناسرێتەوە.

شاعیر لە کردەی بوونی زماندا کاری نەکردووە. بەقەد ئەوەی دەسەڵاتی هونەری خۆی لە بابەتەوە کۆکردووەتەوە، بابەت لە دوای نووسیندا نابێتە کۆمەڵێك هەست و ئیماژە. ئەگەر بتوانێت بابەت دوای نووسین بکاتە هەست و ئیماژە، خوێنەر هەرچەند جارێك بگەڕێتەوە سەری دووچاری

داچڵەکین و جووڵان دەبێت. ئەم داچڵەکین و جووڵانە هێزی داهێنان دەهێڵێتەوە و لە کاتی توانەوە لەگەڵ هەست و ئیماژە و شیعرییەتدا زیاتر گفتوگۆی لەگەڵ (نادیاریدایە) نەك لەگەڵ (بابەت و بیرێکی دیاریکراو). شاعیر هەوڵ دەدات هەموو ئەو شتانەی دەیانزانێت بیاننووسێت و بیانباتەوە ناو سۆز، سۆزیش کاریگەری لەسەر مانا و وێنە و بنیاد بەجێ دەهێڵێت. لە هەندێك باردا هونەری داهێنان لاوەکی دەخات و زانیارییەکانی ناگوازێتەوە ناو دووری و ئاسۆی داهێنان و بنیادی زمان. لەم تێڕوانین و بۆچوونەوە کار لە پێناو زیندووکردنەوەی سۆز لەناو ڕواڵەتی واقیع و پاراستنی کەلەپووری واقیع دەکات. کەواتە (لە خودی خۆیدا بیرناکاتەوە)، دەچێتە ناو واقیع و بەهۆی ڕووداو و ناهەمواری واقیعەوە بیردەکاتەوە. ئەمەش بینینی واقیعە وەك گشتێك، واقیع وەك گشت بینین ترسناکترین دووری و ئاسۆی کارکردنە لە هونەری داهێناندا.

بە دەگمەن داهێنان لەمجۆرە تێگەیشتن و بینینەوە بەرهەم دێت، چونکە درێژبوونەوەی واقیعە، بەشێك نییە لە پێکهێنانی (واقیعی زیندوو).

شێوەیەکی زیندووی واقیع لە هێزی درامی و بەرزکردنەوەی گیانەوە بەرهەم دێت، کە هەست بارەکەی خوڵقاندبێت و مەودایەکی لەنێوان ژیانی مرۆڤ و واقیع دانابێت. مەودایەك پانتاییەك بێت بۆ هەژانی ویژدان و بووژانەوەی گیان.

(٢٠١٠/٣/١٣) بیست و دوو ساڵ بەسەر شەهیدبوونی تێپەڕ دەبێ، لە ڕێکەوتی (١٩٤٧/٣/٢٨)دا لە سلێمانی لە دایك بووە، لە ڕێکەوتی



(١٩٨٩/٣/١٣) لە شاری لە دایکبوونیدا لاشەیان بزر کرد و گیانیان گواستەوە ناو زمانی ئەدەب و پێکهاتەی کۆمەڵگەی کوردی.

ئەم تەمەنە کورتەی ئەگەر بەراورد بکرێت بەوانەی تەمەنی کیسەڵیان هەیە. ئەوەت لا دەبێتە خاڵێکی باشبینین، کە بووەتە کەسایەتییەکی چالاك لە میانەی کارکردنی لە بواری ئەدەبی واقیعیدا و توانیویەتی فۆرمێکی دیار بهێنێتە ناو شیعری کوردییەوە.

بەهۆی ئەو ئایدۆلۆژیا تایبەتییەی هەیبوو، هەوڵی پەروەردەکردنی میللەتی دەدا بەرەو گۆڕان و باشترکردن و کردنەوەی جیهان بەرەو وتووێژێکی درێژ و نا کۆتا، ئەگەرچی ئەم بینین و کارکردنە کاری ڕێکخراوی سیاسی، یان کۆمەڵایەتی، یان پەروەردەیی، یان مەڵبەندی ئەکادیمی، یان ڕێکخراوی ئایینییە،... تاد. دوا ئامانجی شیعر پەروەردەکردنی هەستی زمانی و ئێستێتیکییە لە گیانی کۆمەڵگەی تەندروستدا. ڕەنگە ژیانی کۆمەڵگەیەك لەناو مێژوودا فەرامۆش بکرێت، بەڵام ژیان لەناو ئەدەبی داهێندراودا مەحاڵە فەرامۆش بکرێت. ژیانی کۆمەڵگەی تەندروست لەناو ئەدەبی داهێندراودا ڕوخسارێکی بێگەرد و تەواو ئێستێتیکییە.

شوباتی ٢٠٠٩ هەولێر

## سەرم پڕیەتی لە سێبەر

شیعر هەم خاکە و هەم هەموو ئەو بوونەوەرانەیە، کە لە سەریدا دەژین. ئەفسانە بەرهەمی بیرکردنەوەی داهێنەرانی پێشووەو لە ناکاودا دێتەوە ناو بیرکردنەوەی ئەمرۆمان و نوێبەخشیی خۆی بەرهەم دەهێنێتەوە و واقیع بەها و بەهانەکانی قبوولْ ناکات، یان بە درەنگەوە قبوولْی دەکات و هاوتا و هاومانای لەگەڵ خۆی ڕێکی دەخات. نوێبەخشی لە شیعردا بڕوابوونی شاعیرە بە خودی بەهێزی خۆی، کە خودێکی ئازا و دەگمەن و جوانیویستە. کاتێك بوێری ئەوە دەکات دەربڕین لە دێرینی مرۆڤ و شێوازی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی گەردوون بکات و هەست چۆن دەچێتە ناو شتەکان و لە کردار و پێوەندییەکاندا بەشدار دەبێت. بە کار و کارایانە ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت، چۆنیش زانیاری، یان سروش و خرۆشی نووسین لە خۆی نزیك دەکاتەوە و وەریان دەگرێت.

بوون دەبێتە جێگای سەرنج و پرسیاری کاریگەر دەهێنێتە ناو چەق و بیر لە بەئەدەبیبوونی دەربڕینەکانی دەکاتەوە. نەك لەناو سێبەری ڕێبازە جۆر جیاکارە ئەدەبییەکان دابنیشێت و بۆ چالاکبوون و خۆبوونی خۆی، خۆری کزیی دەستەوەستانی هێندە تینی پێ نەدات.

هاتنە ناو یەکی چەندین شێواز و بیر و بەڕێوەبردن داگیری بکات و ڕێگای دەرخستنی پێوەندییە هەستییەکانی خۆی لێ بگرێت. لەم



ڕێگرتنەشدا شیعری نموونەیی و بالاّ بزر دەبێت. لەم بارەدا نادڵنیایی چرکەساتی نووسین دەگەیەنن بە چالاکبوون و خۆبوونی خۆی. شاعیر لە ئاستێکدا، کە شیعرییەت دەهێنێتە ناو ڕستە و وێنەکانی لە مۆسیقایەکی خوڕدا تاقی دەکاتەوە، ماوە و مەودایەکە خەریکی دۆزینەوەی یاریی و پێوەندییە نادیارەکانی شیعرە، هەست و بیری خۆی بە جۆرێکی ئێستێتیکی بەکارهێناوە. وای دەبینێت هاوارێکی هێمنە لە دەروونێکی بریندارەوە پێت دەگات، لە پلەیەکی هۆشیاریدا چوارچێوەیەکی هەستەوەرانەی بۆ دۆزیوەتەوە، بەڵام کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر نەوەی دوای خۆی بەجێ هێشتووە، لاو هەمیشە لە ئاراستەیەکی کاریگەردا بیرۆکە و هونەری وریاکردنەوە وەردەگرێت.

ئەم دیاردەیەی، کە نەیتوانیوە شێوازێکی بەزەبر بێت و دابکشێتە ناو نەوەی دوای خۆی لە وێنەی دەستلێدراو و گیراودا ماندووبوونی کەسی ناوەندی دەقەکانی حەساندووەتەوە و وێنەی خۆڕاپسکێنی نەخستووەتە ناو بیرکردنەوەیان.

گفتوگۆ لەگەڵ ئەو شتانەدا دەکات، کە دەیانزانێت و هۆکاری ئازارە تایبەتییەکانی خۆی بوونە. خۆڕسکی و هەستیارییەکانی ڕادەکێشێتە ناو دەربڕینەکانی و دواتر دەربڕینەکانی دەکات بە شیعری یەکئاست، بەڵام پێوەندییەکی ئەفسوونی هەست پێ دەکات و لە ئاراستەیەکی هۆشیاریدا دەستەبەری دەکات. نموونە: وەك لە شیعری (گۆڕستانێکی کۆچەری)، یان لە شیعری (کڕێوە)، یان لە شیعری (ماڵەکەم)، یان لە شیعری (گومان)، یان لە شیعری (ئەزموونی با) دەردەکەوێت.

ئەفسوونێك بۆ خوێنەر دەخولقێنێت، کە لەگەڵی بەردەوام بڕوات و دووچاری بێزارییش نەیەت. بەردەوام خورپە و نادیارییەك چێژ و هێزی بەدواداچوونی بەرز دەکاتەوە. (ئەمە گرینگییەکی تایبەتە بە ئەفسوونی شیعرییەت و بەهرە و دەرکەوتن.) لەگەڵ ئەمەشدا خۆشی لە شاعیرانی پێشە خۆی ناچێت و شیعرییەت لە خۆڕسکی خۆی هەڵدەقوڵێنێت و تروسکاییەکەی دەکات بە مەشخەڵ. مەشخەڵ بەو مانایە نا وەك: دیاردە، یان دەرکەوتە، یان ڕووداو. بەو مانایەی بە ڕوونی دیاری خستووە.

مرۆڤ، کە پەنا بۆ سروشت دەبا و وەك پەناگەیەکی بالای گیان تێی دەڕوانی، خۆی لە مەترسیی دۆخ و دابڕانی زۆرەملێیی و ناجێگیری واقیع بەدوور دەگرێت. لەو ماوەو مەودایەدا شیعری سروشتی، یان ڕۆمانسی جۆرێك جێگای دڵنەوایی ئایین دەگرێتەوەو هەست تێیدا بەرز دەبێتەوە بۆ پلەی دەسەلاتی گیان، نەمریی و مانەوە و دۆنایدۆنبوون لە زەینیدا جێگا دەکاتەوە. ئەم شاعیرە زۆر کاری لەناو سروشت و هێماکانی سروشتدا کردووە، ئەمەش وای کردووە، کە تێگەیشتن لە شیعرەکانی تاڕادەی گۆرانییە میللییەکان ئاسان بێت. مرۆڤ لەناو سروشتدا پەراوێز خراوە، ئەم ئاستە بەردەوام دەبێت و بە بارێکی دیکەدا دەگۆڕێت بۆ پەراوێزخستنی سروشت لەناو هەستی مرۆڤدا. مرۆڤ لە پێکهاتەی بوون و نەبوون تۆخمی ناوەندە و سروشتی پێ بە پیت و هەستیار و بەرهەمدار دەبێت. هەستێکی گەرم دەگەیەنێتە گیاندارەکانی لەسەری کۆبوونەتەوە، بەلام تاڕادەی توانەوە ئاوێتەی سروشت نەبووە. ڕستە و وێنەی واش دەبیندرێن سەرزەنشتی سروشت دەکات و توندڕەوی و دژایەتیکردنی پێوە دیارە.



شێوەیەکی نەدرکێندراو لە زماندا هەیە. ئەو شێوە نەدرکێندراوە دەبێتە ئاماژە و زمانی شیعری نموونەیی و بالا.

لە کرۆکدا شیعر پەیامێکی زمانییە لە دەربڕینی ئێستێتیکادا. شیعر لە زمان و شتەکان پێکدێت، بەلام زمان ناوەندێکی ڕاستەقینەیە و لە ڕێکخستنێکی تایبەتی زمانیدا دەبێتە شوێنێك، یان تایبەتکاریی شوێن بۆ یەکگرتنەوەی جوانییەکان، یان بەیەکگەیشتنی پێوەندیی جوانییەکان و هەستیارکردنیان لە باری دەرکەوتن و پێکهێناندا.

زمان بە تەنیا داهێنانێکی تەواو پێشکێش ناکات، بگرە (زمان) و (شتەکان) داهێنانی تەواو پێشکێش دەکەن و دەبن بە وێنە. ئەو زمانەی شیعر بەرهەم دەهێنێت لەگەڵ ئەو زمانەی چیرۆك و پەخشان و ڕۆمان و شانۆنامەی،... تاد، پێ دەنووسرێت ناکۆك نییە، یان ئەو زمانەی کۆمەڵگە بەگشتی بەکاری دەهێنێت. شیعری نموونەیی و بالا زمانی ئاسایی ناشێوێنێت، بگرە دەیخەملێنێت و لەناکاو نائاسایی بەرهەم دەهێنێت و دەیدۆزێتەوە. لە ڕێگای زمانەوە شتەکان دەخاتە سنووری خۆیەوە و ئاسۆی زمان و خەیاڵی شتەکان لە خۆیدا دەکاتەوە.

داهێنەر لە بەکارهێناندا هێزی وشە دەناسێت، لە کاروکردەی بە ڕستە، یان بە وێنەکردندا نهێنیی ئەم هێزە دەدرکێنێت. ئەم شاعیرە لە بەکارهێناندا وشە دەناسێت، بەلام لە کاروکردەی بە ڕستە، یان بە وێنەکردندا نهێنیی ئەم هێزەی پێ نادرکێنرێت و نهێنیی هێزی وشە نادۆزێتەوە. لە کاتی کێشانی

وێنەدا خەیاڵی ناشێوێنێ واتە: ئەو خەیاڵەی دەبێتە ماوە و مەودای وێنە لێڵی ناکات و ڕووبەرەکەی بە ڕوونی پیشان دەدات.

کەواتە تەنیا لە چوارچێوەی پاراویی وشە لە ڕستەدا بایەخی بە زمان داوە. زمان لەناو هەمووماندا بڵاوە و تەواوی کۆمەڵگە بەرهەمی دەهێنێت. لە بەکارهێنانی ئەمجۆرە زمانەدا هیچ هەڵەیەکی شیعری و زمانی ڕوونادات. وەك ئەو زمانە میللییەی مەقام و بەیتە کوردییەکانی پێ گوتراوە.

تایبەتکاری و خەسڵەتی تایبەت لە بیر و کاربۆکردنی داهێنەربوونی دەرکەوتە و دیاردە نییە. ئەمجۆرە خەیاڵکردنە لەناو بازنەیەکی تەسکدا تەنیا مل بە ڕۆشنبیرە پاش خاپەرۆکەکان با دەدات. ئەگینا تایبەتکاری و خەسڵەتی تایبەت لە بیر و کاربۆکردنی داهێنەر هەرەم نییە. هەموو شتەکانی تێدا کۆببنەوە و دەربکەون.

شاعیر لە هەر جوانییەك خرۆش و چەمك و هێزی گیانی و هونەری دارشتن وەردەگرێت. هەر جوانییەکیش فۆرمێك و ڕوخسارێکی جۆر جیاکاری هەیە. هەر یەکەیان هەڵگری ڕوخسار و مانا و بەها و هێزی پیرۆزی خۆیانن. کەواتە ئەو هەموو جوانی و فۆرمە وەك یەك تایبەتکاری و خەسڵەتی تایبەت بەخۆی دەبێت. ئەگەر یەك تایبەتکاری و خەسڵەتی تایبەت وەربگرن، ئەوە بەبێ هیچ دوودڵییەك لە درێژەی بەردەوامبوونی نووسیندا دووبارەکردنەوە دەبێتە دیاردەیەکی بێزارکەر. کەواتە هەر شیعرێك تایبەتکاری و خەسڵەتی تایبەتی هەیە. نەك ئەزموونێکی بە پیت و درێژ لەناو یەك تایبەتکاری و خەسڵەتدا گیری پێ بخورێت و بوەستێندرێت بەو نیاز و بیانووەی دەبێت



تایبەتکاری و خەسڵەتی تایبەت بەخۆی هەبێت و لە هێڵی کارکردن و بەرهەمهێنانیدا وەك ئەزموونێکی یەك شێوەیی خۆی ئاشکرا کردبێت و ناسنامەی بێت.

ئاوێنە یەك ڕوخساری بۆ ئێمە هەیە، بەڵام ئێمە یەك ڕوخسارمان بۆ ئاوێنە نییە. پێویستە ئەو بازنەیە بشکێندرێت و ئەو بۆچوونە هەڵوەشێتەوە، کە گوتراوە دەبێت شاعیر (دەرکەوتە و تایبەتکاری و خەسڵەتی تایبەت بەخۆی هەبێت)، بگرە دەبێت بەهرەی بە زانیاری مشتومال بکات و دەرکەوتنی کاریگەر و گرانابییەك بخاتەوەو لە پێکهاتەدا تایبەتکاری و خەسڵەتی خۆی بباتەوە ناو (زمان) و (شتەکان).

(سەرم پڕیەتی لە سێبەر)، ناونیشانی کتێبێکی شیعریی (سەلاح محەمەد)ە. ساڵی (٢٠٠٧) لە دووتوێی (٢٦٨) لاپەڕە لە چاپخانەی (ڕوون) لە سلێمانیدا چاپ کراوە، ئەم شیعرانەی تێدایە: (سۆراخ، تەرمی پۆستەکان، ئا ئێستا، سەما لەودیوی دەرگا داخراوەکە، تەرمەکانی سەر ڕەشەبا، شێت، باخە ڕەنگاڵەکانی خۆکوشتن، سەمای گوڵە بەفرینەکان، ڕۆژە بێ مەزارەکان، گوناهی ئاڵ، تەریوان، ساڵێکی تر، گۆڕستانێکی کۆچەری، گوناه، گۆرانیی، ترپەی پێ، نیشتنەوە لەژێر بارانی ئێوارەدا، گۆرانییەکانی کچە بچکۆڵەکەم، ملوانکەیەکی زێڕ، پەلکەزێڕینە، ساتەکانی چەند درەختێکی بەرباران، چاوەڕوانی، قریشکە، دوایین وێستگە، دڵم خستووەتە پەرداخێ فرمێسکەوە، بۆ خۆشەویستە شێتەکەم، دەرگا، دیدەنی، هانا، کرێوە، چەند بەشێکیتری ونبوون، واگۆنی شەو، گەڕان ، سێ هەناسە، گڵۆپێکی شکاو، پاکبوونەوە، سەفەر مەکە، ئێمە

یەکتری ناناسین، ماڵەکەم، وردە شووشە، بڕوا بکە، نۆ وێنەی ئاسایی، دڵت بەجێ بێڵە و بڕۆ، چەند بەشێکی دیکە لە گیانێکی تەزیو، نەسرەوتن، هەنگوینە خوێن، ئێوارەیەکی پەمەیی، بازۆڕییەکان ئێواران بەرەو ئاسۆ هەڵدەفڕن، لەسەر شۆستەیەکی بەجێماو، دۆخێکی تر، تۆ، باڵندەیەکی سپی، بێ تۆ، دڵیش تۆراو سەفەری تر بەرەو پایز، چرایەکی شکاو، دارستانێك بووە خۆڵەمێش، دڵە ئاسنییەکان، باڵندەکانی ئاو، دووکەڵی نامۆیی، کۆچ، تەمەنی وەنەوشە، پەپوولە، لەسەر ئاگر، ئەویش نانوێ، ئەو کاتانەی جوانتر ئەبی، دوانامە لەژێر یەکێ لە گڵۆپەکانی دار تەلێکی شەقامی شار، بۆ ئەو شەوەی لەیاد ناچێ، ملوانکە، چاوەکانت، گوڵە سپییەکان، ئیتر پەرداخەکە شکا، گومان، سەرم پڕیەتی لە سێبەر، ماڵێك لە تەم، کەسێ، ئای، دڵنیایی، ببوورە لات نەمامەوە، مردن لەناو سەبەتەیەك هەناسەی شێداردا، بەجێمانی دوا ئاهەنگە تاریکەکە، هێشتا، سکێچی سەعاتە نەرمەکان، فیردەوسی ڕەش، فیولین، کە لە عیشق پەڕیتەوە، سەما، سوپاس، هەناسە، ئێوارە ساردەکان، ئەزموونی با.)

سەفەر مەکە
سەفەر مەکە
دڵم ئەڵێ ناتبینمەوە
فێرە گریانێکی سەخت بووم
دەستم پێکرد ژێر نابمەوە
دنیا ڕەنگی فرمێسکی ئینسانی گرتووە



خۆشەویستی تابووتێکە
زۆر کەسی تیا پاڵکەوتووە

* * *

سەفەر مەکە
دەبا گۆرانییەکی ترمان بسووتێ
دڵمان گەرم بکەینەوە
فێرین خەمێك
هەموو شەوێ
بەسەر ڕۆحماندا بدەینەوە
نە لێمان جیا ئەبێتەوە
نە لێشی جیا ئەبینەوە

* * *

ئەم بارانە
هەموو هەناسەکانی تەڕ کردووە
ئەستێرەکانیش بە ڕووتی
لەژێر باراندا نووستوون
تۆ نانوویت و
دڵت لە شەوی حەسرەتدا لێ کەوتووە
بۆیە چاوانت دایە دەست
ئەو منداڵەی
کە خۆشی لەم جەنجاڵییەدا لێ ون بووە

* * *

سەفەر مەکە

دەرگا نییە نەکرێتەوە

تەنیا پەنجەرەی ڕۆحی تۆ

جاران کە سەرم ئەنایە سەر شانت

چۆلەکەیەك

لە لێوەکانت هەڵئەفڕی

دنیا ئەبوو بە ڕەنگی تۆ

ئێستا نە تۆ

نە ئاوازێ

تێکەڵاوی ڕۆحم نابێ

شەوان ورد ورد لە خۆم ئەخۆم

چونکە نازانم تۆ بۆ کوێ و

ئەمشەویش من

بۆ کوێ ئەڕۆم

* * *

وەرە ئەمشەو

تاقە گوڵە نیگایەکت

بە پەنجەرەکەمدا هەڵواسە

ئیتر لای کەس نایگێڕمەوە

دڵم ماتە



نەك من

بگرە دنیاش وەکو سەرم

ئەمشەو کاسە

* * *

باوانی من

ئەوە دەریا

خۆت نەتئەوت

ئەیەوێ بگاتە پانتایی دڵەکەی تۆ

ئێستا بۆ بوویتە مەزارێ

دڵۆپێکیش ناگرێتە خۆ

ئەگەر ویستمان دۆخ و ڕادەی ئێستێتیکای کۆمەڵگەیەك بناسین، بار و بوار ئەوەیە شاعیرە باشەکانیان بخوێنینەوە، پێشاندانی ڕادەی ئێستێتیکا دەبێتە هێز و توانای گۆڕانکارییەکان، هێز و توانای گۆڕانکاری لە شێوازی ئەدەبدا لە منداڵدانی (زمان) و (شتەکان)دا لە دایك دەبێ. شێوازی شیعری دوور نییە لە شێوازی بیرکردنەوەی ئازا و دەگمەن و جوانیویستی خودی شاعیر خۆی. هەستیارییەکانی بەرانبەر بە بوون و دیاردە خودییەکانی تێکەڵ بە دیاردە سروشتییەکان دەکات لە گۆشەیەکی دیاریکراودا و بە بیرێکی ڕۆمانسییانەی مەند و بێ کەفوکوڵ و داماڵدراو لە هەڵچوون بە دوای پرسیارەکانی سروشتدا نهێنیخوازە. ڕۆمانسییەت زیاتر بیری مردنە و مردن دەگەڕێنێتەوە بۆ بنەڕەتی ژیان و ترس لە هەناو

و جەستەی سروشت بەرجەستە دەکات. بۆ شاعیری ڕۆمانسی هیچ شتێك لە سروشتی پاك بەهرەبزوێن و سەرسوڕهێنەرتر نییە. ئەفسوونی گەرم و بەردەوامی دەداتێ و هەستەکانی دەهێنێتە دۆخی هەست بە جوانیکردنی نووسین و تواندنەوەی خود لە کرداری نووسیندا. نووسینێك لە قووڵاییەکی شاراوەدا بۆ ئاستی پێشاندان و بینین بەرز دەکرێتەوە.

ئەم کتێبە لە گشتدا وەك شێواز و بابەت و زمان شیعرێکی یەکگرتووی درێژە، لە ڕواڵەتدا چەند ناونیشانێکی لاوەکی ئەم گشتە یەکگرتووەی هەڵوەشاندووەتەوە. ئەگەر ئەو ناونیشانە لاوەکییانە هەڵبگیرێن و هێڵی دەستپێکردن و کۆتاییهاتن ڕوونتر دەردەکەوێت.

سەلماندنی بوونی دەروون لە شیعردا و پاشان ناساندنی لە هێڵێکی تەواودا مەحاڵە، ڕاز و خولیا و گومانە کەسییەکانی شاعیر (کەسی ناوەند) ئاسۆیەك دروست دەکەن و لەناو تۆڕی بەکارهێناندا کۆیان دەکاتەوە. خوێنەریش زیندوویێتی پێ دەدات بۆ مانەوە و بەردەوامبوون.

پێکهاتەی گشتی کتێبەکە یەك بنیاد و یەك زمان و یەك ترپە و ئاواز و یەك بابەت، یان دەربڕین و دەربڕینکردن، یان شێوازی دەربڕین و دەربڕینکردن ئاست و ئاراستەیەك بەڕێوەی دەبەن و بەهۆی ڕەوانیی زمان مانا و مەبەست بە ڕوونی دەگەیەنێت، یان پەیامی خودێکی ئازار چەشتوو دەگەیەنێت. لە کاتێکدا مەبەستە ناوەکییەکانی شیعر پەیامێکی زمانییە و سروشتە تایبەتییەکانی ئێستێتیکای پێ دەخوێندرێتەوە.



شاعیر لەم کتێبە شیعرییەدا بە مێشکێکی نائارام و نائاسوودەوە دەچێتە ناو کاروکردەی نووسینەوە و خودی جەزرەبەدراو و ئازارچەشتووی خۆی پێ نووسیوەتەوە. هەست بە نامۆیی بوونی خودی خۆی زۆر زاڵە و کۆی ئازارەکانی تێدا دەرخستووە، بە شێوەیەك لە شێوەکان، بە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك، شاعیر ژیاننامەی تایبەتی خۆی تۆمار کردووە. منی ناو دەق و هەموو منەکان، منی ڕاستەقینەی شاعیرن، دەکرێت وەك ناوەند نەزانراوەکانی لێوە بزانین، یان بە دوایاندا بگەڕێین. بەهۆی بەردەوامیی ئەو هەست بە نامۆییکردنەش ئەزموونی کراوە و کاریگەرتر و خەملێوتر بووە.

ئایاری ٢٠٠٩ هەولێر

## تێبینی

له بەرهەمهێنانی ئەم قەڵەمکێشانەدا هەوڵم داوە خۆم بەدوور بگرم لە پانتای ئەو نووسینانەی شاعیرەکانی تێدا باس کراون، ئەو خاڵ و هێڵانە بوونەتە جێی سەرنج و تێبینیی من، کە شیعر لێی پرشنگ دەداتەوە و لە وێنەی فۆتۆگرافی شاعیرەکانیش وردبوویمەوە، لەو دەرخستەنەدا پێوەندی ناوەندم دۆزیوەتەوە و نوختەی بینینی خۆم بەهێز کردووە.

شاعیر هەبووە تەنیا وێنەیەکی بووەتە مایەی سەرنج و تێبینی، هەشبووە چەند وێنەیەك. ئەو خاڵ و هێڵانەی لە ڕوخساری وێنەکان دیارکەوتوون و بە دیمکردوون. ئەو خاڵ و هێڵانەی لە شیعرەکانیشدا پڕشنگیان داوەتەوە بە یەکیانم گرتوون و بۆ قەڵەمکێشەکان بوونەتە هەموو شتێك. لە خاڵ و هێڵی ڕوخساری وێنەکان بەکارامەییەوە بەرەو ژیانی گەرم و گوڕ و سەرچاوە دەڕۆن، لە شیعریشدا لە ژیان دەسڵەمێنەوە و بەرەو سەرەتایی دەگەڕێنەوە. خاڵ و هێڵەکانی ناو شیعر، ملکەچی خاڵ و هێڵەکانی ڕوخساری وێنەکانن. لە خاڵ و هێڵی ڕوخساری وێنەکان شکۆ و میهرەبانی بۆ ژیان دەگەڕێننەوە، لەو



بەیەکگرتنەدا خاڵ و هێڵی ڕوخساری وێنە و شیعرەکانم بچووك نەکردووەتەوە بۆ ئاستی مانایەکی دیاریکراو، بگرە ئاسۆ و دوورییەکم لێ کردووەتەوە بەرەو ئاستی بوون و خۆبوونی و پێوەندی ناوەند، کە کرۆك و ناوکی شتەکان و ئەزموونی گشتییە، لێکدانەوە و فۆرمی هەمەلایەن وەردەگرێت و خۆمانی لەناو دەناسینەوە و دەناسێنین. بۆ خۆناسین و خۆناساندن و خۆنوێکردنەوە هەمیشە پێویستمان بەوەیە بگەڕێینەوە بۆ لای ئەزموونی گشتی، کە داڕشتنی خودی ژیانە.

## قەڵەمكێشی جەمال شارباژێڕی بە وشە

شیعر پێویستە هەمیشە لە سەرەتاوە تەماشا بكرێت و باس بكرێتەوە. دوو دیوی بەرجەستە نەكراوی هەیە، ئەم شاعیرە ئەمڕۆ لەگەڵماندایە و شاعیرێكی زیندوو و داهێنەرە، سبەینێش نەمرە و لەگەڵماندا دەمێنێتەوە. ئەوەی لە ئێمەی نزیك دەكاتەوە خەیاڵی تایبەتی دەقەكانییەتی و داهێنانیش دواخستن قبووڵ ناكات، هەمیشە دۆخی گونجاندنەوە بۆ خۆی دروست دەكاتەوە و دەبێتە شكۆداریی شیعری بێگەرد و سەردەمەكان لە خۆیدا بەرهەم دەهێنێتەوە. تەنیا ئەو شیعرە وێران و بەدبەخت دەمێنێتەوە، كە ئایدۆلۆژیا توخم و دۆخی پێكهێنەری بووە. دۆخی گۆڕان لە دەست دەدات و دۆخی چەقبەستن وەردەگرێت. خانەوێران ئەو شاعیرەی ژەهری ئایدۆلۆژیا هەڵدەلووشێت.

مرۆڤی هەستپەروەر، كە هەستی ئێستێتیكیی شیعری لا دروست دەبێت و لە كرانەوە و تێڕوانینییەوە دەكەوێتە ناو خەمەوە، شوێنەواری خەمیش لە بیركردنەوەیدا بنبڕ ناكرێت، وەك بەخشینی پەیامێك جێی خۆی دەگرێت و دەبێتە هێما بۆ مانا و مەبەست. كردەی شیعری ئاسایی كردنەوەی بارە غەمگینییەكەی و پڕشنگ هاوێشتنییەتی تا باری خەمڵین و پێوەندیداربوونی بەو هەستەوە، دوای ئەو پێوەندداربوونەی تووشی تاراوگەی ناخ دەبێت و لەناو



خۆیدا هەست بە نامۆیی و هاودەمی هەمیشەیی خەم دەكات. خەم نەك گۆشەگیربوون. لەم بارەشدا پەنا بۆ دۆزینەوەی شوێنێكی وەك شاری پاكزاد، یان بەهەشت نابات تا ئاسوودەییی گیانی تێدا دەست بكەوێت. شوێنی ئاسوودەیی بۆ ئەمی هەستپەروەر تەنیا شیعری ڕاستەقینەیە. لە شوێنی ئازار و ئەشكەنجەدەر كۆچ دەكات بۆ شوێنی ویست و هێزی وشە و ئاستە دەنگییەكان، هەست و بینینی دەگۆڕێ لە دەربڕین لە سروشت و كاركردن لە كەرەستەكانییەوە بۆ دەربڕین لە ژیان و مرۆڤ و پێوەندی دروستكردن لەنێوانیاندا. شیعر دەبێتە چاوگی نایابی جۆشێكی گەورە، بەڵام نابێتە هەڵسووڕێنەری شتەكان تا هەست و هێز و شێوەی پێوەندییەكانی نێوان مرۆڤ و سروشت بگۆڕێت و جۆرە هەست و گوروتینێكی بێ ئەندازە بخولقێنێ.

ئەم شاعیرە لە بنەڕەتدا خاوەنی تێڕوانینێكی ڕۆمانسیی هەستییە. هەست لە شیعرەكانیدا ڕەگەزێكی زۆر گرینگ و سەرەكییە، بە هۆیەوە خودی خۆی دەهێنێتە دی و بەكردەی لەدایكبوونی شاد دەكات و خودی خۆی دادەهێنێتەوە. بە بۆچوونێكی ژیرانەوە مامەڵە لەگەڵ زمانی ڕۆمانسیی هەستی دەكات و هێزی تیشكدانەوەی تێدا بەرهەم دەهێنێ، بەڵام ترپە و ئاوازە بنەڕەتییەكانی زمانی نەدۆزیوەتەوە، دۆزینەوەی ترپە و ئاوازە بنەڕەتییەكانی زمان شایەنی سەركێشی بۆكردنن. ترپە و ئاوازی زمانی كوردی لە شوێنە نەناسراوەكاندا نەهاتووە، ڕەگی لەناو گەرمی و نەرمیی خاكدا بەهێز بووە و پەیوەستە بە كولتوور و ئەو نیمچە شارستانییەی دروستی كردووە. لە ڕۆمانسیی هەستیدا تێڕوانینی و تەواو باڵا و پڕ بۆ ناوەندی ڕوودا و ژیان و جیهان و بوون نییە، بگرە وێناكردنی تاكە كەسی و گیانی بەهێزی

هونەرمەندێتی هەیە، کۆششی بۆ ئەمەیە ئەم وێناکردنە وەك ئەزموونێك لە فۆرمێکی شیعریدا گەڵاڵە بکات و دیدێکی ڕۆمانسیی قووڵ لە ڕێگای هەستەکانەوە بخەملێنێ و پاشان وەك نموونەیەکی نوێبەخش نیشانی بدات، ڕۆمانسییەت دەربڕینە لە هەڵوێستێکی ویژدانی، کە بوون ڕەنگ و شێواز و وێنەیەکی تازەی پێ دەدا، پێوەندی بەردەوامی لەگەڵ ژیان و جیهان و بوون نییە، بگرە پێوەندی پچڕپچڕ و هەڵوێستە لە ژیان و جیهان و بوون وەری دەگرێت. لەگەڵ دۆخێکی کارەساتباردا ڕووبەڕووی دەکاتەوە. هیچ هونەرێکیش لە واقیع جیا نابێتەوە. چاوگی ئەفسوون و هونەرە سەرسوڕهێنەرەکان قووڵایی واقیعن و کرانەوە و جووڵانەوەن بەسەر ژیاندا.

ئەو جوانییانەی ئەدەب دۆزیویەتییەوە و لێی دواوە زۆر کەمترە لەوەی لە واقیعدا بوونی هەیە و ڕووبەڕوو دێنە ناو ژیانمان و کاریگەری دەبێت. جوانیبەخش لە ئاستی تواناییدا بەهرە و سروش و ڕۆحە پەیامدارەکان ڕێنوێنی دەکەن.

ڕۆمانسییەت لە یەك سەرچاوەوە هێز وەردەگرێت ئەمیش چاوگی خەمە، دواتر دەپەڕێتەوە بۆ تاراوگەی ناخ و بەردەوام لەناو وێناکردنی ڕابردوودا دەژی، وێناکردنی ڕابردوو هۆکارێکی بنچینەییە و زاڵە. پلە بە پلەش ئەم هەستەی لا قووڵ و بەهێز بووەتەوە تا خاڵی دامەزراندن، بەڵام مانەوە لەناو ڕابردوودا دەربڕین لە ژیان و هەست و بینینی تازە ناکات، چەشنێکی دیاریکراوی مرۆڤ و سروشت دەخولێنێتەوە. هەر لەسەر ئەم بنەما و بنچینەیەشەوە بەردەوامی بە توانای ڕاستەقینەی خۆی داوە و هەستێکی قووڵی ڕۆمانسی لە قووڵیی بیرکردنەوەی دەدۆزینەوە.



ئەو خاڵەی جێگای سەرنجە کولتووری خۆماڵی ئەم شاعیرەی شەیدا و هۆگری خۆی کردووە، ئەم کولتوورەی بەشێك لە شاعیرانی کوردی پێگەیاندووە. ئەو کێش و بڕگە و سەروا و ترپە و ئاوازەی (مەولەوی و گۆران) هێنایانە ناو شیعری کوردی. ئەم خۆی لێ لانەدا و پەرەی بە پیتی پێدا، کردیەوە کەرەستەیەکی خاو و لەبار بەجۆرێکی نوێبەخش و هاوچەرخانە بەکاری هێناوە. لە بواری ترپە و ئاوازدا کۆمەڵێك هێما و نیشانەی دیکەی پێدا و ڕەوتێکی دیاریکراوی دۆزییەوە. لە کاتی ئەم ڕوودان و دۆزینەوەیەدا لە ڕواڵەت و کرۆك و ناوکی وشە و ئیدیۆم و دەستەواژە و پەند،... تاد. وردبووەتەوە. لەگەڵ نوێبەخشی لەتەنیشت یەکتری وەستاندنی و دوای تێڕامان و ناسینی دووری و ئاسۆکانی تێکەڵی کردوون. لەم ڕووەوە وەك نوێبەخشێك خۆی لە ناوەندی ئەدەبیدا ناساند و لە ناوەندیش پەسەند کرا. دوای ئەم شاعیرەش دۆخی ترپە و ئاواز لە شیعری نوێبەخشی کوردیدا بە گوڕتر پەرەی سەند. تێگەیشتن و وریایی بەرانبەر ئەم تێکەڵکردنە هەبوو، واقیعی ترپە و ئاوازی قۆناغی دووەمی نوێبەخشی شیعری کوردی بە جۆرێکی دیکە دەرکەوت.

ترپە و ئاواز لەگەڵ زماندا دێتە بوون و وێنەش ڕووناکییەکە لە وشەوە هەڵدێت و تەواو هەستیارە ، شیعری کوردی لە شەستەکاندا لەگەڵ دەرکەوتنی (جەمال شارباژێڕی) شێواز و ترپە و ئاواز و وێنا و هێڵێکی وێنەیی دەگمەنی بەخۆوە بینی، کە پێش ئەم بەخۆیەوەی نەبینیبوو. دەقی (کردگار- فرمێسکی نهێنی، کۆ شیعر- چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ساڵی ١٩٦٨، ل: ٦٣ تا ٦٧) لە ئەزموونی سەرەتاکانیەتی. مامەڵەیەکی

نائومێدانەی لەگەڵ پرسیارەکانی بوون و نەبوون کردووە و تێهەڵکێشی یەکتریان دەکات و لەسەر بنەڕەت و چۆنیەتیی بیرکردنەوەدا لێکیشیان جیا دەکاتەوە. گرینگیی شیعرەکە لە ڕایەڵ و هەڵسووڕاندنی پرسیارەکانیدایە، ڕووداوەکانیشی لە دەرەوەی کات و شوێنێکی دیاریکراودا ڕوونادەن. لە دەرەوەی کات و شوێنیش هاوتاییەك بۆ خۆی لەگەڵ خەیامدا دەهێنێتە بەر دید و پاشان گفتوگۆ و هەوڵدان بۆ لێك تێگەیشتن، یان پرسیارەکانی خۆی لەسەر هێڵێکی درامیدا دەباتەوە ناو پرسیارەکانی خەیام و درێژەی پێ دەدات، (خەیام) و (ئەو) هەردووکیان ئاماژە بە یەك خەسڵەت و نیشانە و سەرچاوە دەدەن و لە خاڵێکی ورووژێنەر و گرینگدا بە یەك دەگەن. گومان لە پرسیاری بوون و جیهانناسی دەکەن. پرسیارەکانیش کاریگەرییان بەسەر سۆزەوە هەیە، بەهۆی سۆزەوەش دەیباتە ناو ڕایەڵی هۆش و هەستەکان و دەیخەملێنێ. داڕژان و ئاوازەکەشی لە بارانی نمە دەچێت و کاریگەریی زۆرە بۆ ئارامبوونەوەی دەروونی خەمبار. شێوازیشی بۆ قۆناغی سەرەتایی شێوازێکی لەبار و گونجاو و داهێنەرانەیە، جۆرێك تۆوی نوێبەخشی تێدا وەشاندووە. تاکو ئێستاش ئەم شێوازە ماوە و لەملا و لەولای شیعری کوردیدا کاری پێ دەکرێت. ئەم بزاوت و جووڵە و مانەوەیەش لە سروشتی داهێناندا بەهایەکی ئێستێتیکییە، جوانی و شێوازی بەرهەم هێناوە. بەهای ئێستێتیکیی بەهرە و سروش دەبەخشێتە مرۆڤی نموونەیی و کاریگەری دەبێت لەسەر پەروەردەکردنی ئاگایی کۆمەڵگە و کەسایەتی دەخەملێنێ.

شیعری ئەم شاعیرە لە وەرگێڕاندا بەهای شیعرییەتی لە دەست دەچێت. وەرگێڕان ناتوانێت کرۆك و ناوەرۆکی شیعر بەتەواوەتی نیشان بدات. شیعرێك



وەردەگێڕدرێت نازاندرێت ئەم شیعرە وەرگێڕدراوە چەند ئەم شیعرەیە، کە لە زمانەکەی خۆیدا وشەسازی و خوازە و لێکچوواندنی تێدا بەکارهاتووە. ئەو توانا زمانییەی و ئەفسوونە زمانییەی دەگوازرێتەوە، یان لەدەست دەچێت و مانا دەگوازرێتەوە. ڕەنگە وردەکاری شێواز و ڕوانینی گشتی تا ڕادەیەکی باش بگوازرێتەوە، بەڵام ڕوانینی خوازەیی ئەگەر مەحاڵ نەبێت نزیکە لە مەحاڵ. بە جۆرێك بە ئەفسوونی زمانی دەقەوە موتوربە کراوە لە وەرگێڕاندا ئەفسوونەکە بزر دەبێت و نزیك دەبێتەوە لە مانای ڕووکار و ڕواڵەتی. لەگەڵ ئەم پێزانینەشدا شیعر تەنیا بۆ زمانی دایك، واتە: زمانی دەق نانووسرێت، ئەی کەناڵی وەرگێڕان، زمانی دووەم چۆن دروست دەبێت. پێوەندی نێوان توانا زمانی و ئەفسوونی زمانی دەق، لەگەڵ زمانی دووەم لە چ بارێکیدا وردەکارییەکان بەڕێوە دەبات.

نیسانی ٢٠٠٨ هەولێر

## قەڵەمکێشی جەلالی میرزا کەریم بە وشە

یەکێك لە خاڵە گرینگەکان بۆ ژیانی نووسەر ئەوەیە بە شێوەیەکی تەندروست و زانستی کاتی خۆی ڕێکبخات و باش بەکاری بهێنێت. ئەمجۆرە ڕێکخستنە نەك وەك نووسەر یارمەتی دەدات، بگرە وەك ژیانی فەرمانبەری و خێزانیش دەبێتە هۆ و هۆکاری یارمەتیدان و کارایی ژیان. ئەمەش هەستێکی تەواو داهێنەرانەیە و پێوەندی بە داهێنان و پەیوەستبوون بە داهێنانەوە هەیە. بەم شێوەیە هەلومەرجی سوود وەرگرتنی بۆ دەرەخسێت و خۆی لەگەڵ کاتی باش بەکارهاتوو دەگونجێنێت. لەم باروبوارەدا کات دڵی نووسەر بە لای خۆیەوە ڕادەکێشێت و بەرهەمدار دەبێت لە ڕووی نووسینەوە، نووسەر بە قووڵی نووسین دەناسێت.

ناسینی قووڵی شیعر خاڵی بەهێزی پێوەندییە بۆ یەکتر ناسینی شاعیر و خوێنەر، یان کۆمەڵگە. کەسێك، کەسێکی نەناسراو لە ئەستێرەیەکی دوور، یان دەوروبەرێکی پارێزراو، یان بە ژاوەژاو و پڕ مەترسی. هەست بە نزیکبوونەوەت دەکات، بە حەز و خولیای ئەدەبی بێگەردەوە لەگەڵت دادەنیشێ و گفتوگۆی نێوانتان لەبارەی ئەدەب و جیاوازییەکانەوە گەرم دەبێت. هەر ئەم ڕووداوەیە ئەدەبی کردووەتە دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەر.



ئەو پرسیارەی دەکەوێتە نێوان شیعر و کۆمەڵگە بە چ ڕێگایەك دەگاتە دۆخی شکۆمەندی بەکارهێنان و داهێنان، شاعیر بە چ زانیاری و پێوەرێك ئاسۆی نێوان شیعر و کۆمەڵگە دەپێوێت. زمانی کۆمەڵگە کەمتر لەناو ڕۆشنبیری نوێیەخشدا کارا و چالاکە، بگرە لە ئاستی دەستنیشانکردنی شتەکاندا ئەفسوون و هێزی خۆی ڕادەگەیەنێ. لە هەمان کاتیشدا زمانی کۆمەڵگە زمانێکی فرە دەنگ و فرە پێوەندییە، توانای داهێنانی زمانی تێدایە و وزەکانی دەربڕین پەرە پێدەدات، پێویست نییە شاعیر وەك گومان و ترسێك لێی ورد بێتەوە و خۆی لێ تار و تەریك بگرێت، کۆمەڵگە بەردەوام لە ڕێگای داهێنانە هەمە جۆرەکانییەوە وزەی زمانی بەرز دەکاتەوە، بەڵام لە شیعردا زمانی، سۆزی بۆ خەون و داوا و پێشبینی و هەست،... تاد. هەیە و ئاستێك دیاری دەکات و بەسەر پێکهاتە دەروونییەکانی دەکرێتەوە.

لە کرانەوەیدا کاکڵی کاکڵەکانە. دەستبڵاوی لە بەکارهێنانیدا مەبەست و مانا ماندوو دەکات، لە هەمان بەکارهێنانیشدا چڕکردنەوەی زیاد لە پێویستیش دیسان مەبەست و مانا ماندوو دەکات. لە هەردوو باری بەکارهێناندا زمان توانای پاراستنی بێدەنگی نامێنێت. (جەلالی میرزا کەریم) لە بنەماڵەیەکی سیاسی و ڕووناکبیر و شۆڕشگێڕدا لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٥ لەدایك بووە، بە بڕوایەکی پتەوەوە بەشداری لە ڕۆشنبیریی زمانی نەتەوەی خۆیدا کردووە.

زمان لە دەقی (ڕوانینەکانی چاوی شەقام- گۆڤاری بەیان، ژمارە ٨ی ساڵی ١٩٧٣، ل: ٣٩ تا ٤٠)دا ڕووداوێکی دەگمەن نییە، درێژبوونەوەی ئەو زمانەیە دوابەدوای شیعری کلاسیکی دێت و پێ بەپێ تا دێتە خوارەوە کاڵ و

کاڵتر دەبێتەوە. زمان تێیدا ئاسۆی یەك ئاستی وەرگرتووە و پێکهاتە و سروشتێکی باڵاو جەربەزە ڕووبەڕوومان نابێتەوە. واتە سەرلەنوێ هەستی پێ ناکرێتەوە. هەست بە شتێك بکەیت و نەزانی چییە. سەرسامی و دۆزینەوەی نادیاریی لەم نوختەی نەزانین چییەدا دێتە کایەوە و وەك کەرەستەیەکی خاو و پەی پێ نەبردراو فۆرمی زەینی وەردەگرێت.

زمانی لە خودی شیعرییەوە نەبردووەتە ناو خودی کۆمەڵگەوە، بگرە لە خودی کۆمەڵگەوە بردوویەتییە ناو خودی شیعرییەوە و جۆرێك توندوتیژی و ترس و تۆقانی خستووەتەوە. بەم شێوەیەش زمان دەوڵەمەند و ئەزمووندار نابێت، لە دەروونڕۆشنی بەتاڵ دەبێتەوە و هەست و نەشونما دەوەستێت. لەگەڵ ئەمەشدا بارودۆخی ژیانی حەفتایەکانی کۆمەڵگەی کوردی و زەمینەی شیعریشی ئامادەیی ئەوەی تێدا بوو ئەو زمانە وەربگرێت و قبووڵی بکات. لە ئاستی بەکارهێنانی هێماشدا قووڵایی هێمای نەپاراستووە، لە قووڵاییییەکی پێویستدا هێما بەرەو ژیانێکی بزێو ناڕوات، بگرە بەرهەمێك دەهێنێتە کایەوە و لەناوی ڕوون دەبێتەوە و بەشداری خۆی ڕادەگەیەنێ. لەم ڕاگەیاندنەدا زمان پێویستییەکی بنەڕەتی مرۆڤانەیە و هەمومان بە شێوەیەکی هاوبەش بەکاری دەهێنین و کەڵکی لێ وەردەگرین. کەڵك وەرگرتنێکی دیاریکراو و هەستکردن بە شکۆمەندی دۆزینەوەی بەشێك لە هەقیقەت. ئەو هەقیقەتەی دەتەوێ لێی بدوێی تاقیکردنەوەی دەوێت و دەبێت لە ڕەفتاری ئاخاوتندا بەدی بکرێت. هەمموو تاقیکردنەوەیەکیش کەرەستە خاوەکانی ژیان و جیهان لەباری دۆخ و شێواز و واتادا تازە دەکاتەوە و ئارەزووی پێشنیازکردن بەهێز دەکات، لە هەمان کردەشدا کاتێکی مێژووی ژیان و جیهان ڕادەگەیەنێت. ئەم کاتە



ڕاگەیاندراوە هونەری داهێنەری هەقیقەتە. بەشێك لە پێداویستییەکان بە ژیان و جیهان دەبەخشێت.

ئەگەر بتەوێت بەسەر شیعردا زاڵ بیت، دەبێت شیعر باش بناسیت. هەموو شیعرێك لە شوێنی خۆی پێدەگات و دەناسرێت. ئەو هونەرەی ئەو بەدوایدا دەگەڕێت بیدۆزێتەوە ڕێك لەگەڵ ئەو شوێنەی شاعیرەکەی تێدا پێگەیشتووە گەشەی کردووە. پێگەیشتنی پێکهاتەی هونەری شیعر بە پێوەندگی شوێن و کولتوورەوە پەیوەستە. واتا بیرکردنەوە و وێناکان ئاکاری شوێن وەردەگرن. شوێن هێڵێکی بەردەوامە و لە فەرهەنگ و کولتووردا پێگەیشتووە و درێژ دەبێتەوە و دەگات بە هێڵی بیرکردنەوەی هەموو شاعیرێك. شاعیریش وەك پێکهاتەی سەرەکی و ناسنامەی داهێنان مامەڵەی لەگەڵدا دەکات. شوێنیش خۆی بەئاکاری دانیشتووان دەڕازێنێتەوە.

(کاروانی وشەی ڕاچەنیو) کۆ شیعری یەکەمی ئەم شاعیرە بووە . ساڵی ١٩٧٤ ئامادەی چاپی کردووە و بردوویەتییە چاپخانە و تەنانەت بووەتە فیلمیش . بە هۆی بارودۆخی سیاسی لە چاپخانە وەرگیراوەتەوە . شاعیریش لەم کاتەدا بەغدای جێهێشتووە و بووەتە پێشمەرگە ، بە ئامانەت لای ئەدیبی ناسراو (محەمەدی مەلا کەریم)ی داناوە. دوای نسکۆی شۆڕش ساڵانێکی زۆر وەك پەنابەری دژە دەسەڵات لە ئەمەریکا ژیا و لەگەڵ ڕاپەڕیندا گەڕایەوە کوردستان و هاتەوە ناو کۆمەڵگەی پڕ جووڵە و زیندووی خۆی و کانگای هەڵڕشتنی هەستەکانی. کوردستان و کۆمەڵگەی کوردی ناو و ناوڵێنانێکن بوونی ڕاستەقینەیان لە شیعرەکانیدا هەیە و شادەماری خوێنین، ماوەیەکی کەم تێیدا مایەوە، لە١٤\١\١٩٩٣ لە هەولێر کۆچی دوایی کرد ، کەچی ئەم

ئامانەتە سەرە داوێکی نەدرایە دەست کەس و هیچ هەوڵێکی دیاریشی بۆ چاپکردنی نەدراوە، کە گرینگترین کۆ شیعری نوێبەخشی بزووتنەوەی ڕوانگەیە ، دەربڕین لە زمان و فۆرم و دارشتنی ئەم بزووتنەوەیە بکات. شیعری شاعیرانی ئەم بزووتنەوەیە بە گشتی لەناو تەمومژێکی وشیارانەدا بارگاوی بوو بە ئایدۆلۆژیا، شیعری بارگاوی کراویش بە ئایدۆلۆژیا پەیوەستە بەو دۆخە ئێستاییەی، کە تێیدا دەژی و دۆخێکی نیمچە هەڵخەڵەتێنەرە.

گەردوون بەجۆرێك ترپە و ئاوازی دامەزراو، بە دوای یەکدا هاتنی تاریك و ڕووناکی و وەرزەکان،... تاد. هەڵدەسووڕێنێ. ئەو جۆرە ترپە و ئاوازەی، کە گەردوون بەڕێوە دەبات گواستراوەتەوە ناو دەروونی مرۆڤ و وزەیەکی زۆری لە بیر و مێشکی خستووەتە گەڕ بۆ هێنانە کایەی بەها ئێستێتیکییەکانی ژیان ڕێکخستن. لێدانی دەمارەکانی لەشی مرۆڤ جۆرێك ترپە و ئاوازی بەڕێوە بردنن. گرینگترین ترپە و ئاواز لە ڕۆیشتنی مرۆڤەوە پەیدا بووە و خۆی لەگەڵ هەقیقەتدا گونجاندووە و جۆرێك چاوگی هۆشیاربوونەوەیە.

لە شیعریشدا لە یەکەم دێڕییەوە تا دوا دێڕی ڕۆیشتنێکی نەرم هەیە و ترپە و ئاوازی ئەو ڕۆیشتنە دەبێتە ئاهەنگ. شیعری ئەم شاعیرەش بەهۆی بوونی سروشتێکی ترپە و ئاوازییەوە دەربڕین لەبارە بوونییەکان و دەرخستنی مانا دەکات، بەڵام تەنیا لە ڕێگای ترپە و ئاوازەوە ناگەینە ناخی ئەدەب، ناخی ئەدەب خۆرە و زەوی وەك پێکهاتەی مەوداکان بە دەوریدا دەخولێتەوە. ناشزانین کامەیان سەرچاوە و بنەوانە و کامیان پێکهاتەیە. هەر کاتێکیش بمانەوێ بە تەواوی ئەو زانیارییە بزانین و بناسین ون دەبین.



شاعیری داهێنەر ئەگەر سەردەمێکیش بەمەبەست و ئەنقەست پشتگوێ بخرێت ئەوە مێژووی داهێنان لە ڕۆژ و ڕۆژگار و کاتی پێویستی خۆی زۆر بەهێز و شکۆوە دەیهێنێتەوە ناو ماڵی ڕاستەقینەی ئەدەب. لەتەنیشت گلۆپی بە شەوق و ڕاستییە ڕوونەکان ڕایدەگرێت. مێژووی بیرکردنەوەش، ئەو مێژووەی بۆ زیندوو دەکاتەوە، کە بەهرە و کۆششی خۆی دروستی کردووە و ڕەوایی بوونیەتی. مێژووی ئەدەب کۆمەڵێك شتن بە یەکەوە دەڕۆن و تێکەڵ بەکرۆك و ناوکی داهێنان دەبن. لەم بار و بوارەشدا داهێنەر هەر بە داهێنەری خۆی دەمێنێتەوە. خوێنەری هەمە جۆریش ناتوانێت خۆی لە ئەفسوون و کاریگەرییەکانی بەدوور بگرێت. پێوەری ئەفسوونی داهێنان شوێنی بۆ دەستنیشان دەکات. لەم دەستنیشانکردنەشدا پێوەندییە داهێندراوەکان دەدۆزرێنەوە. بە دوای ئەوەدا دەگەڕێین، کە هەیە و قسەی لەبارەوە دەکەین.

مایسی ٢٠٠٨ هەولێر

# قەڵەمکێشی لەتیف هەڵمەت بە وشە

بەختیاری داخوازییەکی هەمیشەیی مرۆڤە، بۆ بەختیاری کەسایەتی خۆی وێڵە و خەڵکانی دیکەیش ئازار نادات. ئەو بەختیارییەی بە تەنیا لە ناوچە بەرزەکانی شیعردا دەستکەوتووە و لەنێوان دوو کەوانەدا جۆرێك فۆرمی خۆشەویستی بەخۆیەوە گرتووە، جیاواز و سەربەخۆ لە هەقیقەت و خەیاڵ، هەقیقەت و خەیاڵیش هەمیشە لە حاڵ و باری گۆڕاندان. یەك لەناو ئەوی دیکەدا جێگیرنییە و فراوان دەبنەوە. ژیانی سەرمەشقی شیعرەکانییەتی و بۆ گۆڕان و خۆشگوزەرانی ژیان، (جیاواز) و (سەربەخۆ) شیعری کردووەتە دروشمی گەشانەوەی ژیان، هەموو دەمارە پێکهێنەرەکانی پڕن لە گەشانەوە و بەرزکردنەوەی ژیان و ژیاندۆستی. بۆ ڕێزلێنان لەم بار و بوارەدا هونەری گفتوگۆ لە زەینیدا بەکاردەهێنێت. هونەری گفتوگۆ لە کارەکانیدا خاسیەتێکی زاڵن و وەك سەرچاوە و بیروڕایەك دەگەڕێتەوە لای و بە ڕاناوی نادیار ڕووی دەمی لە میللەت و مێژووە و بەتاسەوە لە ڕێگای هونەری گفتوگۆوە دەیاندوێنێت. ئەم هونەری گفتوگۆ بەکارهێنانە کردارێکی هۆشیارانەیە و بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی ڕۆچوو بەناو ڕیشاڵی ڕۆشنبیرییە. بەشێوەیەکی گشتی هێزی بیر و هەست بەسەر هێزی زمان و هێزی داڕشتن و هێزی وێنەدا زاڵن. لە دەقی (ساڵنامەی سەدەی بیستەم _گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە٣ ی ساڵی



١٩٨٥،ل١٦١ :تا ١٧٠)دا ئەم زاڵبوونە بە هەموو پێکهاتە و ماناکانییەوە خۆیت پێشکێش دەکات. میللەت و نەخشی مێژوویی میللەت هەموو هەستەکانی بۆ ئاستی خرۆشان بەرزکردووەتەوە و لە دەقدا پێکەوە کاردەکەن. لە سەرەخۆ و هەنگاو بە هەنگاو شاعیریەتی و تایبەتکاری خۆی قووڵ کردووەتەوە و گەشەی سروشتی وەرگرتووە. نوێبەخشی و گۆڕان لە خۆڕا ڕوونادەن، لە ڕێگای نیمچە کامڵبوونی هەستەکانی نووسەرەوە دەبنە (ڕووداو) و (دیاردە) و ڕوودەدەن. تۆوی ئەو نوێبەخشییەی ئەم شاعیرە لە زەوی گەرم و نەرمی شیعری کوردیدا وەشاندی، لە شیعری کەسانی دیکەیشدا چرۆی کرد و سەوز بوو، بوو بە ڕۆشناییەکی ناسرا و تایبەت و دیاریکراو.

ڕەگەزی گێڕانەوە لە شیعری کوردیدا لە ئاستێکی باڵادا نەبوو، ئەم هەوڵی دا لە ئاستێکی فراوانتردا بەکاری بهێنێت و کۆمەڵێك خاڵی دیاریکراوی تێدا دەرکەوێت و خوێنەریشی لێ نزیك ببێتەوە. قەت چاوی لە ناپاکیی دیکتاتۆر نەپۆشیوە و تاوانەکانی پشتگوێ نەخستوون، هەڵوێستی ئەدەبی بەرانبەر وەرگرتووە و لە ویژدانی خۆیدا دادگایی کردووە. ئەم دادگاییکردنەشی بە مەبەستی ئاشکراکردنی خودی بەدە. تا لەوە تێبگەین خودی بەد لەناو کۆمەڵگەدا چۆن ڕەفتار دەکات و چ گرفتێك دەنێتەوە، گفتار و کرداری چییە و بە کوێ دەگات. ئەگەر نهێنییەك لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا هەبێت، ڕەنگە ئەوە بێت بابەت سنووردار ناکات و بە هیچ پێزانینێکیش نووسین لای چالاکییەکی ڕۆژانە نییە. قەوارەیەکە لە دڵ و گیانیدا گۆڕانی بەسەر دادێت و شێوەیەك وەردەگرێت، شێوەی نووسین. لە قووڵییەکاندا پێ بە پێ بەرز دەبێتەوە بۆ گۆڕان و گوێبیستی هاواری کپکراو، هەموو کات کاتی هاوارکردنە. تا دۆخێکی لێ

وەرگرێت بۆ گەیاندنی و بە بابەتکردنی هاوار، ئەو هاوارەی دەسەڵاتی دیکتاتۆر لە دڵ و گیانی کۆمەڵگەی دروست کردووە. لە بوارە جۆرا و جۆرە ئەدەبییەکاندا کاری کردووە: شیعر، چیرۆك، ڕۆمان، شانۆنامە، ڕەخنە و لێکۆڵینەوە، وەرگێڕان، ڕۆژنامەنووسی....تاد، بێ وچان تەواوی توانای خۆی بۆ نووسین بەکارهێناوە. دەبێت ئەوەمان قبوولْ بێت لە هەلومەرجی ژیانی کورددا نووسەرایەتی کارێکی ئاسان نییە. دواتر، کە لە نووسیندا داهێنەر بووی، هەزار خەنجەر لەسەر پشتتە. لەبەر چاوی ڕوونی نیوەڕۆدا، وەك کردەیەکی جەستەیی نا. بگرە وەك کەسایەتی لەناو چالاکییەکانی ژیانی ئەدەبی و ڕۆحیدا دەتکوژن.

لە بنەماڵەیەکدا، کە یەك لە خەسڵەتەکانی ئەم بنەماڵەیە ئەدەبپەروەریی و خوێندەواریی بووە، لە ناوجەرگەی گەرمیان (کفری) لە ساڵی١٩٤٧ دا لە دایك بووە، نیشانەیەکی گرینگ، کە بەدرێژایی ئەزموونی لەگەڵیدا هاتووە و بەردەوامیشە، توندی و ڕووبەڕووبوونەوە و بە گژداچوونەوەیەتی. ڕەنگە کاردانەوەی ئەم کەش و هەوایەی گەرمی مەڵبەندی لە دایکبوونی بێت، کە تاسەکانی بەم شێوەیە دەردەبڕێت و بەشێك بێت لە دەسەڵاتی ئەدەب وەك هێزێکی ئامادەکراو و مەشق پێکراوی بیر و هەست بەرانبەر لە دیکتاتۆر بگرێت. ڕاستەوخۆش توندییەکە نانووسێتەوە، هاوکێشەی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگە دادەڕێژێتەوە و دەیگۆڕێت بۆ ئاراستەی ئامانج و پەیام و کاکڵەی مەبەست، کە چالاکی داهێنانە. لە ڕێگای نووسینەوە دەربڕین لەم ئاراستەیە دەناسینەوە و دێتە دۆخی خۆپێناسەکردن و توانا و ئەفسوونێکی سەیری سووربوون بۆ سەرکەوتن لەم خۆپێناسەکردنەدا خۆی ئاشکرا دەکات. مرۆڤی یاخی بۆ سووربوون لە باری یاخیبوونی لە دۆخی دڵنیاییەوە دەهێڵێتەوە و ئەزموونی



مانادارکردنی ژیان و دنیای دیار و دنیای واقیع وەك کتێبی دڵخوازی خۆی دەخوێنێتەوە و بۆ بە ئەدەببوونیش بەدنیای پەنهان و دنیای زەیندا تێیدەپەڕێنێت. فەرهەنگی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و زانست و دەقە ئایینییەکان کاریگەرییان لە بیرو بنیادی نووسینی کردووە و خراپیش بەکاریان ناهێنێت. لایەنی درەوشاوەشی لە بیر و بیرکردنەوەی وەرگر جێ هێشتووە.

بە گژداچوونەوە چییە، یان چەمکی بەگژداچوونەوە لە ئەدەبیاتدا بەچ مانایەك وەرگیراوە و کاری پێ کراوە. ئەمەیان بەلایەکدا ڕووداوێکی دەگمەن نییە .سنووردارییەکە لەنێوان مرۆڤ و دیکتاتۆردا، یان میللەت و دیکتاتۆر، وارِسکی ژیاندۆستییە و دواخستنی مەرگە، بەڵام ئەگەر ئێستێتیکای ڕۆحی مرۆڤ و ڕۆحی میللەت بووە هێزێکی ئێستێتیکی، ببیندرێت و ببیسترێت و هەستی پێ بکرێت ئەوەیان دەبێتە ڕووداوێکی دەگمەن. ئەم شاعیرە لە خەمی شیعر و ئەدەبیاتی خۆیدایە و هەوڵی ئەم دۆخگۆڕینەی داوە و کردویەتییە ڕووداوێکی دەگمەن و دیدێکی مەزندەکراو و دەتوانین پێی بگەین، سنووری هێما و هێماپێکراو بەرفراوانتر دەکاتەوە و وزەی مانا، کە خوێنەر داوای دەکات بەرزدەکاتەوە، هەروەها ستەمی لە شیعر نەکردووە و بەیەك شێواز بەردەوامی بە بەهرە و توانای نەداوە، زۆرینەی شێواز و ڕێبازە شیعرییەکانی ئەزموون کردووە، بۆ هەر شێواز و ڕێبازێك بگەڕێیت بە شێوەیەکی خەملیو لە ئەزموونی (لەتیف هەڵمەت) دا دەیدۆزیتەوە، لە هەندێك بار و بواردا ڕەگەزی دیکەی کارپێکردووە و لێزیادبوونیشی هێناوەتە ئاراوە، کە ڕێباز و شێوازە جۆربەجۆرەکانیشی بەکارهێناوە مرۆڤی وەك ڕۆبۆتێك نەهێناوەتە ڕووبەری نووسین، چاوڕوونی بۆ گۆی زەوی هەیە، ئەم گۆی زەوییەی، کە هێشتان مرۆڤ بۆ بەختیاری تەماشای

دەكات و تێدەكۆشێت. مرۆڤ لە ئاست نهێنییەكاندا دادەمێنێت و ئارەزووی بەدیهێنانی دركی مرۆڤ و سەرسامییەكانیەتی، سەرنجمان بۆ ئاستی بەدیهێنانەكانی ڕادەكێشێت و بیر لە هۆكار و دەرئەنجامەكانی بكەینەوە. خاوەنی سروشتێكی هەستییە و توانایی ئەوەی هەیە دەربڕین لە جوانییە سادەكانی ژیان بكات و سادەییەكە لە نوێبەخشی قووڵ بكاتەوە، لای نووسەری پێگەیشتوو هەموو شتە جوانەكانی ژیان بە سادەیی دەردەبڕدرێن. زمانی كوردی لە ڕێگای قوتابخانەوە فێرنەبووە، لە ڕێگای ئەشقی نووسینەوە ئەو زمانە گەرم و گوڕە فێربووە و هێزی داوەتە پیت و وشە و لە ڕستەدا بێ گرێ و گۆڵ ئاسۆ و دووری ئێستێتیكی پێ دەدات. لە زماندا كەمێك پێبەستە بە زمانی ئایینەوە. ئەو زمانەی لە ئاسمانەوە هاتووەتە خوارەوە و زمانی تاكە، بەخاڵ و نیشانەی دیاركراودا بەڕێوە دەچێت. وەك سروشدەرێك داوای سروشی لێ دەكات، سروشی شیعرییەت و ئاسۆی خەملێوی دنیایەكی شیعراوی، كە پەیمانی ژیانێكی لەگەڵدا دێت، ئاشتكردنەوەی هەموو ناكۆكییەكانی هەڵگرتووە و هێزی وەرگرتن و هێزی تێڕامانمان بەهێز دەكات و بە ڕەوانبێژییەكی چەشەدارەوە هەوڵی بە گەڕخستنی پێكهاتە نوێبەخشەكان دەدات. لەم شێوە دەرخستنەدا شاعیر هەوڵ دەدات شیعر خۆبوونی خۆی هەبێت و ئەو ڕووبەرە وێنا بكات، كە ڕۆح دەری دەخات و ئینتیمای خوێنەری بۆ پەیدا دەكات و ئەو بارو بوارە دەرەخسێنێت، كە تێیدا نیشتەجێ بێت. بەشێوەیەكی پەسندیش هەڵوێست و تێگەیشتنی لەبارەوە بە پیت بێت و هەستەكانی بخاتە بەردەست.

نووسەری دەست لە پشت دراو و پەروەردەی دەستی ئەم و ئەو و كاسەهەڵگری سواڵ، یان كەمتەرخەم و مردۆخ و خۆنەناس و ویژدان ڕەق و



خەڵات وەرگر و ئافەرین ویستی پیلانگێڕان: ئەگەر( نوێبەخش)تان بینی بیكوژن، چونكە بە بڕواوە ڕسكاوە، (گۆڕانكار) و (دۆخگۆڕە) دڵی دوور لە جەستەی لێ نادات و پشتگیریش لە تایبەتكار و نوێبەخشی دەكات. پشتگیری تایبەتكار و نوێبەخش بەرەو كوێت دەبات، بەرەو خودێكی كراوە و شۆڕەسوارییەكی تایبەت، كە ویژدانی ئەدەب تێیدا نافرۆشرێت و ناكڕدرێت.

حوزەیرانی ٢٠٠٨ هەولێر

## قەڵەمکێشی ئەنوەر قادر محەمەد بە وشە

کەس ناتوانێت وێنەی دوارۆژ بکێشێت. ئەوەی هەمانە تەنیا وێناکردن و خواست و مەرامێکی کەسییە و لە زەیندا پەرەی پێدەدرێت. هەموو ئەو پرسیارە کاریگەرانەی لە دەوری پرسیاری ژیان کۆبوونەتەوە بە ستوونی و ئاسۆیی زیادیان کردووە و دووبارە بوونەتەوە، بە خولیا و کارا و بەرهەڵستییەکی دیکە، بوونەتەوە پرسیاری سەرەکی ژیان. بە دوای تێگەیشتنی واقیعدا گەڕاون و دەگەڕێن. شاعیر لەم جۆرە گەڕانەدا بنەماکانی شیعری نوێبەخشی پێکدەهێنێت و بە پەرۆشەوە ئەو گرفتانە دەدوێنێت، پاش دواندنیان لە شوێنی سەرەکی شیعردا دەیانکاتە ناوەند و وەك هەقیقەتێك چۆنیەتی ژیان و بوونی تایبەتی لەم ناوەندەدا پێشکێش دەکات.

زریان، زایەڵە، زنار لەناو شیعری کوردیدا ڕووناکییەکن قەتاوقەت لە کزبووندا نین. لە جوانییەکی نزیکەوە سەیری ژیانی کۆمەڵگەیان کردووە و لەناو ئازار و تلانەوەکانیاندا بۆ داهێنان ژیاون و پڕن لە هێمای ژیان. لەگەڵ پێچی ڕۆژ و ڕۆژگاردا بەهای شیعرییەتیان زیاتر ڕوون دەبێتەوە و باشەیان دەگوترێت. لە بەکاربردنێکی دەگمەندا ئەزموونی ژیان و نووسینیان مشتوماڵ و تاقی کردووەتەوە . بێ ئەوەی لە پێناو دوارۆژدا نووسرابن. خۆیان کۆمەڵێك خاڵ و هێڵن مرۆڤی هەموو ڕۆژ و ڕۆژگارەکان دەتوانن بیکەنە تابلۆ و ماڵی فەرامۆشی و



پشوودانی خۆیانی لەناو دانێن. شیعر کتێبی کراوەی فەرامۆشی و پشوودانی مرۆڤی ئازادی ویست و تەنیایە، هەلومەرجی ژیانی بەشێوەیەکی ڕوون و ڕەوان دەردەبڕیت، هەر ئەمەش هۆ و ئامانجی سەرەکییە مرۆڤ خوو بە نووسینەوە دەگرێت و خۆی لە ئاکاری باو لادەدات. ئەو دەقە ئەدەبییانەی لە ڕۆژ و ڕۆژگاری خۆیاندا بچنە ناخی وەرگری ئازادی ویست و تەنیاوە، بێ چەند و چوون دۆخی مانەوەی بۆ دەڕەخسێت و نیشتەجێبوونی لە دوارۆژدا مسۆگەر دەکات. خوێنەریش لە کاتی جیاجیادا دەگوازێتەوە ناو وەرگرتنێکی ڕاستەقینەوە. ئەو ژیانەی شیعری ڕاستەقینەی تێدا دەنووسێت لە هەموو سەردەمەکاندا بەردەوام دەبێت و بەشێوەی جیا و شێوازی هەمە جۆرەوە دووبارە دەبێتەوە، بە زیادبوونی شتی بچووك بچووکەوە خۆی ئامادە دەکاتەوە بۆ بەکاربردنێکی دیکەی کاریگەرەوە.

تایبەتمەندی و شکۆیەك لە شیعری کوردیدا بەر ( ئەنوەر قادر محەمەد) دەکەوێت، لە هەرسێ کۆ شیعریدا جۆرێك کەش و هەوای تازەی داهێناوە و هێناویەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە .

زریان: شیعری هەڵچوون و جۆرێك شکستی خودی و شکستی نەتەوایەتی.

زایەڵە: شیعری لێوردبوونەوە و ڕامانی هێمن.

زنار: شیعری لێوردبوونەوە و ڕامانی هێمن و عیرفان و غوربەتی ناخ.

لە تێگەیشتن و بەکارهێنانی زماندا ئێجگار هەستەوەر و تایبەتکارە، بە ئاسانی دەتوانی بنەما بنەڕەتییەکانی داڕشتن و خاسیەتە شێوازییەکانی هەرسێ کۆ شیعری لە یەك جیابکەیتەوە. ئەمەش گرینگترین دەسکەوتی نووسین و داهێنانە، کە لەگەڵ خوڕی و خاویی ترپە و ئاوازدا بگونجێت.

نووسەری دەگمەن ئەم جیاکارییەی بەردەکەوێت و کەم وێنە و بە بەهایە بۆ ئاستی ئەدیبە داهێنەرەکانی بەرزدەکاتەوە. بۆچوونی تەواو و ڕوونی بەرانبەر نوێبەخشی پێشکێش کردووە و هێڵەکانی لە دەقی (وەرزی سەرهەڵدانی فەرهاد - گۆڤاری بەیان، ژمارە ٨ ی ساڵی ١٩٧٣، ل: ٣٠ تا ٣٢ )دا دەرکەوتووە و خۆی نواندووە، هەروەها بۆچوونی لەبارەی بوون و ژیانەوەش گەرم و سەرنجڕاکێشە و ئێمە بە تێڕوانینێکی تەمومژاوی ناگەیەنێت. لەڕەوتی نووسیندا بە خودێکی هۆشمەندەوە ڕێگای داهێنانی گرتووە و نەچووەتە ناو هیچ ئەڵقە و داو و گروپێکەوە. ژیان لەناو دەقەکانیدا درەوشاوەیە و قەتیش ملنەرمی دەسەڵات نەبووە. بۆچوون و ئاراستەیەکی دیاریکراویشی قبووڵ نەکردووە بۆ پێویستی ئابووری، یان ڕاگرتنی دڵی حزبێك، یان دامەزراوەیەکی سیاسی. سێبەری سەکۆی سوڵتان و دیکتاتۆرەکان ڕەنگی پێڵاویان تاریك نەکردووە. دەزانێت هەنگاوی نووسین و داهێنان چۆن هەڵدەگرێت. هەنگاو هەڵێنانی نووسین لەسەر ڕووبەری سپی کاغەز و ئاوێنە و هاوێنەی کامێرایە. ئەم زانینە خۆی تێگەیشتنی پەتییە لە ئەدەبی بێگەرد و پەیامی ئەدەبی بێگەرد. سەربەخۆیی لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا دژوارترین ڕێگایە و هەڵبژاردنی ئاسان و بێ گیروگرفت و کێشە نییە. ئەم هەوڵ دەدات بۆ دەستەبەرکردنی دەسەڵاتی پەتیی ئەدەب، کە دەسەڵاتێکی بێگەردە و کاریگەری تا هەتایەی جوانییە. دوورە لە دەسەڵاتی بەڕێوە بردن. دەسەڵاتی بەڕێوەبردن بۆچوون و تێڕوانینی خۆی بەسەر بەرانبەر دەسەپێنیت و چاودێرە لە سەر چۆنیەتی بیرکردنەوە و هەنگاو هەڵێنانی. شاعیر سەربەخۆیی تەواوی بۆ خودی خۆی و خودی خوێنەرەکانیشی دەستەبەر کردووە. بەوەی هیچ پانتاییەکی نووسینی نەداوەتە ئەوی دیکە. واتا دەسەڵاتی



دیکتاتۆر. لەمجۆرە ئەدەبە بێگەردەدا تەنیا گوێت لە لێدانی دڵی ئەدەبی بێگەرد و ویژدانی جوانی و خولیا و چێژی دەگمەن دەبێت. هەموو ساڵێك بۆ حەجکردن سەردانی مەڵبەندی لە دایکبوونی خۆی، (عەربەت) دەکات و بە بچووکترین توخمە ناوچەییەکانییەوە پێبەستە. جەژنی لە دایکبوونی سەر زەوی (١٩٤٧/٧/١) بۆنەیەکی ئەدەبی و نەتەوایەتییە، هەروەها جەژنی لە دایکبوونی ژێر زەویشی بۆنەیەکی دیکەی ئەدەبی و نەتەوایەتی دەبێت ، پێویستیشە لە گۆڕستانی ناودارانی وڵات بە خاك بسپێردرێت. ژیانی شیعری لە کۆ شیعرێك بۆ کۆ شیعرێکی دیکە ڕووەو گەشە و جیاکاری دەڕوات . متمانەی تەواوی لای کتێبخوێنی ئەدەبیات دروست کردووە و نوێبەخشی و هاوچەرخیەتی خۆی دەپارێزێت. ئەگەر دیوانی شاعیرانی ناوداری کورد لە کتێبخانەیەکدا ڕیزبەندییان بۆ بکرێت دیوانی ئەم شاعیرە شکۆی ئەوەی دەبێ بە تەنیشت دیوانی (نالی و مەحوی ومەولەوی و گۆران و دیلان)ەوە دابندرێت. خۆی بە وێنەی ئاڵۆز و لێڵەوە سەرقاڵ نەکردووە و پاراوییەکی ئێجگار بەتینی تێدایە و پەیوەندییەکانی وێنە بە حیکمەت و هەستی ناخییەوە دەستنیشات دەکات. دەتواندرێت زۆر خاسیەتی شیعری لەم شاعیرەدا بناسرێتەوە. ترپە و ئاوازی داستان و بەیتی بە تێگەیشتنەوە وەرگرتووە و وەك پێویستییەکی نوێبەخشی ئاگاداریانەوە و لە کارەکانیدا خاسیەتێکی کاریگەری شیعرین . ترپە و ئاوازی داستان پێویستییەکی بنەڕەتییە بۆ نوێبوونەوە و سەرچاوەیەکی ڕوون و پڕ بەهرەیە بۆ بە دەستهێنانی پەنجەمۆری سەربەخۆیی داهێنان و ناسینی ڕەگوڕیشەی دیارده جیاوازەکان. ئەم شاعیرە لەم قەڵەباڵغی و هەرا و زەنایەی ئەمڕۆ خۆی بەدوورگرتووە و دوورەپەرێزی کردووەتە ئامانج و دۆخێکی سروشتی وەرگرتووە.

**ڕووگەنمای شیعری دۆزیوەتەوە و بزری ناکات و دەیپارزێت. بزری بکات ، یان بە موو لێی لابدات دەبێ سوژدە بۆ نارەوایی، یان ساختەکاری ببات، توانایی نووسینی لە ناودەچێت. ئەم بە تەنیا و بەس سوژدە بۆ( خودی تەنیا )و( شیعری بێگەرد )و (توانایی نووسین) دەبات. زۆربەی کاتەکانی لەماڵەوە، ماڵی پشوودان و خۆشبەختی نووسین. بەسەر دەبات. واتە لەگەڵ خۆدانیشتن و تێڕامان لە دووری و ئاسۆکانی کتێب و خوێندنەوە و نووسین. تەمەن و ئەزموون ئەوەیان تێگەیاندووە و بۆیان یەکلا کردووەتەوە، کە دوورەپەرێزی بەتێگەیشتنەوە پەروەردە بکات. نەك گۆشەگیری و دابڕان لە واقیع و دەوروبەردا. واقیع بۆ پشتگیری لە خۆکردن، گومان لە دەربڕینی پرسیارەکانی خۆی ناکات. واقیع وەك کۆمەڵێك پرسیاری بەردەوام وروژاو وەردەگرێت و دەیدوێنێت و تێڕوانینیشی لە واقیعدا کورت ناکاتەوە، یان واقیع وەك تاکە بۆچوونێك لە بیرکردنەوەیدا بالآنییە، بەڵام بە توانا و مۆسقایەکی هێمنەوە گوێی بۆ شل دەکات و ئەو ماوەیەی وەردەگرێت و دەیکاتە سەرچاوە و بەهرە و سروش، کە دەکەوێتە نێوان خودی شاعیر و واقیعەوە. ئەو ماوەیەش دیار نییە خوێنەر لە چێژ و بیرکردنەوەی خۆیدا وێنای دەکات. دوورەپەرێزی بەتێگەیشتنەوە، توانایی مرۆڤ هەڵدەسەنگێنێت و دەیداتەوە دەستی بۆ ئەوەی لەناو کێش و پێوانەی لە مەحەکداندا توانای خۆپێشکێش کردن و خۆدەستنیشان کردنی هەبێت. کێش و پێوانە و قەبارەی خۆی بدرێتەوە دەست. دوورەپەرێزی خوێنێکی زۆر بەهێز و پاراوە بۆ نووسین و چەمکی پیرۆزی و ئاسوودەیی ماڵ قووڵ دەکاتەوە و شیعری بێگەردیش لە هەرا و زەنا دەپارێزێت، هەروەها لەگەڵ خوێنەرە زەینییەکانیدا دەکەوێتە پێوەندییەوە و**



**بە باشی لەگەڵ یەکدا هەڵدەکەن. خوێنەری زەینیش خولیای زانیارییان هەیە و بڕوا و بۆچوونت وێنا دەکەن.**

**تەمموزی ٢٠٠٨ هەولێر**

# قەڵەمکێشی سەلام محەمەد بە وشە

ئەدەب لە کرۆك و ناوکی خۆیدا بۆ مرۆڤ و ئەو بەشەی سروشت دەنووسرێت، کە سیما و خەسڵەتی مرۆڤیان وەرگرتووە، یان لە سیما و خەسڵەتی مرۆڤدا بوونی خۆی دەدۆزێتەوە و دادیەڕێژێت. بەو شێوەیە ئەدەب مرۆڤ دەخاتە چەقی گەردوون و زەمینێکی تاك و شایانی بۆ تەرخان دەکات. ئەو دێرە تیژانەی لەناو شیعرەکانی (سەلام محەمەد)دا بە دوای ڕاست و چەپی خۆیدا دەڕوانێت. دەردەکەون و ون نابن، ئەوە دارِمانی بەها و ناکۆکی و پێوەندییە هاوسۆزەکانن، لە بارێکی دیاریکراودا دەردەکەون و هاوسەنگی هێما و هێماپێکراوێك بە تەواوکردنی یەکتری دەدەن. زۆر لەسەر ڕستەی سەرەتا و کۆتایی ڕادەمێنێ، وەك بڵێی سەرەتا و کۆتایی بکاتە ناوەند و نوختەی بینینی دۆخگۆڕین. گرژیی لەنێوان دێرەکانی سەرەتا و کۆتاییشدا وەك هونەرێك دەمێنێتەوە و ئاسۆ و دوورییەك وەردەگرێت. سەرەتا و کۆتایی دەبێتە بەشێك لە بنیادی پێکهاتەی واقیعی شیعرەکە و دەخرێتەڕوو، ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتی لەودا پێکهێناوە. دەکرێت ئەم تێن و تاوەی سەرەتا و کۆتاییە وەربگرین و بڵێین جۆرێکی زۆر تایبەتە بۆ دامەزراندنی پێوەندییەك. ئەم پێوەندییە سەر بەدەقێکی دەستنیشانکراوە و هەوڵی دووبارە ڕێکخستنەوەی ڕەوت و مانای ناو دەق دەدات. خۆی شێواز و فۆرمێکی



پەرەپێدراوی کولتووری خۆماڵییە. نموونە، بەیتی کوردی وەك هەستی ڕاستەقینەی خۆی زۆر لە سەرەتا و کۆتاییدا ڕادەمێنێ. کەواتە ئەم شێواز و فۆرمە پرسیارێکە لەبارەی ئاکامی بەردەوامبوونی کولتوورەوە. دەتوانین ئەو شێواز و فۆرمە بە هەقیقەتێکی نوێبەخشی بزانین، چونکە سەرەتا و لە پێشتردا بووەتە هۆی بەدیهێنانی پێویستییەکانی نوێبەخشی. هەموو ئەدیبێکی نوێبەخش خاوەنی هەقیقەتی باڵای خۆیەتی. ئەم هەقیقەتەش تەنیا شێواز و فۆرمی نووسینەکەیەتی. لەمجۆرە نووسینەدا ئەدەب زۆر لە ڕۆژانەی واقیع دوور ناکەوێتەوە و هەموو شتێك پێکدەهێنێ. وردبوونەوە لە وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانە، کە ئێستێتیکایەکی بیندراوی بە شێوەی جوولاو تێدا پێشکێش و پەخشکراوە یەکێکە لە کانگاکانی بەهرە وەرگرتن و ختووکەدانی ناخ بۆ دۆخی شیعری، دۆخی شیعریی جیهان و کرۆك و ناوکی مرۆڤە و بە قووڵی ڕێزی ژیانی تێدا دەگیرێت. شیعر ئەگەر بە قووڵی ڕێزی ژیانی تێدا نەگیرا، بێ بگرە و بەردە رووکەش و یەکئاستە.

زمان لای وەك موگناتیس وایە ئامانجی دەربڕین و کەرەستەکانی داهێنان لە بیرکردنەوەی داهێنەر دێنێتە دەرەوە بۆ جوولاندن و خۆدەربڕین. پێوەندیی نێوان وێنەی هەستی و وێنەی زەینی بەرەو هەڵوەشانەوە دەبا و وێنەی ویستی کۆمەڵگەی کوردی دەکێشێ، کە ویستێکی کۆ واتایە و بە دوای داگیرسانی هێڵێکی سەوز سەرگەردان و ماندووە، کە وەرچەرخان و گۆڕانێك دروست بکات، شیعر دەکاتە جێگرەوە و جێگرەوەش دەکاتە شیعر و خۆی تێدا دووبارە دەکاتەوە، وەك چالاکییەکی بیندراویش بەشداربوونی کارای خۆی لەناو پێشان دەدات و پێکهاتە وەردەگرێت . ئەگەرچی ئەو بۆچوون و پێودانگ و

جێگۆڕکێکردنە جۆرە ڕایەڵێکی هەڵخەڵەتێنەری شیعری بێگەردە. بۆ بەرهەمهێنانی شیعری بێگەرد، هەزار ڕێگا هەیە بۆ خۆدەربڕین و خۆهێنانە سەر دۆخی داهێنان و دەست لە دڵی شتەکان دان و ڕۆچوون بەناو سەرزەمینی شیعردا.

مرۆڤ شیعر بنووسێت و سیاسەتیش بکات، بێ هیچ گومان و دڵ لە دڵدانێك لە یەکێکیاندا سەختەکارە. بەشێك لە شاعیرانی ئەمڕۆ هێندەی خەریکن لە ناوەندە سیاسییەکان نزیك دەبنەوە، کەمتر لەوە خەریکی شیعری بێگەردن.

هەر دەقێکی شیعری بارێکی تایبەتی داهێنەر دەهێنێتە ئاوێنەی بەرانبەر بۆ خۆناساندن و جۆرێك گفتوگۆ و لێوردبوونەوە، پێویستیشە بەو پێودانگە، کە بارێکی تایبەتە لێی وردببینەوە، چونکە بارە تایبەتەکە ئەو هۆ و ئامانج و دەرهاوێشتەیەیە دەقە شیعرییەکەی لێوە بەرهەم هاتووە و بووەتە ئامادەبوون لە بووندا . باری تایبەتیش، کە بوو بە بەرهەم، دەگات بە بەدەستهێنانی ئاگایی نووسین و دەبێتە ئاکارێك بۆ سروشتی خودی، سروشتی خودیش دڵگەرمی و هەستیاری لەبارە تایبەتییەکەی نووسەر دەکاتە هێما و هێماپێکراو و وێنەی گەورە، یان بچووککراوی چۆنیەتیی بیر و بیرکردنەوەی. لەم ئاڵوگۆڕ و کردەیەدا خودی نووسەر دەبێتە خودی ئەدەب و نیشانەی هونەریی ئەدەب دەدۆزێتەوە. لەم حاڵ و بارەدا هونەری دۆزراوە بۆ بەرانبەر شیاوی تێگەیشتن دەبێت و بە باڵاترین پلەی خۆی گەیشتووە.

سۆفی لە دەروونی خۆیدا بە دوای ئازادیی خوداییدا دەگەڕێت و لە ئازادیی خوداییدا هەقیقەت داپۆشراو نییە. دەقی (هەنگوینی تاڵ ـ گۆڤاری بەیان،



ژمارە ١٣٨ی ساڵی١٩٨٧، ل: ٦٢ تا ٦٣)دا . بە شێوەیەکی پڕشنگدارانە دەربڕین لە هەڵبەز و دابەزی ڕۆحێکی پڕ گومان و پەرێشان دەکات. زیاد و کەمی لە دەقەکەدا فڕێداوە و کاکڵەی هێشتووەتەوە، واتا جومگە سەرەکی و پێویستییەکان. خاوەنی ئەزموونێکی تێڕامان و لێخوردبوونەوەیە لە ژیانێکی جەنجاڵدا، ئەزموونی ڕۆح ڕایەڵ و هەستێکی ڕەسەنە لە ئامادەبوون لە بووندا، بوونێکی پڕ گومان و پەرێشان. ئەم شیعرە تایبەتێکە لە ڕوخسارە کاریگەرەکان و ئەو شتە دەردەبڕێ، کە شاعیر لە ڕۆحیدا، یان لە شوێنێکی نزیك ڕۆحییەوە بە دوای سەرهەڵدانیدا عەودالە و سەرسام و چاوەڕوان لە پێشوازیدا وەستاوە.

بۆ نیشاندانی کاکڵەی ڕۆحێکی پڕ گومان و پەرێشان. ئەم شیعرە بژاردەیە، بە تین و تاو و سەرنجی تەواوەوە لە ڕیشاڵی دەروون دەڕوانێت و کرۆك و ناوکی هەستەکانی ئەزموون دەکات. پاش ئەزموونکردن و مامەڵە لەگەڵ کەرەستە ئەزموونکراوەکەدا دەیگوازێتەوە پانتاییەکی پیشاندراو. بە بوونێکی دیار و ئامادە و ئازادەوە لە (نوختەی بینین)ی نەمری و درەوشانەوەدا دەوەستێت. وەك سۆفی لەگەڵ بنەڕەتی بوونی خۆیدا گفتوگۆ پێکدەهێنێت، گفتوگۆش یارمەتی بیرکردنەوەی دەدا، زمان و شیعر وەك خود و سروشت بەناو هەموو شتەکاندا تێدەپەڕێنێت، بەرانبەر هەموو شتەکانیش دەیانوەستێنێت، هەریەکەیان لە ڕێگای ئەوی دیکەیانەوە هەست پێ دەکرێت و دەبێتە هۆی ڕوودان و چالاکی بوونی باڵا.

ئامانجی نووسین خەیاڵ و واقیع بەگەڕ دەخات بۆ پێشبڕکێ و ململانێ. خەیاڵ واقیع دەهێنێتە یاد و واقیعیش خەیاڵ تیشکدار و دەوڵەمەند دەکات.

لەم شیعرەدا تیشکی دەروون دەوڵەمەندی و بەهێزی و باوەڕبەخۆبوونی بە شاعیر داوە و لە کاریگەرییەکانی دەرەوەی ڕزگار کردووە. وێنە بە هێزێکی جۆراوجۆری، ویستی و نەستی و نیشانەی پێوەندییەوە، خۆی زاڵ دەکات و خەیاڵ زاخ دەدا، هەستیارییەکی پەنهان لە وێنەکان پەخش دەبن، بە هۆی زاوزێکردنی یەك بە دوای یەکی وێنەکان دەتوانین دەست لە هەستیارییەکان بدەین و فەزای چوار دەوری ویستی و نەستی و نیشانەی پێوەندیی وێنەکان ببینین. بەمجۆرە کەسایەتییەکی پڕ گومان و پەرێشان لە ململانێ لەگەڵ خۆیدایە و دووچاری خۆخواردنەوەی بەردەوامی دەکات. ئەنجام لەناو گومان دێتە دەرێ و گومانەکە خاو دەکاتەوە، بە دەستەواژەی (چەندین بیرەوەری ڕەشت بۆ جێهێشتم)، یان (بۆ بەیانی پەشیمانم) خۆی بەختەوەر و خۆشحاڵ دەکات و پیرۆزییەك بە خۆی دەدات، خودی پیرۆزییەکەش لە ڕەوتی دەقەکەدا دەردەکەوێت و ون نابێت. تێیدا هەقیقەتی ڕۆحی خۆی بەرجەستە دەکات و ئەوپەڕی بوونی خۆی دەسەلمێنێت. لەگەڵ ئەم بەرجەستەکردنەشدا بۆ سازدانی جیهانی ئەدەبی. سروشت هاوتای مرۆڤە، سروشت وەك بابەت لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا کەم مامەڵەی لەگەڵ کراوە، یان لابەلا هاتووەتە ناو دەق و پەیوەستێکی قووڵ و قووڵبوونەوەی نییە. بارودۆخ و سەردەم و ڕووداوە جیاجیاکانی کات و شوێن دەبنە هۆی پێکهێنانی نووسەر، بەڵام کە نووسەر لە ڕێگای نووسینەوە گەڕایەوە سەریان، ئەوکاتە بارودۆخ و سەردەم و ڕووداوە جیاجیاکانی کات و شوێن دەبنە ئامانجی نووسین.

ئابی ۲۰۰۸ هەولێر

# قەڵەمکێشی جەلال بەرزنجی بە وشە

شیعری باش وەك كانی پاراو وایە، هەموومان لێی بخۆینەوە کەم ناکات. ئەو دەقانەی هاوچەرخی هەموو ڕۆژ و ڕۆژگارێکن، ئەوەیان وەك ناوەندێك بۆ ئێمە هێشتووەتەوە شیعر برای خوێنی نەهامەتی و کەسەربارییەکانی ژیانە. (جەلال بەرزنجی) لە دڵشکان و ناکامی و نەهامەتییەکانی ژیانی خۆیدا کەمەیەکی کەمی شیعری جوانی کوردی نووسی.

شاعیریشمان هەن کوڕی ڕێزلێگیراوی دەسەڵاتن و ژیانیان لێوانلێوە لە گەشت و خۆشی، دەسەڵات خەرڕۆ و دانەخۆرە و ئالوودەی کردوون بە گەشت و خۆشییەکانی ژیان. بۆشاییەك لە ژیانیاندا نەماوە لە پێناویدا تێبکۆشن و هەوڵی پڕکردنەوەی بۆ بدەن. ناچارن بۆ درێژکردنەوەی هێڵی شیعر پەنا ببەنە بەر دەرەوەی خۆیان و وەك هاندەر و هۆکار، جۆرێك ساختەکاری بەکاربهێنن و هەموو پیرۆزییەکانی خۆیان، کە شیعرە لە پێناو خەرڕۆ و دانەخۆرەی دەسەڵات لە دەست بدەن. مرۆڤیش بێ ڕەچاوکردنی پیرۆزییەك ناتوانێت سەرکەوتوو بژی، کە شیعرش تاکە پیرۆزی شاعیری ڕاستەقینەیە.

تێکۆشان لەپێناو خۆشییەکانی ژیان و تێکۆشان لەپێناو شیعر یەك یەکیان لاسەنگ دەکات. بەشێك، بەشێکی زۆری شاعیرانی ئێمە لەم ڕووەوە شوێنییان وەك شاعیری ڕاستەقینە بەهێز نییە. خەرڕۆ و دانەخۆرە کراون،



خۆشیان هەموو پەیمانێکی نهێنی دەبەستن بۆ خەرڕۆ و دانەخۆرەیی. دەچنە بەر سێبەران، ئەگەر ئەو سێبەرانە سڕیشیان بکەن. زمانحاڵی دەسەڵاتن و دەسەڵاتخواز و بێزراون. بۆ هەمیشەش لە ساتە بۆ نورکەرەکانی بەر سێبەران دەمێننەوە. سێبەری شێریش هەر سێبەرە.

دەقی (بارانی ئەخیلۆس-گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە ٣و٤ی ساڵی ١٩٩٢، ل: ٣٨ تا ٤٦)دا. لە ئەنجامی پاڵەپەستۆی ناخی خۆی و لەیەکدانی هەستەکانی ، وەك دەربڕین لەنادیارییەکی کوشندە بەرهەم هاتووە.

لەم شیعرەدا هێمای دوولایەنی بەکارهێنراوە، شەوقێکی کورتخایەن لە ئەزەلییەتی ژیان وەردەگرێت و دەیبەستێتەوە بە فەزایەکی بێ کۆتایی تا خوێنەر بچێتە ناوی و بە ئارەزووی خۆی ئەم فەزایە فراوانتر بکات و ڕامانی سەرەکی خۆی دابڕێژێت، بە تەواوی جەستەی دەقەکەشدا پەلوپۆ باوێت ، کە بوو بە خوێنی دەقەکەش، پێوانەی لێدانی دڵی دەقەکە بۆی ئاسان دەبێت و ئاستی کاریگەرییەکەشی دەردەکەوێت.

کارامەیی لە بەکارهێنانی ڕاز و نهێنی و لەناو پێشبڕکێی ژیاندا بەدوای ئەزموونی کەسی خۆی گەڕاوە و پرسیاری چییەتی کەسی خۆی لە توێیەکی ئەزەلی و نادیار کردووە. ئەم توێیە لە خودی نووسەر خۆیەوە ناسراوە و دەست پێدەکات و دەیبەستێتەوە بە هێزی ژیانەوە. ئەگەر نەشی بەستێتەوە نزیکی دەکاتەوە لەو هێزەی ژیان بەگەڕدەخات. بەهەر ئاراستەیەکدا ڕۆیشتبێت لەدوا خاڵدا گەڕاوەتەوە بۆ خاڵی بەهرەی بێگەردی خۆی و (شیعربوون)ی کردووەتە ئامانج. وشەکانی ئەم شیعرە لەناو وشەی نامۆ و خەماوی هەڵبژێردراون. شیعری خەماوی و بیرکردنەوە و زمانی کەسی هەموو دەم پەنا دەباتە بەر ترپە

و ئاوازێکی خاو و لەسەرەخۆ، هێزی شیعری خودی خۆی دەخاتە گەڕ و مۆرکی بیرکردنەوەی دادەڕێژێت. لە دوو وێنەشدا، هاودەقی لەگەڵ خانمی کفن دروو کردووە . لە وێنەی یەکەمدا هاودەقی (خەمی بوونیی) و (خۆشەویستی بوونیی) لەگەڵ ناوەندی بووندا بەرجەستە دەکات و داهێنەرانە هاودەقی لە وێنەکەدا دەگونجێنێت و کەرەستەکانی هونەری هاودەقی باش بەکاردەهێنێت ، بەڵام لە وێنەی دووەمدا، سۆزێکی ڕووکەشە و لەم بارەوە تێناپەڕێت بۆ خەمی بوونیی خۆشەویستی بوونیی و کەرستەکانی هونەری هاودەقی باش بەکارناهێنێت. دەقەکە لە (من) و (تۆ)دا سەرچاوە دەگرێت و پەیژە پەیژە گەشە دەکات. پێوەندییەکانی نێوان من و تۆ، بنیادێکی بەهێزی ئەو ئاخاوتننەیە، کە من لەگەڵ خۆیدا دەکات ، یان لەگەڵ ئەوەی لەبوونیدا تواوەتەوە و بووەتە بەشێك لەو. من لەتۆ جیاواز نییە، تۆش لەمن جیاواز نییە، هاوتایی پێکدەهێنن و دەڕواننە ئەزەلییەت و نادیارییەك. ئەو من و تۆیە، من و تۆیەکی ڕۆمانسی نییە و ئاسۆ و دووری خرۆشاوی ناو دەقەکەیە، دانە پەیڤی من و تۆ کولتووری لەمێژینەی شاعیرانی تەسەوفە، بەشێوازی کێش و سەروا بەکارهێنراوە، لە ڕووبەرێکی فراوانی شیعریدا کاری پێکراوە، لە تەسەووف و بەختەوەریی خوداییدا ژیان لە دروشم و دەمامك و گەلحۆیی ڕزگار دەبێت. ئەوەی مایەی سەرنجی قووڵ و سەرسوڕهێنەرە شاعیرێکی ئەمڕۆ لە شیعرێکی ئازاد و شێوە پەخشاندا ئەم کولتوورە کلاسیکییە بەتاو و تینێکی داهێنەرانە دووبارەی بکاتەوە و باش بەکاری بهێنێت .(منیش قاچێکم گێچاوی ڕۆژئاوا، ئەوی ترم شمشاڵی ڕۆژهەڵات).



شاعیر لەشیعرەکەیدا هاوولاتییەکی دیاری ماندووە و هەستی نامۆیی ئاوارەی کردووە، ئەم هەستە نامۆییەی بە گەورە دەخاتە بەرچاو و هەستی نوێبەخشی لێ بەرهەم دەهێنێت، کە بابەتێکیش هەڵدەبژێرێت بۆ ئەزموونکردن، یان بابەتێك ئەو هەڵدەبژێرێت بۆ ئاشکراکردنی، لە نیازی خۆیدا پێی وایە لەم ئەزموونکردنەدا دەگات بە ڕەگ و ڕیشە، نووسینە بەرهەم هاتووەکە خودی ڕەگ و ڕیشەکەیە و شاعیر لەسەر هەستەکانی خۆی تاقی کردووەتەوە. ژیانی نووسین بەستراوە بەو ژیانەی، کە کەسی نووسەر ئەزموونی کردووە، یان کەسی نووسەر بۆشاییەك لە ژیانی ئەزموونکردوویدا هەبووە و هەوڵ دەدات لە ژیانی نووسیندا تەواوی بکات و شێواز و فۆرمێکی نیمچە بەختەوەری پێ بدات. ژیانی ناو نووسین، ژیانێکی پاڵەوانانەیە و لە ناوەندی خودی خۆیدا چاودێرە و قووڵایی دەپشکنێت، کە ناوەندی نووسینە. بە دوای گفتوگۆ و خولیای ئاشنا و ڕۆشنا نزیکەکانی دەگەڕێت و بەدڵ دەیاندوێنێت و دەیانکات بە ئاکارە سەرەکییەکانی نووسین.

شیعرەکە کەمێك سۆزدارە، لە دەربڕیندا ڕوون و ڕەوانە. لە هەمان کاتدا زۆر قووڵە و ڕۆشنبیریی فراوان و ڕۆحانییەتیان لە خوێنەر دەوێ. دەکرێ وەك دەق و شێوازی (سانایی خۆبەدەستەوە نەداو) تەماشا بکرێت. بابەتەکەی بە دەوری ئەزەلییەت دەسووڕێتەوە و لە ڕێگای خەمی بوونیی و خۆشەویستی بوونیی تاسەی بۆ نادیاری مرۆڤ و گەردوون دەردەبڕێت، کە پێشبڕکێی خەمی بوونیی و خۆشەویستی بوونیی پێشبڕکێیەکی بێ کۆتایی و ئەزەلی و نادیارە. دەبێتە بنیادی شوێن و کەسی ، یان جێگای بنیادی ئەزەلییەت دەگرنەوە و دەبنە واتا و لە زیندووەتیدا ڕۆڵی ئێستێتیکا دەبینن ، یان خەمی بوونیی

دەکاتە خاڵ و خۆشەوستی بوونیی بەدوایدا دەهێنێت و دەیکاتە هێڵ ، هەردوو خەم دەکاتە تابلۆ و ئامادەی دەکات بۆ پیشاندان ، هەروەها بەهۆی ڕۆحانییەتی زمانەوە وادەکات وشە مانایەکی ئەزەلی و نادیار ببەخشێت و گواستنەوەیەك بێت بەرەو (ڕەگەزی کتوپڕی). ڕەگەزی کتوپڕی لە سروشتی ڕاستەقینەی خۆیدا ئەرکی شێواندنی کپی و هێمنی دەروونی خوێنەر نییە، بگرە داڕشتنەوەی کپی و هێمنی دەروونی خوێنەرە و هونەری ڕوونکردنەوەی ژیانە بەمانا ئەزەلی و نادیارییەکەی، کە ژیان کۆمەڵێك پارچەی لێك نزیکن و بینایەکی ڕوون و ئاشکرا دروست دەکەن و خەمی بوونیی و خۆشەویستی بوونیی لە بارێکی ناخەکی دەخرۆشێنن. ئەم خەمە بوونیی و خۆشەویستی بوونییە لەم دەقەدا لە فەزایەکی بێ کۆتایی و نادیاریدا خرۆشێندراون و لێك گرێدراون.

زمان لە ڕۆحی نووسەر دەست بەکارە و لە شیعردا بە جۆرێکی تایبەت بەکاردەهێنرێت. نهێنییەکانی ڕوانین و گرفت لە تێگەیشتن و لێکدانەوەی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی لە زمانی پەخشان بەهەموو لکەکانییەوە بەکار دەهێندرێت، چونکە زمان لە شیعردا هێما و سروش وەردەگرێت تا ئەوپەڕی سنووریش پەیوەستدار دەبێت بە سۆز و یادگاری ئەزموونی ژیانی کەسیی شاعیر، هەروەها بەهۆی وێنەوە هێما و سروش بەبیر و بیرکردنەوە دەدات و لە زەیندا وێنەی تایبەت دەخولقێنێت. لە هەمان مەبەست لە خاڵێکی قووڵتری (سەرنجی هەستی)دا وێنە بیر و هۆش تاو دەدات.

وێنە لەنێوان کۆمەڵێك پێوەندی جیهانی پڕ هێزی ناوەوەی شاعیر و وێناکردنی ژیانی کەسی شاعیر دەخولقێنێت و هەڵچوون وریا دەکاتەوە. لەم



بار و بوارەدا وێنە بە هۆی پیتی بانگکردن دەنگی وێنەکە دەگوازێتەوە. وەك ڕاز و نهێنی بوون دەکاتە ئاوێنەیەکی جیوە ئەفسوونی، وەك هاوارێك ئازاری هەموو کۆستێکی تێدا کۆدەکاتەوە و دەری دەبڕێت. لە پاشاندا دووبارەی دەکاتەوە تاڕادەی بێزارییەکی سامناك و کوشندە. وێناکردنی کەسی و خەیاڵی لە چالاکی خۆیاندا بەردەوام دەبن. ئەو هەستە ئێستێتکییەمان لادروست دەکات، کە شاعیر هەوڵی ڕایەڵکردنی داوە، بەڵام دەبێت ئەو هەستە بەتەواوەتی لە ڕەوتی ڕستەکاندا بڕەخسێندرێت، کە بەهای شیعرییەتی تێدا پەنهانە.

شاعیر بەو شێوەیە دەنووسێت، کە پێی ئاسوودەیە و پێگە و ڕێگەی خۆی بۆ ئاشکرا دەبێت. خوێنەریش لەم پێگە و ڕێگەیەدا لە هەقیقەتی ڕەهای شیعرییەتدا لە خولیاکانی خۆی نزیك دەبێتەوە. گیانی شیعرییەت لە ڕێگای باش بەکارهێنانی زمانەوە دێتە ناو جەستەی شیعر. لادانی زمانی لە شیعردا گونجاوە، جۆرێکە لە بیری داهێنەرانەی شاعیر. ئەم بۆچوونە تاڕادەیەك بۆچوونێکی لەبارە، بەڵام شیعر پێشێلکردنی ڕێزمان نییە. لە سنووری ئەم نیمچە لادانەدا تێناپەڕێت. لەم دەقەدا زمان بەهێز نییە، هەست بەهێزترە. هاوسەنگ نەکردنی (زمان) و (هەست) جۆرێك ناتەبایی بە بنیادی شیعرەکە داوە، هەروەها وێنەیەکی لە دوو شوێندا دووبارە کردووەتەوە، بێ ئەوەی ترپە و ئاوازێك، یان دۆخێکی زەینی بگۆڕێت. لە شیعرێکی وا یەکبابەتی و یەکگرتوو و هێماداردا، دووبارەکردنەوەی وێنە ترپە و ئاوازێکی بە جۆش بە بنیادی شیعرەکە نادات، بگرە تووشی هەناسەبڕکێشی دەکات، هەروەها ڕەنگ و ڕووی سروشتیش لە جیهانبینیی شاعیردا دەرکەوتەیەکی تایبەتی نییە.

**بینینی ئاسۆیی لە خەمی بوونیی خۆشەوستی بوونیی، کە بە خوڕ بەدوای یەکدا دەڕژێن و دەڕژێنە ناوەندێك، کە بوونێکی دیار و دەستنیشان نەکراوە لە خەمی بوونیی و خۆشەویستی بوونیی . بگرە بوونێکی نادیار و ناوەندێکە وەك ئەزەلییەت و نادیاری، کە ڕامانی سەرەکی دەقەکە بەناو هەموو جەستەی بووندا تانوپۆی چنیوە و دەبێتە ڕۆژ و ڕۆژگار و ڕاز و نهێنییەکی بزر، کە ڕۆحانییەتی بوونەکانە و شیعرییەتی دەقەکەیە. دەقەکەش لە ژیانی ئاسایی خۆیدا ئالوودەی تەنیایی خۆی بووە. وەك ئالوودەیی بەتەنیا (لەدایکبوون) و بەتەنیا (مردن) و پڕبوو لە هەموو دڵشکان و ناکامی و نەهامەتییەکانی ژیان.**

**ئەیلوولی ٢٠٠٨ هەولێر**

## قەڵەمکێشی عوسمان شەیدا بە وشە

ئەو کەسەی لە دڵەوە دەنووسێت، بەرپرسیاریەتی لە ئاست زمان و خوێنەراندا بە هێزە و وەك مەترسییەکی بکوژ تەماشای کردەی نووسین دەکات. ئەگەر نووسینەکەی هێزی تێدا نەبوو، ئەوە کات دەیکوژێت و لە ناوی دەبات، ئەگەریش هێزی تێدا بوو، ئەوە کات ژیانی پێدەدات، ژیانپێدانی نووسین بە نووسەر، هەستکردن بە بەرپرسیارەتی نووسینە.

یەك لە خاسییەتەکانی (عوسمان شەیدا )ئەوەیە مانا لە وشەدا چڕ دەکاتەوە تا ئاستی درەوشانەوە و جیهانبینیییەکی بەتین. وردەکاری و هەستیاریی پێ گرینگە بۆ ئەوەی هەستی ماناداری و ئومێدی بەتینی ژیان دەربرێت. لە شێوازدا بەرزی و نزمی نییە، بەڵام لە هەڵبژاردنی بابەتدا دووچاری بەرز و نزمی لە( ڕێکخستن )و (وێنە )دا دەبێتەوە، هەموو شێوازەکانی شیعریش بۆ گەیشتن بە شێوازی نوێبەخشی و شکۆی نوێبەخشی بە خولیا و پێویست دەزانێت. ڕەنگە شیعر لە ڕۆژێك و دانیشتنێکدا ڕەشنووسی یەکەمی تەواو ببێت و دەستکاری و پێداچوونەوەیەکی کەمی بوویێت، بەڵام گەڵاڵەکەی لە یەك ڕۆژدا نەخەملێوە، یان شیعرەکە هەستپێکردنی یەك ڕۆژ و ڕووداوێك نییە، جۆرێك کار لەسەر کەسایەتی خۆکردنە و کەوتووەتە بەر کاریگەریی چەندین ڕووداوی جۆرا و جۆری دوور و نزیك. وەك لە خاڵەوە دەستپێکردن بۆ هێڵ و لێك گرێدانی پارچەکانی



بینین. لە ئەنجامی لێك گرێدانی پارچەکانی بینینی خۆی، وێنەی بوونێکی تەواوی خۆی دەبینێتەوە. وێنە لە کاری ئەدەبی داهێندراودا بە هیچ حاڵ و بارێك و توندڕەوییەك ناشێوێندرێ و حوکمی پێشوەختەی لەبارەوە نادرێت. وێنە لە حاڵ و باری هێمن و نەرم بیرکردنەوەدا وێنا دەکرێت. شاعیری ڕاستەقینە هەمیشە بەشێوەی ئاشتیخوازانە و لێبووردە دەژی و نووسین لە دیدی ئەودا کردەیەکی زۆرکەسییە لەنێوان ئەدیب و ئەدەبدا. خوێنەر لەو وێنەیەدا هەست بە ئارامی دەکات، کە لە حاڵ و باری هێمن و نەرم بیرکردنەوەدا بەرهەم هاتووە. نەك لە حاڵ و باری دۆخی شێواودا. شیعر ڕوو ناکاتە جەماوەری گشتی، بگرە ڕوو دەکاتە جەماوەرێکی تایبەت، کە دەستەبژێرە و ناچێتە پاڵ هزر و هونەری باو. بێ هیچ ئەلفوبێیەك ئەو خوێنەرەی، کە بەرهەمەکەی بۆ نووسراوە، وێنەی خۆی تێدا دەناسێتەوە. ئەگەر بۆ جەماوەری گشتی نووسرا، ئەوە جەماوەری گشتی وێنەی خۆی تێدا دەناسێتەوە. ئەگەریش بۆ تایبەت و دەستەبژێر نووسرا، ئەوە خوێنەری تایبەت و دەستەبژێر وێنەی خۆی تێدا دەناسێتەوە. ڕەنگە هەردوو جەماوەریش لە یەك ڕووداودا ژیابن و هەریەك ڕووداوەکە بەئاستی تاسە و بیرکردنەوەی خۆی بناسێتەوە و پێناسەی بکات. بەهۆی نووسینەوە چ نووسینی داهێندراوبێت، یان نووسینی ئاسایی، پێوەندی مێژوویی لە نێوان جەماوەری گشتی و تایبەت و دەستەبژێرەوە دروست دەبێت و هاوکاری یەکتری دەکەن بۆ ناسینەوەی وێنەی کەسیی خۆیان. پێوەندی و گفتوگۆی جەماوەری گشتی لەگەڵ شیعردا لە چوارچێوەیەکی گشتیدا دەسووڕێتەوە، هەروەها پێوەندی و گفتوگۆی جەماوەری تایبەت و دەستەبژێر لە چوارچێوەیەکی تایبەتدا دەسووڕێتەوە.

هەر نووسینێك بانگەشەیەكە بۆ پێشاندانی وێنەیەك، ئەو وێنەیەی نووسین لە توانایەكی تایبەتدا لەگەڵ خۆیدا دەیكێشێت و دەیهێنێت.

هەوڵدانی خوێنەر بۆ ناسینەوەی وێنەی خۆی، كارێكی بێ هوودە نییە، بە پێچەوانەوە دەبێت نووسین دەرفەتیان بدات بۆ ناسینەوەی وێنەی كەسیی خۆیان و ئەو خوێنەرەش خۆشبەختە وێنەی خۆی لە كارێكی ئەدەبیدا دەناسێتەوە. توخمی ئیلهامبەخش لەم ناسینەوەیەدا چییە. ڕەنگە بارێكی زۆر تایبەت بێت و تەنیا لە چركەی چەشەی خوێندنەوەدا هەستێكی شاراوە دەری بخات و بەرزی بكاتەوە بۆ ئاستی بینین و ئاشكرا بێت.

ئەگەر خوێنەر وێنەی خۆی لە كارێكی ئەدەبیدا ناسییەوە، ئەوە بەرهەمهێنەرەكە زەینی بەرهەمهێنانی لەبارەی ئەو بەرهەمەی بەرهەمی هێناوە، بەهێز دەبێت و بەرهەمەكەشی بەرهەمێكی خاوەن ئاراستەیە. ناسینەوەی وێنە كردەیەكی هەستیاری دەوێ، كە پێی دەوترێ بەرپرسیاریەتی نووسین لەبارەی نووسینەوە.

ژیان هەستێكی لێڵ بەو كەسە نادات هەموو ڕۆژێ پرسیاری خاوەن ئاراستە لە مەڕ ڕاز و نهێنی دەكات و گیرۆدەیە بەدەست سەرسامییەكانی گەردوون و ژیری و دانایی پێغەمبەر و داهێنەرەكان. لەو حاڵ و بارەدا كەسی پرسیاركەر و دڵگەرم بە سەرسامییەكان بووەتە بەشێكی زیندوو و كارا لە ڕاز و نهێنییەكان. شاعیر پەی بەو هەموو ڕاز و نهێنییەی ژیان دەبات لە دۆخگۆڕینی بۆ زمانی شیعری و دواتر بۆ شیعرییەت پێدانی. بەهای ڕاستەقینەی پرسیار، وەڵام نییە ،خلیسكانە لە وەڵام. پرسیار لە سەر پێشكەوتنی مرۆڤ و بەرپرسیارەتی دادەمەزرێت. لە دەقی( دوو پارچە شیعرـ گۆڤاری نووسەری كورد ، ژمارە٣ ی



ساڵی ١٩٨٥ ، ل: ١٨٧تا ١٩٠)دا ژیان بە تەواوی پێكهاتەی خۆیەوە بە گەرم و گوڕی هەیە و ژانی بەرپرسیاریەتی بەهێز و بە تەوژمە بۆ دامەزراندنی ژیانێكی خۆشگوزەران. بە كارەسات و ئەنجامەكانی جەنگ دڵگران و نیگەران و كەسەربار و ورووژاو بووە و لێی دوور كەوتووەتەوە ، وەك جۆرێك هەڵاتن لێی هەڵاتووە. جەنگ مەینەتی ئەوی وەك شاعیرێك گران كردووە و ئەمیش لە ئەنجام و تاوانەكانی جەنگ نابوورێت. بایەخی بە دوو تەوەری سەرەكی داوە. ئەوانیش خۆشەویستی و مردنن. خۆشەویستی - بوون، مردن - نەبوون، هەروەها بایەخی بەدیاریكردنی شوێن داوە. شوێن لە دیدی ئەودا هەمیشە نیشتیمان بووە و خواستییەتی ژیانێكی خۆشگوزەران و جێگیری تێدا بەسەر بەرێت . لە هەندێك حاڵ و باریشدا دەبێتە گۆڕ.

لەبارەی زمانی شیعرەوە یەكەمین شت كە هەستی پێدەكەین ترپە و ئاوازە، ترپە و ئاوازەكی زرینگەداری خولقاندووە. وێنە لە سەر بنەمای دووبارەبوونەوەی زرینگەدانەوەی ترپە و ئاوازەكەدا بنیاد دەنێت. هەندێك وشە بەناخی ڕۆحی شاعیرەوە دەلكێن و لەگەڵ درێژبوونەوەی ئەزموونیدا درێژ دەبێتەوە و دووری و ئاسۆی دیكە دەكاتەوە.

شاعیری ڕاستەقینە لە ماوەیەكی دیاریكراوی تەمەنیدا شیری شیعر دەخوات و دواتر بۆ هەموو تەمەن بە خوێنیدا هاتوچۆ دەكات. لەو پێناوەشدا ڕەنج دەكێشێت. كەسێكە بەردەوام لەناو كۆمەڵگە بە گشتی و ناوەندی ئەدەبی بە تایبەتی دۆخێكی نالەباری بۆ دروست دەبێت و خۆی بە بێگانە و نامۆ دەزانێ، دەوروبەریش وەك بێگانە و نامۆ تەماشای دەكات، لە پێناو گەشەپێدانی كولتوور و زماندا لە دڵەوە تێدەكۆشێت و ئەو بێگانەیی و نامۆییەی لەم تێكۆشانەدا

دەرەوێنێتەوە، دوای بەسەرچوونی سەردەمێك بەسەرنجدان لە گەشەپێدانی کولتوور و زماندا دۆخێکی لە باری بۆ دروست دەبێت. دۆخی شیکردنەوەی ڕۆشنبیری، لە ئاستێکی گەورەمەندی دەبیینێت و ئەو بینینە بە پلەیەکی شیاوی دەگەیەنێت. ئەوە گەشەی کولتوور و زمانە شاعیری ڕاستەقینە و کۆمەڵگە لێك نزیك دەخاتەوە و ئاشتیان دەکاتەوە تارادەی یەکخستن لە (ڕێکخستن )و( وێنە)دا و ژیانێکی تەواو تازە و بەخشندە پێکدێت. بەردەوامبوونی گەشەی کولتوور و زمان بەهێزتری دەکات. خوێنەریش وەك خاوەن بەهرەیەکی تایبەت لە دیدارەکانی شاعیر و کۆمەڵگەدا گوێڕایەڵ و بەهرەمەند دەبێت.

تشرینی یەکەمی ٢٠٠٨ هەولێر

## قەڵەمکێشی سەلاّح شوان بە وشە

ئەو کاتەی نووسین دەبێتە تاکە پەنا و چێژی دەگمەنی نووسەر، نووسەر بە دۆخی نووسین گەرم دادێت و لەبارەی نووسینەوە کەسایەتییەکی بەهێز و سەرکەوتوو و گەشبینی دەبێت. لەو بەهێزی و سەرکەوتوویی و گەشبینییەیدا دەبێت هەڵسوکەوت لەگەڵ تەنیاییدا بکات و پێوەندییەکی هاوشێوە بسازێنێت، پێوەندی نووسین و تەنیا بیرکردنەوە لە نووسین و لێکدانەوەی هۆشیارانەی نووسەر بەکاتی نووسینەوە. لە کاتی نووسیندا هەیکەلی گشتی نووسین ڕوون نییە. سەرەتای چییە و کۆتایی بە کوێ دەگات. لە درێژە و کردەی نووسیندا وێناکان دەگۆڕین و ئاڵوگۆڕی بنەڕەتییان بەسەردا دێت. بزاوت و جووڵەی ئەو ڕووداوانە ڕوودەدەن، کە لە مێشکت نیشتوون و دەبنە ڕووداوی کاتی نووسین. جێگۆڕکێ بە هەستەکانت دەکەن. ئەو گۆڕانانەی لە کاتی نووسیندا ڕوودەدەن و دێنە ناوەوە گرینگترین توخمی نووسینن.لەو حاڵ و بارەشدا هێشتان نازانیت لە تەواوی نووسنیەکەدا چی ڕوودەدات. بابەتی سەرەکی چییە و شێوازی نووسین چی دەبێت، بەلاّم هەستی نووسین بەردەوام و بەتەوژم شەپۆل دەدات. لە دەقی (تێکەڵبوون-گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە ٥ی ساڵی ١٩٨٠،ل: ٦٥ تا ٦٨)دا هەبوونی پێوەندییەکی ناوەندی لەنێوان



وێنەکاندا بووەتە یەکخستنی پێکهاتە و ناوەرۆکی دەقەکە و زانینی لێکدانەوە، هەروەها پەرەپێدانی پێوەندی ڕەگەزی زمان و داڕشتن پێداگری و کۆششێکی زۆری ویستووە و چووەتە ناو وردەکارییەکان بۆ بەرهەمهێنانی دەقێکی دلێر و پڕ لە شەپۆل. لەم حاڵ و بارەدا دەق ئاکامی ڕێکەوت و چرکەساتی کورتخایەن و دۆزینەوەی لە ناکاو نییە، بگرە مەبەستە و لە ڕوانگەی تایبەت و جیاوازدا بە ئاکام گەییوە و بەرهەمی حاڵ و باری گونجاو و شیاوە. هەستێکی بەجۆش لە حاڵ و بارێکی گونجاو و شیاودا پەرە پێدەدات و دەبەخشێ. خوێنەریش بەناو پێکهاتە و ناوەرۆکی ڕۆدەچێت و گۆشەی ئاکامێك دەگرێت و زەمینەی بیرکردنەوەی بەهرەدار دەکات. شیعر لە کاناری مانەوە و نەمریی خۆیدا هەمیشە ڕۆڵی لە هەقیقەت و خەیاڵ بینیوە و هەمیشەش دەیبینێت و بە تەواوی وشە هەستییەکان، کە مرۆڤ تامەزرۆییان دەکات. چەمکی هەقیقەت و خەیاڵ تیژ دەکات و چێژی دەگمەن و تەنیایی لە زەینمان لێك نزیك دەکاتەوە تاڕادەی یەکگرتنی نێوان شیعر و شاعیر.

ئەم شاعیرە لە ١٩٤٧/٤/١٥ لەدێی مام ڕەش، ناوچەی شوان لەدایکبووە، ئەو ناوچەیە، ناوچەیەکی دەشتایی بەپیتە، لەئەزموونی نووسینی شاعیردا کەمتر باسی چیاو بەفرو.....تاد، کراوە، بگرە بەخەملێوی وەك شێوەیەکی دەربڕین لەنوختەی بینینو بەخۆدا باسی ماتیی دەشتایی کراوە.

شیعر خۆنووسی و سەربردە و تۆماری ڕاز و نهێنی مرۆڤایەتییە و شاعیران بە تواناوە توانایان لە ناویدا بەکاردەهێنن و هێزی ڕۆحییان دەخەنە سەر زەویی واقیع و مێژوو، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ هێما و ئەفسانە، ئەو هێما و

ئەفسانەیەی بوونەتە هۆی دڵەڕاوکێی زۆری مرۆڤایەتی. شیعری ئەم شاعیرە خۆنووسی و سەربردە و تۆماری ڕاز و نهێنی تاکە کەسی خۆیەتی و بەردەوام خۆی وەك کەسی یەکەم لە بنیادی شیعرەکانیدا بوونی پەخش دەبێتەوە. هەندێك جاریش بۆ پەیوەندی کردن بە ئەوی دیکە و لێك نزیکبوونەوەیان. لە هێما و وێنە و لێکچوواندن و پێکچوواندن. وەك هۆکار و هەوڵدانێك سوود لە دەنگە بەرز و نزمەکانی دراما وەردەگرێت.

ئەم شاعیرە کاتێکی زۆری لە جوانترین ساڵانی تەمەنی خۆی بۆ شیعر تەرخان کردووە و لەو خۆتەرخانکردنەشیدا ئەزموون و شارەزایی پەیداکردووە، لە پێکهاتەیەکی نوێبەخشدا کردوویەتییە خاڵێکی باشی پێگەیشتن لە زمان و شێواز و تەکنیکدا. تۆڕێکی وردی بۆ زمان و شێواز و تەکنیکی خۆی چنیوە و گۆشەگیری هەڵبژاردووە. گۆشەگیریش باشترین ماوەی ڕەخساوە بۆ نووسینی دەقی قووڵ و فرەدەنگ و گومانکردن لە واقیعی بوونی جیهان. فەزای واقیع بە گومان دەورەدراوە. شیعر ڕێچکەیەك لەو گومانە وەردەگرێت و دەچێت فەزای ژیان فراوانتر دەکات و پەیوەستت دەکاتەوە بە وردەکارییەکانی (زمان) و (شێواز) و (تەکنیك). قووڵبوونەوە و خەمڵینی ئەزموون مژدەبەخشە و پەیمان دەدات بۆ ئەو هەستە ئەدەبییەی، کە لەلات گەڵاڵە بووە، ڕاهێنانی لەسەر بکەیت و هەوڵی ئاشکراکردن و نووسینی بدەیت.

نوێبوونەوە و گۆڕان لە زمان و شێواز و ترپە و ئاوازدا تیشکدانەوەی بنیاد و ڕۆنانە و تایبەتمەندیی شیعری نوێبەخشیان پێدەناسرێتەوە، فەرامۆشکردن و پەراوێزخستنی نوێبوونەوە و گۆڕان لە زمان و شێواز و ترپە و ئاوازدا لێسەندنەوەیەکی سەرچاوەییە لە نوێبەخشی و داخرانی فەزا و کوشتنی



سەدای خەیاڵە. نوێبوونەوە و گۆڕان لەزمان و شێواز و ترپە و ئاوازدا ئەو توخمانەن، کە لە بەرهەمی چاکترین شاعیرانی ئێمەدا جوانخوازی و ئاکار و بوونێکی شیعرین. لای ئەم شاعیرەش ئەم توخمانە تایبەت و تایبەتمەندن. ئەزموونیان بەپیت و دەوڵەمەند کردووە.

ئەوەی جێگای سەرنجی پەسندە لە دامێنی هیچ دەقێکیدا تێبینی و پەراوێز نەنووسراوە. ئەوەش تەندروستی تەواوی گیان و ناوەرۆکی دەق و پێگەیشتنی نووسەرە لە هونەری نووسین. لەئاستی بیروڕا و بیرکردنەوەشیدا ئەشقی خۆی لە ئێستێتیکای مانا و سروشی مانا و ترپە و ئاواز و دنیایەکی دەست پێنەگەیشتوودا قووڵ کردووەتەوە.

کاری ترپە و ئاواز لە شێوازدا ئەوەیە پێکهاتەی وێنە ڕوون بکاتەوە. وێنە هەقیقەتێك لە ژیان دەخاتە ڕوو، یان خەیاڵێك لە ڕێگای وێنەوە دەکاتە هەقیقەت و فۆرمێك دادەڕێژێت و دایدەمەزرێنێت. وێنەش بەستراوەتەوە بە تێگەیشتنی چاو لەناو تێڕوانینی خۆیدا و بریتییە لە هێمایەك، کە دەربڕین لە هێماپێکراو دەکات. زمان هێمایە و ژیان بە هەموو وەرچەرخانەکانییەوە هێماپێکراوە.

زمان لە شیعری (سەڵاح شوان)دا هەموو شتێکە و وەك هەموو شتێکیش دەمێنێتەوە، دەبێتە پێوەندییەکی ناوەند لە نێوان وێنەکاندا. ڕۆشنبینی ڕەگی وشە دەبینێت و لە یەك دۆخدا نامێنێتەوە. وێنەش داخوازییە دەروونییەکانی شاعیر بەرز دەکاتەوە بۆ ئاستی بینین، ئەو داخوازییە دەروونییانەی دەبێتە جیهانبینی و شاعیر خەونی پێوە دەبینێ، یان دەبێتە هۆی خەونبینینی، یان لە خەیاڵیدا پێی گەیشتووە و لە ڕەگە گشتییەکان لای دەدات و دەیبەستێتەوە

بەرەگە تایبەتییەکانەوە. لەڕووی زمان و شێواز و تەکنیکــەوە دڵنیــابوونێکی شیعری بە شاعیر دەدات. ئەو داخوازییە دەروونییەی، کــە لــە خــەیاڵی پێــی گەیشتووە، لەم حاڵ و بارەدا خەیاڵیش ئیش دەکات بۆ ئەوەی ببێتە بەشــێکی بچووك لە واقیعی خاوەن بزاوت و جووڵە و کاریگەردا.

شاعیر لەسەر ئاستی بوون لە هەناوی خۆیدا دەژی و هەوڵ دەدات بزانێــت و بدۆزێتەوە. شیعریش هەنگاو بەرەو بەرزایی بە واقیع دەنێــت و ماناشــە بــۆ بوونی پڕ بزاوت و جووڵە و کاریگەری، دەیگەیەنێت بە بوونێکی ڕوون، بوونی ڕوون بەئاسانی ناکرێت بە نووسین، بەڵام کێڵگەیەکی بە پیت و بە هاتــە بــۆ پەروەردەکردنی هەستیاری نووسین. لەگەڵ ئــەوەش دەنگدانــەوەی ئــەم بوونــە ڕوونە لە هەناومان دەبیستین.دەبێت لەگەڵ ئەم دەنگدانەوەیــەدا هەڵبکــەین و بڕۆین و هەوڵی زانین و دۆزینەوە بدەین، چونکە دیــوی هەقیقــەتی نووســین و مرۆڤــە. نووســین و مــرۆڤ زوو بــە واقیــع ناگــەن تــا پــەی بــەداو و ڕایــەڵ و دەرهاوێشتە هاوچەرخەکانی نەبەین. واقیــع هێنــدەی ئــەوەی نووســین مانــای دەداتێ، لەوە زیاتر خۆی هەستیاری خۆی پەروەردە دەکــات و مانــای هەیــە و دەزانێت و دەدۆزێتــەوە. شــاعیر لــە زانــین و دۆزینــەوەی جیاجیــادا لــە ژیــان ڕادەمێنێ و دەکەوێتە ناو کۆچێکی ئەزەلی و چــاو دەگێــڕێ و ورد دەبێتــەوە و دەزانێت و دەدۆزێتەوە، بەڵام قەناعەتی تەواوی بە زانین و دۆزینەوەکەی نایەت. دووبارە کردەکە دەست پێدەکاتەوە، لە دەستپێکردنەوەیدا هێڵێکی دیاریکراوی نییە. هەوڵ دەدات لە ڕامانێکی گەردوونیدا بۆ ژیان ڕۆحێك سۆراخ بکــات و بەرهەم بهێنێت لەسەر زەوی (هەقیقەت) و (نووسین) بمێنێتەوە.

کانوونی یەکەمی ٢٠٠٩ هەولێر

# قەڵەمکێشی دڵشاد مەریوانی بە وشە

خودا ئەو هێز و بەهرەیەی بە شاعیر داوە لە ڕوانگەیەکی تایبەتدا لە خۆی و لە ژیان بڕوانێت و ئەو دیاردەیە بە پێویست بزانێت، کە شیاوی خستنەڕوو بێت. شیعریش هەمیشە هێمای ویژدان و ئێستێتیکای پەسندکراو بووە، هێمای ویژدان و هێمای ئێستێتیکا هەمیشە خودێکی پڕ شیعر بەرهەم دەهێنن. شیعری فرەدەنگیش لە ئەنجامی لێکدانی هێمای ویژدان و هێمای ئێستێتیکادا بەرهەم دێت. هەندێك جار دەقێکی ڕەوا و فرەدەنگ دەخوێنینەوە وا هەست دەکەین ئێمە لەناو دەقەکەدا ڕسکاوین و گەشە دەکەین، دەقەکەش لەناو ئێمەدا دەڕسکێ و گەشە دەکات. هاوتایی و هاوسەنگی و هاشێوەیی دروست دەبێت. دووری و ئاسۆیی بەختەوەرییەکی ڕەها دەکەینەوە. لەم بار و بوارەدا وا دەزانین ئێمە دەقەکەمان ڕسکاندووە و دەقەکەش وا دەزانێت ئێمەی ڕسکاندووە. یەك لەناو ئەوی دیکەدا نیشتەجێین و تواناکانی خۆمان نووسیوەتەوە و هەوڵ بۆ گەرمکردنی ئێستێتیکا دەدەین لە پێناو گۆڕینی دۆخی ئێستێتیکی. ئەو هێز و بەهرەیەی مرۆڤ لەگەڵ بوونی پێی بەخشراوە، بۆ ئەوەیە ژیانی لەسەر ڕێك بخات و وەك کەسێکی تەواو جیاواز و نموونەیی لەو کار و کردەوە و داوایانەی سەرکەوتوو بێت، کە پێشتر بیری لێ کردوونەتەوە



و لەناخڕا کۆششی بۆ کردووە. بە هەموو توانایەوە وابەستەیەتی. کلیلێکە بۆ ئەو ڕێکخستنەی، کە ژیانی سەرکەوتووی پێ بەڕێوە دەبات.

لەم بار و بوارەدا هەموو تواناکانی و ئەو هێز و بەهرەیەی پێی بەخشراوە. وەك کردارێکی ڕۆحی بەشداری سەرکەوتنی دەکەن و یارمەتی دەدەن بۆ ئەوەی بزانێت لە کوێ دەست پێدەکات و لە کوێش کۆتایی دێت، لە چیش دەست پێدەکاتەوە. دەقی ڕەوا گوێ لە کەس ناگرێ و بەقسەی کەسیش ناکات، تەنیا گوێ لە دڵی خۆی دەگرێت و بە قسەی دڵی خۆی بەڕێوە دەچێت. بەشێکی زۆری بنیادی دەقی (دڵشاد مەریوانی) لە یەك بەش و یەك بابەت پێکهاتوون، بەڵام لە یەك بەش و یەك بابەتەکەیدا جووڵە و بزاوت زۆرن بۆ دەستنیشانکردنی بنیادەکە و ڕامانی سەرەکیش شیعرییەت بە تەواوی زەمینەی پێکهاتەکان پەخش دەکات و جووڵە و بزاوتەکان سروشتی شیعرەکە دەگۆڕن بۆ دروستکردنی هاوئاهەنگی پێوەندی دەرەوە و ناوەوەی دەقەکە، پێوەندییەکان دەبنە هۆ و هۆکار و ناوەند، شتەکان ڕادەکێشێتە ناوخۆی. ناوەند سەرزەمینی واقیعە و مرۆڤ تێیدا ڕۆڵ بەسەر زەمین دەدا.

لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا زمان شکۆدارییەك بە شیعر دەدا. بەوەی دەربڕینەکانی ساکارن و دوورن لە ئاڵۆزی و لێڵی و ڕستەی سەرلێشێوێنەر و داخراو. ڕستەکانی کورتن و باش دەربڕین لە خود و دەوروبەر دەکەن و کراوەن، دوور و درێژ و بێزارکەر نین، بەهێزی (هەستی زمان) جیاکاری شێواز و جیاکاری زمانی لە هەڵبژاردنی وشەدا وەك تایبەتمەندییەك پیشان دراوە، ئەمەش لە بار و بواری نووسیندا بابەت ئەم کردەیەی هەڵبژاردنی وشەیە دەسەپێنێت و ڕەوتی نووسین درێژ دەکاتەوە. بە هەموو بوونیەوە ئاگای لە ڕاز و

نهێنی و نەمریی نەتەوە بووە و لە گەشاوەترین ئاستی ئەشقدا، ئەم ئاگاییيەی بە هەقیقەتی ئامانج و مەبەست گەیاندووە، کە دیارترین خەسڵەتی گەشە و ڕسکانی ئەویان پێکهێناوە بەرەو جۆرە ئەدەبێك، کە ناوی بە ڕیالیزمی نوێ و ئەدەبی شۆڕشگێڕی، یان بەرگری، یان پابەند بە داوا و ویستی کۆمەڵگەوە ڕۆیشتووە، بەڵام بەشێوەیەکی زانستی خاڵە پێکهێنەر و جیاواز و دامەزرێنەرەکانی دەستنیشان نەکراوە و ناسنامەی تایبەتی وەرنەگرتووە و بەتێکەڵی ماوەتەوە.

شاعیر پێویستە نە مارکسی بێت، نە نەتەوەیی، نەبڕواداری ئایینی. پێویستە بە تەنیا کوڕی هەتاو بێت و کلۆڵیی ناوچە هەژار نشینەکان بەرجەستە بکات و حوکمڕانی داپڵۆسێنەرانەی دیکتاتۆر لە دید و دیدگایەکی ئێستێتیکی تاقی بکاتەوە و کرۆکی بیرکردنەوەی کوڕی هەتاویی تێدا بورووژێنێت، کە بیرکردنەوەی بنەڕەتییە و هۆ و هۆکاری سەرەکی و گەشانەوەی خەملێنی نووسینە.

من بۆ خۆم، کە لە شیعری ئێستا وەڕس و بێ ئومێد دەبم، دەگەڕێمەوە لای شیعری کلاسیك و بەوپەڕی چێژەوە دەیانخوێنمەوە، دڵەڕاوکێ و گومانێکی سەیری ژیانیی لە کلاسیکدا پەخش دەبێتەوە. ڕەنگە ئەمەش ئەو خاڵە پێکهێنەرەی بێت لەناو خۆیاندا لە شتێك دەگەڕێن، کە کتێبە ئاسمانییەکانی وەك: (تەورات، ئینجیل، قورئان). لەناو هەر حەفت تەبەقەی ئاسمان ڕشتوویانە. مەیل و خوودانە ژیان جوانی و خەسڵەتی داهێنانە ، بەڵام دۆزینەوەی ئاسوودەیی لەمرۆدا، کە خاکەڕایی و سادەیی نەماوە جۆرێك



گاڵتەجاڕییە. مرۆڤ بە دوای چیدا وێڵە، ئەو هۆ و هۆکارانە دەبنە شکست و کەوتن و نیمچە لەناوچوون.

بۆچی دەدوێین، کێ دەماندوێنێت، بۆچی دەژین، کێ دەمانژیێنێت، بۆچی دەکوژرێین، کێ دەمانکوژێت. ئەدی کێ دەستی بەسەر ئەو هەموو شتانە داگرتووە و دەستکاری ژیان و چارەنووسمان دەکات. بێ ئەوەی بزانین بۆ دەستکاری ژیان و چارەنووسمان دەکرێت. پێ بە پێ لەسەرەخۆ دەمانکوژن تا هەست بەمردن لەناو ژیاندا بکەین. ژیان پێوەندییەکی ناڕوون و تووڕەی لەگەڵ مەرگدا هەیە، دواجار مەرگ بێ ناسنامە دەمێنێتەوە، یان ژیان، یان بە ئامادەبوونی توند و تیژی مەرگ چێژ لە ژیان وەرنەگرین و مەرگ وەك چاودێرێك بەسەر سەرمانەوەیە و بەسادەیی دۆخەکەمان بۆ پێناسە ناکرێت و بەدەست مانەوەی ئەم دۆخە دەناڵێنین و شێوازی چۆنێتی هەڵسوکەوتکردنمان لەگەڵ دۆخەکەدا پێ بەرجەستە ناکرێت. دەقی (پەڵکەزێڕینەش نامۆ دەبێ - گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە ٥٧ی ساڵی ١٩٨٠ ل:٤١ تا ٤٢)دا خەسڵەتێکی زۆر لەبار پێش چاو دەخات بەوەی پاڵەوانەکانی، یان گێڕەرەوەی هەموو شتزان بەیەك ئاستی زمانی قسە ناکەن. هەر پاڵەوانێك، یان گێڕەرەوەی هەموو شتزان کەسایەتی خۆی بۆ دەستنیشان کردووە، کە هونەری حیکایی لە ئەزموونی ئەم شاعیرە خەسڵەتی دیارن و بنیادەکەشیان تێکەڵ بەیەکتری دەبن. لەناو هەموو وێنەکاندا ئەم واقیعە جیاوازە کاریگەری خۆی بڵاودەکاتەوە و مرۆڤەکانیش ڕوانین و لێ وردبوونەوەی جۆر جیاوازی خۆیان بەرجەستە دەکەن و هەوڵدراوە خودی کورد و مێژوو و کولتوور و کەلەپوور وەك باس و بنەڕەت وەربگرێت.

هەموو شتێك لە ئەدەبدا واقیع بەشێكی دەخەملێنێت. زەین، خەون، خەیاڵ،... تاد، پێوەندییەكی ناوەكییان بەواقیعەوە هەیە و لەناو واقیعەوە هەڵدەسوورێن و ڕوودەدەن و دەبن بەتانوپۆی ئەدەب. بەهۆی ئەو چوونە ناویەكەی واقیع، زەین، خەون، خەیاڵ،... تاد. ناتوانین تێگەیشتنێكی بێ بەرزی و نزمی و دروستمان لەبارەی ئەدەبەوە هەبێت. پێویستیش ناكات هەمانبێت، چونكە بەخودی ئەدەبی بێگەرد ڕازین و تێگەیشتنێكی تەواو سروشتییە.

نووسین لای ئەم فرە بەهرەیە تەنیا یارییەك نییە بۆ چوونە ناو سەرسامی، بگرە لە قووڵاییەكاندا مەشخەڵێك بەرز دەكاتەوە بۆ ئەوەی ئەفسوونی نوێی خودی كورد و مێژوو و كەلتوور و كەلەپوور بدۆزێتەوە. لە سەرەتای ئەزموونی تا كۆتایی تەمەنی كورتی تایبەتمەندییەك گەواهی ئەوەی بۆ دەدات لە كەس نەچووە و پارێزگاریشی لەو لە كەس نەچوونە و تایبەتمەندییەی كردووە، ئەگەری مردنیش لە ئەدەبیاتی ئەم شاعیرەدا ئامادەیی زۆری هەیە و پاساویش بۆ مەرگ دەهێنێتەوە. لێكدانەوەی سەرنجڕاكێشیشی بۆ دەكات.

بەهۆی بەكارهێنانی ئامرازی پڕ ترپە و ئاواز خوێنەر بە دەربڕینەكانی دووچاری سەرسامی و بە دواداچوون دەبن. لەناو واقیعدا هەوڵ دەدات واقیعێكی نیمچە جیاواز بخوڵقێنێت و خوێنەر هەست بە چوارچێوەیەكی جیاوازی واقیع دەكات، كە ڕوخساری بۆ چەندان شێوە دەگۆڕێت. دەقی ڕەواش ئازادانە وەك نوێنەری ڕاستەقینە لەناو چوارچێوەی واقیعی جیاوازدا دەسوورێتەوە.



لەدوا وێنەدا ناتوانین ئەم شاعیرە لە فۆرمێكی دیاریكراودا دابنێین و پێناسەی هێڵە تایبەتییەكانی بكەین، چونكە هەڵگری زیاتر لە ڕوخسارێكە و هەموویشیان شیاوی پێناسەكردنی سەربەخۆ و تایبەتن: شیعر، چیرۆك، ڕۆمان، شانۆنامە ، ڕەخنە و لێكۆڵینەوە، وەرگێڕان، زمانزانی،... تاد. بەڵام لە هەموو بار و بوارەكاندا كۆششی بۆ ئەوە بووە دووبارە جیهان لە بارێكی تەندروستدا ڕێك بخاتەوە و دووچاری سەرسامی و بەدواداچوونی ئەوەمان بكات. بۆچی دەدوێین، كێ دەماندوێنێت، بۆچی دەژین، كێ دەمانژیێنێت، بۆچی دەكوژرێین، كێ دەمانكوژێت. شەهیدكرا، بەڵام ژیان و پەیامی لە ڕێگای نووسینەوە گرینگی پێدرا و وەك ناوەند مایەوە. نووسینی بێگەرد، كە ئاوڕدانەوەیە لە خۆت. ڕۆحی ئەزەلی و ژیانی ئەزەلی مرۆڤی بەهرەمەند.

شوباتی ٢٠٠٩هەولێر

# قەڵەمکێشی سەلاح محەمەد بە وشە

ڕۆشنبیری بێگەرد هەمیشە بە دیدێکی گونجاو و کراوەوە ڕەخنەگری دەسەڵات بووە و بە بەرپرسیاریەتییەوە بەرەورووی وەستاوەتەوە. بۆ دژایەتیکردن و بەلاڕێدابردن نا، بگرە بۆ هەستکردنی زیاتری بە بەرپرسیاریەتی و ویستویەتی دەسەڵات بباتەوە سەر ڕێگایەك، کە ڕێگای زۆرینەیە و هەقیقەت و دادپەروەری و ئێستێتیکای نەتەوە لە باری ڕۆشنبیرییەوەی تێدا پێدەگات و دەخەملێت. سیما و خەسڵەتی داهێنەرانە وێنا دەکەن. ڕاستییەکی بەڵگەدارە دەستەی ملکەچیش زۆرن لە زۆر لایەنەوە ڕۆڵیان هەبووە لە بەهێزکردنی دەسەڵات و بەرەو دیکتاتۆریەت بردنی. سیما و خەسڵەتی داهێنەرانە وێنا ناکەن.

پێویستە بەچاوی گومانەوە سەیری ئەو ڕۆشنبیرانە بکەین، کە بەرپرسیار نین لە ئاکاری ڕۆشنبیریی خۆیان و دۆخگۆڕینی وڵات، بگرە لە ڕیزی دەسەڵاتی ستەمکار وەستاون و لەناو لەپی ستەمدا هێڵەکانی بینینی خۆیان دەناسن. ئەو هێلانە هێز و سۆمای چاویان تا سنووری کوێربوون دەبەن. پێوەندی نێوان ڕۆشنبیری بێگەرد و دەسەڵاتی دیکتاتۆر بە هیچ شێوەیەك هاوڕێ و تەبا نەبوونە. شیعری بێگەرد کردار و بەرەنجامی دوورکەوتنەوەیە لە دەسەڵاتی دیکتاتۆر و یەکەمین جووڵە و بزاوتی ڕۆشنبیری بێگەرد و بۆ چوونە ناو دۆخی



(هەقیقەت) و (دادپەروەری) و (ئێستێتیکا). ئەم هەقیقەت و دادپەروەری و ئێستێتیکایەی پێوەری ئەدەبی بێگەردن. بەوپەڕی بێ گومانییەوە شاعیر بوویەکی ئەفسانەیی نێوان زەوی و ئاسمان نییە. بوونێکی ناو سروشت و کۆمەڵگەیە. شیعریش هێزە شاراوە و چالاکییەکی لە خواست بەدەر نییە، بگرە بەشێك لە بەهرە و سروشی خوداوەند و هێزی شاراوە یارمەتی دەدات بۆ گفتوگۆیەکی کرۆك و ناوکی و چالاکییەکی خواستی، کە تاڵە دەزووی بابەت لە واقیع و زەین و خەون و خەیاڵ وەربگرێت و لە چوارچێوەی تێبینی و سەرنجدان دایبڕێژێتەوە، پاشان بە پالاوگەی لێ وردبوونەوەدا تێیدەپەڕێنێ و پێشکێشی دەکات، کە شەقڵێکە لە ڕواڵەتی هەستی مرۆڤ.

واقیع تەنیا ئەو شتە نییە، کە بە چاو دەبیندرێت، هەناوی پڕ مەترسی، یان ژینگە و دەوروبەرێکی پارێزراوە. بیناسە ئەوجا لەبارەیەوە بنووسە. بێ شەرمانە لەسەر سەکۆی مەوەستە و خۆت مەخەرە داوی ستایشییەوە، چونکە پاش بەسەرچوونی ماوەیەك، جا ماوەیەکی کورت، یان درێژ پەشیمان دەبیتەوە و تووشی نائاسوودەیی ویژدان دەبیت و لەناوەوەترا دەتلێیتەوە.

بەپیتترین کاتی شاعیر ئەو کاتەیە، کە دەچێتە ناو گەشتی زەینی و بڕوای سەد لە سەدی بە هەقیقەتی واقیع نامێنێت. واتە: واقیع وەك هەبوونی خۆی وەرناگرێت، ناچار تامەزرۆ دەبێ و ڕیشاڵی هەقیقەتێکی دیکە بدۆزێتەوە و بەهێمنی و کارامەیی هەوڵی بنیادنانی بدات، کە هەقیقەتی واقیع لە ڕێگای زەین و خەون و خەیاڵ دێتە ناو هەقیقەتی نووسین، ئەم هەقیقەتە هەقیقەتی

تەواو و بێ فرت و فێڵی بەهرە و سروش و شیعر و شاعیرە. لەسەر بنەمای ڕێکخستن و دەستپێکردندا چەمکی چاوەڕوانی هەڵدەوەشێنێتەوە.

شاعیری ساویلکە و پاشخاپەڕۆك دەیەوێت خوێنەر یەکڕاست بگەیەنێتە مانا و هەقیقەتی ناوەڕۆك، بێ ئەوەی بە بۆشایی و هێمای سپێتی کاغەز و شێوازی سرکەری تێبپەڕێنێت. لەسەر بنەمای چەمکی چاوەڕوانی و گۆڕینەوەی دەربڕین دایڕێژێتەوە و لە هێڵی چاوەڕوانی بیهێڵێتەوە و خاڵی لێوردبوونەوەی پێشان بدات. پاشان بە ئەدەبیبوونی مانا و شێوازی تێبگەیێنێت و بە مانا و شێوازی بە ئەدەبیبوونیشی بگەیێنێت.

ژیانی (سەلاح محەمەد) بەبێ شیعر نووسین شیعرە. گەلێك گرینگی داوە بە مانەوەی پاکیی خۆی، چونکە پاکی دەبێتە دۆزەرەوەی واقیعی نووسین. ئەو زمانە بێ زەرەر و زیانەی لەسەر ئاستی کەسایەتی پێی دەدوا، لە نووسینیش بەکاری دەهێنا. ژیان بەبێ پاکی ناتەواوە. ساڵی ١٩٥٤ لە سلێمانی لە دایك بووە، تەمەنی بە شۆر و شەوقی تێدا بەسەر برد و خۆشی ویست. جۆرێك مامەڵەی گیانیی لەگەڵ باڵندەکانی ناوشار و دەوروبەری شاریش کردووە و بە هۆگر و برادەری گیانی خۆی زانیون. تا لە ٢٦\٤\٢٠٠٩ تێیدا کۆچی بۆ دوامالی کرد. دەقی(ماڵەکەم-گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە ٧٨ی ١٩٨٩، ل:٤٧)دا ترپە و ئاوازی ناوەوە بریتییە لە لێ وردبوونەوە لە وێنە هەستییەکان و بەخشینی ئاست و ئاراستەیەکی گیانی بە وەرگر.

شیعرەکانی ئەم شاعیرە نە لە زمان، نە لە شێواز، نە لە ناوەڕۆك شتێکی نوێیەخشیان نەخستووەتەوە، بگرە ئەوەی جێگای سەرنج و تێبینییە ئەوەیە هەستەکانی بە ڕاستگۆیی و بەبێ فرت و فێڵ بەکار هێناوە و لە ترپە و



ئاوازدا جیاوازییەکی هەستی خستووەتەوە. ژیان کۆمەڵێك هۆ و هۆکاری بەرهەم هێناوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەرگ، ئەم هۆ و هۆکارانەش هێزی داهێنانی نووسەریان زیادکردووە، هەروەها ڕووبەری خەیاڵیشیان بەرەو فراوانی بردووە و دووری و ئاسۆیەکیان بۆ کردووەتەوە، کە هاوکارە بۆ دەستنیشانکردنی بنەمای بیرکردنەوە و ئاراستەی نووسین. هێزی هەستەکان یارمەتی دەدات دووبارە جووڵە شاراوە و وێناکان بەرهەم بهێنێتەوە و بە ئاسانی جیهانبینییەکان بدۆزێتەوە. ئەگەرچی مەرگ دیاردەیەکە خۆی بەسەر بەشێکی زۆری ژیانمان زاڵ کردووە.

لە هەیکەلی تەواوی شیعرێکیدا هەست دەکەیت وێنەی ئاسایی و مۆرکی باوت پێشکێش دەکات و دووچاری سەرسوڕمان و ڕاچەنینی هەستەکانت نابیت، بەڵام لە پڕدا وەرچەرخانێك ڕوودەدات و هێزی بەهرە دووچاری سەرسوڕمان و ڕاچەنینی هەستەکانت دەکاتەوە و گەلێك جوان دادەڕژێت و پڕە لە هەڵچوونی گەرم، دیمەن و وێنەی دەگمەن بەرانبەر مەرگ دەبەخشێت. دەڵێی شیعر بە ڕێگا و هێزێکی ڕووناك دەزانێت بۆ ڕۆیشتن بەلای مەرگ و پاشان بە هێزێکی درەوشاوەی ناوەوە وەستان لەتەنیشت ئاشقانی ژیان.

هەستەکان، کە بنەمای سەرەکی ئەزموونی ئەم شاعیرە پێکدەهێنن. وەك یەکەمین و دوایەمین پێکهاتەی شیعری لێکدانەوەی بۆ دەکرێت، پێوەندی هەستەکان لە خاڵ و ڕەوتی گفتوگۆی کرۆك و ناوکی و چالاکی خواستی بە یەك دەگەن و هاودەقی هێزیان لەنێوان ڕوودەدات و یەکتری دەناسن. هیچ هەستێك بە تەنیا بەشداری لە پێکهێنانی شیعری ئەم شاعیرەی نەکردووە، بگرە ئەگەر بەگشتیش نەبن بە زۆرینە بەشدار دەبن لە پێکهێنانی دەق، بەڵام

یەك هەست قسەی یەكەم دەكات و ئەوانی دیكە دەبن بە بەردەنگ. ژیان هێزی نووسین دەجوولێنێ و بۆ خۆی دەق بەرهەم دەهێنێت، دەقیش دەرهاوێشتەی خودی ژیانە. زۆرینەی هەستەكان لە دەقێكدا ئامادە دەبن و بەشداری دەكەن و ڕەنگ دەڕێژن. تانوپۆی لە كۆی شێوە دەربڕینەكان دەچنێت. چنینەكەش لە خوێندنەوەی سەرچاوەی واقیع و زەین و خەون و خەیاڵ دەكەوێتەوە. كەسیش ناتوانێت خۆی بە خاوەنی سەرچاوە گشتییەكان بزانێت، چونكە گشت لە چەند بەشێك پێكهاتووە، هەر بەشێكی لای كەسێك دەست دەكەوێت و دواتر لەسەر ئاستی پێكهاتە و لێكدانەوەدا لێك دەدرێت .

گەرمبوون و وورووژانی هەستەكان دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندی نێوان نووسەر و كۆمەڵگە و واقیع. مرۆڤ هەست بە پێویستی نزیكبوونەوەی لە واقیع دەكات بۆ ئەوەی كرۆك و ناوكی ژیان باش بناسێت و بچێتە دۆخی گۆڕینەوەی دەربڕین و ناسینی بۆچوونی ئەوانی تر. ئەوەی چ پێودانگێك پێویستە بۆ ناسینی هەستەكان لە ناودەقی ئەدەبیدا، ئایە هەستەكان درێژكراوە و هەڵقوڵاوی بنەمای واقیعن، یان درێژكردنەوە و هەڵقوڵاوی چەمك و ڕوانینی نهێنی و هۆ و هۆكارە سەرسوڕهێنەكانی مرۆڤن و زۆر جیاوازن لەگەڵ چەمك و ڕوانینی واقیع. هەستەكان لای ئەم شاعیرە خاوەنی گرینگییەكی بەتین و تایبەتن. لە سێ لاوە تێكەڵی چییەتی دەبن و پەرە بە ئەزموونی دەدەن. لایەنی یەكەم مردن، لایەنی دووەم ژیانەوە. لایەنی سێیەمیش ناوەندە. ناوەندیش ئەو خوداوەند و فریشتانەن، كە كرۆك و ناوكی چییەتیمان پێ ڕادەگەیەنن و دەمانجوولێنن بۆ نووسین و مانەوە لە دۆخی بیركردنەوەدا. نهێنییەكانی هەقیقەت و دادپەروەری و ئێستێتیكامان پێ ڕادەگەیەنن.



هەستەكان بەگوڕ دێن هێڵەكانی بیركردنەوەی شیعر پێك دەگەیەنن، سەرچاوەی هەستەكانیش لە پێكگەیاندندا دابەش دەبن و فۆرم وەردەگرن و بزاوت و جووڵەی ویستی خۆیان بەسەر پێكهاتەی دەق دەسەپێنن. كەواتە هەستەكان لە شیعردا خاوەن پێكهاتەیەكی (ناوەند)ن و لەسەر ئاستی بنەما جیاوازەكان و بەپلەی جیا جیا لە یەكترناسین و بە هێزبوونی پێوەندییان لەسەر هەردوو ئاستی پێكهاتە و لێكدانەوەدا بوونی بنەڕەتییان هەیە و لە گۆڕانكارییەكی بەردەوامدانەو ڕامانی سەرەكییان بە هەموو لاوە قووڵ دەبێتەوە.

ئایاری ٢٠٠٩ هەولێر

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی (٢٠١٣)ی
## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئاینی کۆن و کۆچکردن لەکوردستاندا | عەبدوڵڵا قەرەداغی (مەلا عەلی) | مێژووی | ٩٤٣ |
| ٢ | بیرکردنەوە | عەزیز جەلال عەزیز | زانستی | ٩٤٤ |
| ٣ | سۆشیال دیموکرات و دەوڵەت | دڵشاد تاڵەبانی | لێکۆڵینەوە | ٩٤٥ |
| ٤ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨٤ |
| ٥ | دیوانی ع.ح.ب | محەمەد حسین بەرزنجی | شیعر | ٩٤٦ |
| ٦ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨٥ |
| ٧ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٨٦ |
| ٨ | تەکنیکی فرەدەنگی لە رۆمانی کوردیدا | حەمە مەنتك | لێکۆڵینەوە | ٩٤٧ |
| ٩ | سەبارەت بە تەلەفزیۆن و دەسەڵاتی ژورنالیزم | و. مەنسوور تەیفوری | رۆژنامەوانی | ٩٤٨ |
| ١٠ | شۆرشی تەکنۆلۆژیا | محەمەد دوکانی | زانستی | ٩٤٩ |
| ١١ | بەرکوتێکی ژیانم | و. عەزیز گەردی | ژیننامەو شیعر | ٩٥٠ |
| ١٢ | فەلسەفەی مێژوو لای ئیبن خەلدون | نەبەز عەبدولڕەحمان | لێکۆڵینەوە | ٩٥١ |
| ١٣ | ئابووری نێودەوڵەتی لە دەرئەنجامی قەیرانەکانیدا | فەیسەڵ عەلی محەمەد | ئابووری | ٩٥٢ |
| ١٤ | لە چاوەڕوانی جەرەجوڵڵای قەهاردا | ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل | رۆمان | ٩٥٣ |
| ١٥ | تۆم خۆشدەوێت | کنێر عەبدوڵڵا عارف | گووتار | ٩٥٤ |
| ١٦ | تۆمارەکانی مێژوو | عومەر ئیسماعیل مارف | مێژووی | ٩٥٥ |
| ١٧ | لادان لە شیعری لەتیف هەڵمەت دا | ناز ئەحمەد سەعید | لێکۆڵینەوە | ٩٥٦ |
| ١٨ | زمان و فیکر لە نێوان تیۆری و پراکتیکدا | نەجات حەمید ئەحمەد | لێکۆڵینەوە | ٩٥٧ |
| ١٩ | گەشتێك بەناو کلتوری ژاپۆندا | ئەردەڵان عەبدوڵڵا ئەحمەد | کلتوری | ٩٥٨ |
| ٢٠ | تابۆ وەك نموونەیەکی پەیوەندی نێوان زمان و کلتور | د. شاخەوان جەلال فەرەج | لێکۆڵینەوە | ٩٥٩ |
| ٢١ | سێ کتێب لەبارەی شیعرەوە | سەباح رەنجدەر | بیروڕا | ٩٦٠ |